دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● کەشکۆڵێک لە گەنجینەی ژیانی کوردەواری

● ئامادەکردنی: مەلا مەحموود کزەڵ

● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن

● بەرگ: وریا بوداغی

● ژمارەی سپاردن: (٧٤)

● نرخ: [illegible]

● چاپی یەکەم : ٢٠١٠

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٥٠٠)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# کەشکۆڵێك لە گەنجینەی ژیانی کوردەواری

**بە هەر دوولا دایکی میوانەکە ئەگێن**

جارێکیان پیاوێکی هۆشیار و زەکی رێگای ئەکەوێتە دێیەك ئەڕواتە ماڵێك شەو لەوێ بکاتەوە بەیانی رێگای خۆی بکات لە مەغریب بە دواوە هاوسێ ماڵەکە دێتە سەربان بە جنێو و قیژە قیژ کە گوایە بەسەر ماڵی ئەماندا تێپەڕیوە و ئەمیان بە پیاو نەزانیوە خانە خوێ دێتە وەڵام و چاکتر جنێوی پێ ئەدات و بۆی دا ئەرسکێ پەلاماری بدات.

کابرای میوان کە گوێ ئەگرێت هەردووکیان هەر جنێو بە میوان ئەدەن:

یەکەم ئەڵێت دایکی میوانەکەت بگێم، عرض و ناموسی بە دەعباکەم دووەم هەر وا دەڵێت دایکی میوانی خۆت بگێم، لە شەرەفی میوانی خۆت بەم. هەردوولا مەبەستیان ئەوەیە میوانەکە لانەواز بکەن و بەو شەوە دەرپەڕێت و ئەمان لە رێگا رووتی بکەنەوە.

کابرای میوان روو ئەکاتە هەردووکیان دایکی هەردووکتان بە کێرم بە خوا تا رۆژ ئەبێتەوە لێرە رانەبوێرم.

* * *

ژنێك لە تەمەنێکی کامڵدا رێگای ئەکەوێتە شارێك دەستی ناگات بە خانەخوێ و ناسیاودا. شەو درەنگ ئەبێت بە قۆناغدا ناگات ئەچێت بۆ ئوتێل — میوانخانە — روو ئەکاتە هەر ئوتێلێك جێگای خاڵی و گونجاوی دەست ناکەوێت.

کابرای خاوەن ئوتێل ئەڵێت دوو جێگای خاڵی جیاوازمان هەیە ئەگەر پێی رازی و قایل ئەبیت؟ یەکێکیان سەرخۆشێکی بێ فەری تێدایە، ئەوی تریان شێتێکی تێدایە. ئیتر کەیفی خۆتە، ئەویش ئەڵێت چی بکەم؟؟ سەرخۆشەکە لەوانەیە پەلامارم بدات، هەروا شێتەکەش، دەستم لێ بوەشێنێت. ناچار ئەڵێت ئەچمە لای شێتەکە، کە ئەرواتە سەر قەرەوێڵەکە، شێتەکە سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێت لێت دەربێنم؟! هەر ساتە نا ساتێك وا ئەڵێت، ئەویش لە ترسا خەو ناچێتە چاوی تا رۆژ ئەبێتەوە، بەیانی کە رۆژ ئەبێتەوە

ناترسێت کە وای پێ ئەڵێت وەڵامی ئەداتەوە دەی چش دەری بێنە، خۆ من ئەم شەو رۆحم چوو کە بۆی دەردێنێ چی بێ باشە؟!
زووبانی لێ دەردێنێ و بۆی ئەمیشێنێ و چاوی زەق ئەکاتەوە، بترسێنم؟! ژنەش ئەڵێ خوایە چۆن بۆ خۆم نەسرەوتم!.

* * *

جارێکیان ژنێکی بێ ئابرووی سۆزانی بەلای رەز و باخێکەوە ئەبێت کابرایەکی گەنجی شۆخ رێگای ئەکەوێتە لای باخەکەوە ژنەکە دەست ئەکات بە قیژە قیژ و جنێو دان هەر کەسێك بچێتە باخی ئەوەوە واو وایە...
کابراش رووی تێ ئەکات ئەڵێ هەرا هەرا مەکە ئەگینا بێم دەتگێم و ئەرواتە ناو باخەکەو دەس بە هەنجیر خواردن ئەکات ژنەکەش ئەڵێت هەنجیرانیش دەخواو درۆیانیش دەکات. سەیری چەند زەبەلاحە، خۆ گوتت بێم وا دەکەم.

* * *

**ماشا الله ئەم جۆرە کەسانە زیرەکن!!**

کۆمەڵێك مەلا دانیشتبوون باسی خواردن و سەوزەیان ئەکرد فەقێیەك هاتە ژوورەوە پرسیاریان لێکرد: لە گژ و گیای بەهار و سەوزە تۆ حەز لە چی ئەکەیت؟ وتی من حەز لە هێلکە و رۆن ئەکەم مەلایەك بۆی چوار پینە کرد: مەبەستی وایە بە إعتباری ماکان... تاد.
وتی بەڵێ قوربان منیش هەر مەبەستم مانگایە...!
پیاوێکی حاکمی وەخت و دەسدار رۆژێك دڵی تەنگ ئەبێت بانگی پیاوەکانی ئەکات کە لەگەڵیا هاورێی بکەن و بچن سەر لە شێتخانە بدەن، ئەچن پیا ئەسورێنەوە هەمە جۆر شت و سەیر ئەبینێ تەماشا ئەکەن کابرایەکی پاك و خاوێن و بە ویقار لەلایەك دانیشتووە لێی ئەپرسن کابرا تۆ شێتی؟؟ وتی وایان داناوم وتیان بۆچی کردتیان بە شێت؟ وتی من لە ناو قەومەکەی خۆمدا داوای پێغەمبەرایەتیم ئەکرد ئەوانیش داوای موعجیزەیان لێکردم زۆر گران بوو بۆم جێبەجێ نەکرا منیان دا بە دادگاو بڕیاری شێتیان بەسەردام و ناردمیانە ئێرە یەکێك لە پشتەوە وتی بخۆ ئەوە دەردت بێت کەی من تۆم بە پێغەمبەری رەوانەکردووە تا

کاری موعجیزەت بۆ ئەنجام بدەم برۆ هەر شێت بە تومەز ئەم داوای خوایەتی کردووە بۆیە ڕەوانەی شێتخانە کراوە.

* * *

### بەسێ و حەمەد ژن و مێرد و دڵدار و عاشق

بەسێ تازە پێ ئەگەیشت لە هەرەت و تۆفی بەهاری ژین و گوڵدا بوو. تازە مەمکی خڕ دابوو روخسارێکی وەکو ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە زۆنگە شەودا هێڵە ساوی دابوو ئەیجریوان بە لەنجەو لار، دڵنەواز، پەری روخسار (مەلائیك رەفتار) گەپی بە گشت جەوانانی هاوتەمەن و کیژانی دی ئەکرد. سەرنجی هەرزەکارانی کێش، جەرگی زۆری قیمە کێش کردبوو، لە سبحی ئەوینی دابوو، پێی نازی شەوانی مانگە شەوی بە روویدا ئەنا زەوی منەتباری ناز و نەوازشی ئەو بوو چاوەڕوانی فەڕ و پیرۆزی لێ ئەکرد. لە گشت لاوە هەر سەدای ماشائەڵلاو الله و ئەکبەر بوو، واتە پێنووسی دەستەلاتی بێ پایانی یەزدان چۆن نیگار و دیمەنی ئەم فریشتەیەی کێشاوە وا رێك و جوان سەد ناوی خوا لە دوو بستانی ئەناری، وا شلك و ناسك و پڕ چەنگ و بیر تەزینە؟!

"حەمەد" لاوێکی رێك و پێك بوو، چوست و چالاك و میهرەبان دڵنواز و لەسەرخۆ، گورج و گۆڵ، کارکەر، بێ خەوش و دەروون خاوێن لەگەردوو تۆزێ خیانەت و ناپاکی و دڵپیسی، لە چنکۆکی لە خەوش بەدکاری دوور بوو، بگرە هێشتا شەیتان بە مێژووی ژیانیدا دەرفەتی لەکەدار کردنی نەبوو، هەر تەنها خاڵێك مۆری نەنابوو بە سروشتیا، بە تەنها هەڵەیەك نەرووشابوو، گشت خاوەن کچێك ئاواتە خواز بوون بیکەن بە زاوای خۆیان بە هەر نرخێك بێ ببن بە خەسوو بە خەزووری.

رۆژێك لەسەر کانیاوی بەری دێدا تووشی بەسێ ئەبێ چاك و چۆنی لەگەڵدا ئەکات لەگەڵیا ئەدوێ و کەشی ساف و بێگەرد ئەبێت، ناحەز و گورنەتەڵە چاودێی ناکەن، وەبەر گازی پەلپ و بیانوو، تۆمەت و بوختانی نادەن.

ئا بەم جۆرە لەگەڵیا ئەدوێت و ئەڵێت ناکاتە خۆشەویستە دڵدارەکەم؟: ئایا تا ئێستا کەس گوڵی دڵی رفاندویت میوەی ئەوینیی چێژو تام کردووی؟ پەڕی دڵی ژاکاندووی ئەو دڵەی کە گوڵە بێ من بۆنی کەسی کردووە خوانەخواستە؟ ئایا کەس شۆڕشی دڵداری و خۆشەویستی لە ناخدا خرۆشاندووە وگەرداو تۆفان و زریانی لە قەبارەی سۆز و ئەوینت هی کەس هەڵی کردووە؟ توخوا ئەگەر بە راستی پێم نەڵێیت شۆخە نازەنینەکەم؟! ئەوانەی تۆ ئەیڵێیت ئێستا و هێشتا

له شێوەیەکی سادە و راستی بە خەیاڵ و مێشکمدا گوزەری نەکردووە و هەستم بە هیچ نەکردووە و ئەم دڵەم تا ئێستا بۆ کەس نەیکروکاندووە. بەگەرمی و بە کوڵ بۆ کەس لێی نەداوە، کڵپە و چرکەی لێ هەڵنەستاوە، زۆر بە ئارام و بێ دوو دڵیی دێم و دەڕۆم و سەر ئەنێمە سەر سەرین بیر لەمانە لە هیچ ناکەمەوە بۆچی ئەم دەرزییەت ئاخنییە مێشکمەوە بەم وشە بەسۆز و ناسکانە خولیایەکت لە ناخمدا رواند بناغەی گەرداوێکت دانا نازانم چیت پێ بڵێم، چۆنت وەلام بدەمەوە؟! ئەی جوانی هەرزەکاری ناو کورگەلی دێ مۆمی هیوات داگیرسان و کڵپەی گرت لە هەناوم بەردا لێم گەرێ "حەمەد" بە کاری خۆمەوە با بڕۆم، تا کەس پێی نەزانیوین. بەستێ لەبەر خۆیەوە ئەدوا ئەوە چی بوو گوێم بە چی ئەزرینگێتەوە دڵم ترپەی لێوە دێت و پتر ئەگەڕێت ئەم گشت وشانە بوونە ئاگر و بەربوونە هەناوم ئەژنۆم بێ باك دەلەرزێت، لە رێگەی سەرسم دەدەم راست دەبمەوە هیچ بە خۆم نازانم لە بەدەنیشم خۆشە ئەبێ باب و دایکشم ئەمەیان بەسەر هاتبێ، وایان کردبێ؟ ئەگەر پێم بزانن چ هەڵوێستێکی رەچاو دەکەن؟ و چیم پێ دەڵێن و وە چیم لێ دەکەن مەگەر هەر خودا بە خۆی بزانێ!!

دوای چەند رۆژێکی تر، دووبارە چاوی بە بەسێ کەوتەوە. هەر هەمان وتووێژ بوونەوە بە دەرزی لە مێشکی بەسێ درایەوە، وا سڕبووبوو دەرزیاژن بکرایە هەستی پێ نەدەکرد باسی ئەوین و دڵداری خۆی خستەوە گۆڕەپانی ئاخاوتن هەردووکیانی مەست کرد زۆر بە خەستی و چڕی سەرنجی هەردووکیانی لەیەك چەسپ کرد جەمسەرەکانی پێکەوە ئەبەست بە توندی و بە گرت، کوێرە پێکەوەی شەتەك ئەدان جا زۆر جار بەم جۆرە یەکتریان بەسەر ئەکردەوە لە ناوەخت و لە وەختا لە شەودا شکانا لە بەرەبەیانی مەڕ شەواژۆ کردنا، لە چێشتەنگاوی ناو هێنان و گەلە بە رێکردندا تاسەی دووری و بێ ئارامیان بەیەکتر ئەشکان. بینینی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە رێوە و بەسەر پێ بەسرنجی گەرم و تیژ قەپ و گازیان لە روومەت و لێوی یەکتر ئەگرد یان بە خەیاڵ نوقرچ و دەست بازی بەیەك گەیاندن بوو، کە بەیەك ئەگەیشتن ئەندامەکانیان تێکرا ئەکەوتە پێکەنین و گەشە و شنە کردن، بزە و پێکەنین سەر لێوی هەردووکیانی بە جێ نەئەهێشت.

ئاخر جار حەمەد پێی وت بەسێ ئەڵێیت چی هاوجوت بین، بە حەلاڵی، لە سەر رێرەوی شرع شەرعی شەریف و ئەمری خوداو پێغەمبەر؟! وەکو ژن و مێرد؟!

بەسێ وتی: ئەگەر خوا ئەوەی بکات هەتاوەکو دەمرم دوای خوا وەکو بت دەتپەرستم بە لێو عارەقی هیلاکی و ماندوویت ئەسڕم لە سینگ و بەرۆکی خۆمدا گەرمت دەکەمەوە

دەتحەسێنمەوە ئەگەر گەرمات بێت بە لچکی دەسماڵ و زولفی خاوی خۆم باوەشێنت لێ دەکەم و فێنکت دەکەمەوە و خودا یار بێت هەر دڵ نـەوازت دەبم پەروانـەی مـۆمی گـەدازت دەبم ئەگەر باوکی منالانم بیت گەوهەری تاجی سەری هەموومان دەبیت هەتاکو دەمـرم هـەموو کفایم بە تۆ دێت بێ تۆ ژیـنم تاڵـە، مـردنم حەلاڵـە، لەگـەڵ تـۆدا بم دۆزەخ لام بەهەشـتە هەرچیشم هەیە هەر بە قوربانی تۆی دەکەم، ئەوی بە من بکرێت و هی من بێت بە هی تۆی دەزانم هەر بە حەلاڵی بێت.

درێژەی پێ نەدەین پەیمانی هاوسەری و خێزانی و ژن و مێردیان بەیەکتردا بۆ هەتا هەتا.

"حەمەد" چەند پیاوێکی دەم راستی ئاوایی نـاردە خـوازبێنی بەسـێ بەمـەرجێ هـەموو بیانووەکانی باوکی بەسێ ببڕن و هەرچی پێویست بکات بۆ شاژنی ناوداری ئـەو ناوچـەیە بـۆی خەرج بکرێت و بۆی بکرێت.

بەڵێ ئەنجام هاتە دی رۆژی گواستنەوە زەماوەنـد کـراو گواسـترایەوە بوونـە ژن و مێـردی یەکتر، بەو پەڕی کامەرانی تا گەیشتنە تەمەنی (٦٣) ساڵ هـەر هەمیـشە عاشـق و دڵـداری یەکتر بوون، بەقەد گەردێك لە یەکەم رۆژی دڵخواز و دڵداری کەمی نەهێنا بەڵك و هەر ئـەوین لە پەرەسەندندا بوو خۆشەویستیان پتەوترو رەکێشەدار تر ئەبوو لە دڵی یەکتردا تواببوونەوە لـە جیهانی یەکتردا بێ یەکتر ئارام و حەسانەوەی کەسیان بەدی نەئەکرا کوڕ و کچیان گەورە بـوون و شوویان کرد و ژنیان هێنا و لە ماڵ دەرچوون هەر هەردووکیان مانەوە و ئەمانە هەر لە تـاف و هەرەتی گەنجی و لاوی و هەرزەکاریدا ئەژیان. سەر لەسەر یـەك سـەرین لـە ژێـر لێفەیەکـدا ئەنووستن گیانێك بوون لە دوو جەستەدا ناو بە ناو ئەبوون بە یەك جەستە ئاسەواری بێزاری لـە یەکتر بەدی نەئەکرا دونیا بە کام و دڵی ئەوان بوو بەهەشتێکی بەرینی ئـەم دوو خۆشەویـستە بوو.

ئێوارەیەك "حەمەد" ئازار و تای لێهات کەنەفت بوو چالاکی و گەشی سست و زەبوون بوو هەناسەی سوار بوو هەر دەیگوت بەسێ خەمی مردنی خۆم نییە خەمی ئەوەی دەخۆم کە لە تۆ جیا دەبمەوە ناتبینمەوە جا من بەبێ تۆ چی بکەم لە گۆڕی تـەنگ و تاریکـدا کـێ دڵنـەوازیم بکات، کێ هاو زارم بێت، نەبوونی تۆ دووجار مردنمە خودایە بەبێ بەسێ نەمکوژی.

بەسێ ئەیگوت و ئەگریا: "حەمەد" من بەبێ تۆ چی بکەم دوونیام لێ تاریکە، چاوەکانم لێڵی بەسەردا دێت ئەتووبی خودا هاوار و گازندەمەکە. بێ زاری دەرمەبڕە مەناڵێنە ئـاخ و ئۆف مەکە وا گیانم دەرچوو خۆی بە دەوریدا دەگێڕا ئەگریاو فرمێسکی دادەڕشـت، گـڕ لـە

دەروونی دەهاتە دەر هەڵ ئەبلۆوقا وەکو مارێك کەوتبێتە سەر ئاگر پشکۆ هەشمەتی لێ بڕابوو، عالەمی هەراسان کردبوو ئەیگوت خودا بمکەی بە قوربانی "حەمەد" مەرگم پێش مەرگی بکەوێ هەرچیم هەیە خێری خودا بێت بیدەم بە هەژار و داماو بەس هەر ئەوەندە بەر ئەو بکەوم، دوای ئەو نەمێنم.

کەچی چێشتەنگاو ناردیان بە دوای مەلادا یاسینی "حمد" بخوێنێ کە لە یاسین بووەوە باری لەشی کەمێك سووك بوو سەری هەڵبڕی و دانیشت کەچی لەولاوە بەسێ کەوتە تالآن و هاوار کەوتە ناو جێگە هاواری دەکرد خودایە مەرگم پێش مەرگی حەمەد بخەی ئەم نەگەیشتە نوێژی مەغریب گیانی بە یەزدان ئەسپارد.

"حمد" دەستی کرد بە گریان و هاوار زاری و ڕۆ ڕۆ لە پاڵەوە چنگی لە زەوی گیر کرد وەکو شێت هۆشی بە خۆی نەما.

خەڵکی کیژ و کوڕی دەوریان لێدا، ئەویش ئۆقرەی لێبڕا هاواری کرد خودایە منیش لەگەڵ وی بێخەی با پێکرا دەرچین لە دونیادا. بەسێیان شۆری و هێشتا جەنازەشیان لە زەوی هەڵ نەگیرابوو "حەمەد"یش گیانی بە خودا سپارد.

ئەم دوو دلّدارە، ئەوین پاك و خاوێنە یەکتریان جێ نەهێشت، پێکەوە دوعایان خواست بۆ عالەمی بالآو جیهانی بەرزەخ و ڕەوانی پیاو چاکانی پیرۆز دەستی یەکتریان گرت بە حیولانێ خودا حافیز، دلّداری عاشیق و خۆشەویستی ئەبێ وا بێ.

# فەرهەنگی زاراوەی سۆفینزم

**پێشەکی**

ماوەیەکی زۆر بوو ئەگەڕام بە دوای زاراوەی ئاخاوتنی کەڵەمێردی سۆفییەکان و سۆفینیزمەکاندا، ئەوانەی جیهانی وێژە و وێژە دۆستی پڕ کردووە بە شیعر و پەخشانی رۆژهەڵات و رۆژئاوای پێ درەخشان بوو، واتە لە جیهانی گوزەریان سەرسام و دەستە وەستان راماون، لە راڤە و شیکردنەوەی ئەو زاراوانە بە گرێ کوێرەیی هەر ماوەتەوە رەنگە هیچیان لێ نەپێکا بێت، هەمیشە ئەو زاراوانە رەنگی داوەتەوە لە و تووێژ و شیعر و هەڵبەستاندا، بۆ نموونە (محی الدین العربی، حەلاج، حافظی شیرازی، سعدی شیرازی، کوردی نەژاد، مەولانای جامی و رۆمی، شمس تەبریزی مامۆستا عبدالقادر گەیلانی، نورالدین البریفکانی.. تاد

بگرە مامۆستای سەر شاری مەیخۆران و مەستی ویستەکان "عمر خیام" وێنەی ئەمانە بە هەزاران.

ئەنجام زۆر جار ئەم بیست لە کۆڕی دانیشتنی مەلا و مامۆستاکانی مزگەوت، ئەیان وت: وێژە و بێژەی ئەم سۆفییە مەزنانەی زاراوەی تایبەتی خۆیان هەیە، پێی ئەدوێن و شیعرو هەڵبەستی پێ ئەهۆننەوە و بەو زاراوە ئاخاوتن ئەکەن و نهێنی و باری سۆفیەتی خۆیانی پێ دەرئەبڕن لە جیهانی قەلەندەری و هۆشیاری و بێ هۆشیدا. "شطحاة الأولیاء" شتێکی بە شۆڕەتە کە خەڵکی سادەی تیا سەرگەردان ئەکەن و، بە گوستاخ و پەرداخی توێکڵی دونیا لە ناخەوە پێ ئەکەنن، و تیتاڵی گاڵتە جاری پێ ئەکەن و یەکێك شارەزای ئەو زاراوانە نەبێ لە شیتاڵ و شیکردنەوەی هەڵبەستەکانیان بە هەڵەدا ئەچێت و مەبەست ناپێکێت، واتە هەر تەم و مژی پێوە ئەمێنێت. جار و بۆیە منیش کەوتمە پەی جۆر و گەڕان و پشکنینی پڕتۆکە کۆنەکان. بەڵکو لەلایەکەوە بەڵگە و نووسراوێکم دەسگیر بێت بەوە چاك بوو رێم کەوتە لای مامۆستای بەڕێزم (سید احمد)ی فەیلەسووف لای ئەم مامۆستا پایە بەرزە نامیلکەیەکم دەستگیر بوو. سەرو بەری نەمابوو، لێی بڕابوو گوم بوو بوو، ناوی نووسەر و خاوەنی نامیلکەکەی نەنووسرابوو کە کێیە و کەی نووسراوە؟!

تەنها ئەوەندە نەبێ بە فارسی و زۆر کۆن بوو، منیش بە چاکم زانی لە فارسییەوە وەریبگێرمە سەر زووبانی کوردی، تاوەکو خوێنەران تێیی بگەن و بلاوبێتەوە، دەست زانایان بکەوێت ئەگەر بەر لە ئێستاش بلاوکرابێتەوە و من پێم نەزانیبێت بە داوای لێبووردنم خۆم ئەپەرێنمەوە لە لۆمە و تانەی رەخنە گرانی بەرێز بە هێزی پێنووس دانەی گەوهەرو موو ئەقلێشن ئەمەیش لەوانەیە خزمەتێك بێت بەگەلە داماوە کلۆل کراوەکەم.

کزەلّ - محمود قادر احمد - ١٠/٥/١٩٨٢

ئەمەیش پوختەی نووسراوەکەیە

نووسەر لە پێشەکی نامیلکە نووسراوەکەیدا دەست پێ ئەکات بەم جۆرە و ئەلێت:

سوپاس و ستایش بۆ ئافەریدەگەری بوونەوەر کە درەخشانی کردووە بە نووری خۆی کە (الله نور السموات والأرض) و عیلمی عەشقی وەکو خۆر داگیرساندووە لە کیشوەری "عاشقی و مەعشوقیدا" کە ئەلێت: "یحبونهم ویحبونه"و کاریگەری یەکتر هیچ جۆر نییە لە مولکی هەستیدا کە "لا إله مع الله " و درورودی بێ کۆتایی لە سەر پیرۆزترین و بالاترین بێت: حەزرەتی پێغەمبەر و لەسەر تەواوترین راسترین رێباز رێبازی "محمد المصطفی" درودی خوای لەسەر بێت هەروا لەسەر دۆست و یارانی ئەو بۆ هەتا هەتایە.

پاشان: ئەمە چەند وشە و زاراوەیەکی دیارییە لە زاراوەکانی نێوان گرۆی سۆفییەکان. خوا پشتیوانیان بێت لە کارەکانیاندا کە بە پەخشان و هۆنینەوە پێی ئەدوێن. رووی داوە. ئەمەیش لەسەر (٣) سێ مەبەست بونیاد نراوە و بناغەی دانراوە.

لە بارەی ئەو وشانەیە کە پتر یان تایبەتن بە خۆشەویستەوە و هەندێکیشیان بە خۆشویستراوەوە "محب محبوب"

١. میل مەیل: بەگەڕانەوە ئەلێن بۆ رەگەز و رەچەلەکی خۆی بێ ئاگاداربوون لەو ئەسلّ و مەبەستە وەکو گەڕانەوەی سروشتی وێنەی گەڕانەوەی رقی و توندی و رچان و مەیین بۆ هەر چوار سروشتەکە کە بێ ویست و دەسەلات لایەنی ئەسلەکە ئەگرن، واتە وەکو گەڕانەوەی شتە سروشتییەکان بۆ رەگەزی خۆیان بێ هیچ دەسەلاتێکی خۆیان.

٢. آرزو: ئارەزوو: ئەمیش هەر وایە گەڕانەوەیە بۆ ئەسلەکەی خۆی بەلام بە کەمێك هەست و هۆشەوە و زانیاری بە هەندێك ئەسلّ و مەبەست.

٣. میهر: مەیل و گەڕانەوەیە بۆ ڕەگەزی خۆی لەگەڵ بوونی زانیاری و ئاگاداری بە دەستکەوتی خۆشی وەرگرتن و تێگەیشتن لە مەبەست.

٤. دوستی، دۆستی: بە دۆستییەك ئەڵێن لەگەڵ حەق (تعالی)دا، بێ هیچ جم و جووڵ و هۆیەك، یا پەیدابوونی هۆیەك.

٥. محب، محبب "موحیب": بە خاوەنی خۆشەویست ئەڵێن کە پێویست بە دۆستی نەبێ، جا هاوشانی بێت یان نا. وەکو یەزدانی بوزورگ پێویستی بە کەس نییە. دۆستایەتی ئەویش بێ هیچ پەڵپوو بیانوو دەبەند و باوێکە.

٦. محبوب، مەحبوب: بە زاتی حەق تعالی ئەڵێن جا دۆستی بن یان نا لە بەندی گێتی و بەندە داریەتی لەبەرترە.

٧. طالب. تالیب: بە پەیجۆر و گەڕان ئەڵێن. واتە ڕۆیشتن لە ڕێگای بەندە گێتی کردەوەی پیرۆز و بالاّدا نەك لە ڕووی دۆستییەوە بێت.

٨. مطلوب، مەتلوب: بە زاتی بێچوون ئەڵێن کە پەیجۆریگەر دەستەوەستان بێت لەوەی خۆی بە دۆستی دابنێ و بزانێ.

٩. عشق، عەشق: بە خۆشەویستی بە ڕادە بەدەر ئەڵێن.

١٠. سر، سیڕ: نهێنی: بە گرتن و کێشانی وزەی خوایی ئەڵێن. جارێك ئەو بەر سلوك ئەکەوێت، جارێك ئەم پێش ئەکەوێت، واتە جارێك جزبەی خوایی بەرسلوك ئەکەوێت، و جارێکیش سلوك بەر ئەکەوێت.

١١. پیر: بە دۆستی حەق تعالی ئەڵێن کاتێك داوا گەیشتبێتە سنووری تەواو جا لەو بارەوە شایستەی دۆستایەتی ئەوە لە گشت ڕوویەکەوە.

١٢. شوق، شەوق: بە پەشێوییەك بە دوای خۆشەویستیا، داوای ئەوەی دەستی کەوتبێت پاشان لە دەستی چووبێت، بە مەرجێ ئەگەر نەیدۆزێتەوە، دەستگیری نەبێت لە پەشێوی و بێ ئارامی بێ دەنگ بێت، بەلاّم عەشق هەر وەکو خۆی بمێنێتەوە
(لە ناخەوە، لە ناوەوە بکولێت) .

١٣. إشتیاق: بە بالاّترین پەشێوی ئەڵێن لە مەیل کردنی گشتی و خواستی تەواو عەشقێك لەم ڕێگا بە دەستکەوتن و دەست نەکەوتنی یەکسان بێت. نەك دەستگیری بوو ئارام بگرێت و دابکەوێت و دەستی نەکەوت زیاد بکات گڕ و کڵپەی، بەڵکو بارێکە هەتا هەتا، ئەم پلەیە لە ڕێژەیەکدانییە کە گەیشت بینا بێت و هەوڵبدات کە جیابێتەوە.

١٤. حسن، حوسن: جوانی: بە پایەداری بالاّ ئەوتریّت لە زاتیّکدا، ئەمەیش لە حق تعالی بەولاوە نییە.

١٥. جمال، جەمال: بە دەرخستنی دەربڕینی پلە و پایەی یار ئەلّیّن "معشوق " لە بارەی زۆری ئارەزوو خواستی عەشق.

١٦. جلال، جەلال: شکۆە: دەرخستنی بوزورگی خۆشەویستە — دلّدارە — لەلایەن وازهیّنانی عاشق بیّ هیچ پیّویستییەك لە عاشق و نەمانی دەمار و فیزەلە و خۆشەویستە و دان نانی عاشقە بەبیّ چارەیی و بیّ دەستەلاّتی خۆی لە رووی مەعشوقدا — خۆشەویستراوەدا.

١٧. لقا، لیقاء: بە یەك گەیشتن و بە دەرکەوتنی خۆشەویست ئەلّیّن بە جۆریّك عاشق بڕوا دارە و گومانی نییە کە ئەوە خۆیەتی.

١٨. شکل، شەکل: بە بوونی حەق تعالی ئەلّیّن.

١٩. لطف لوتف: بە پەروەردەکردنی عاشق ئەلّیّن لە ریّگای دیتن و هاوریّتییەوە بیّت.

٢٠. ملاحت. مەلاحەت: بە کۆتایی نەهاتنی بوزورگی پایەوپلەی یەزدان ئەلّیّن (واتە هیچ کەس بەو کۆتاییە ناگات) یا دلّنیا نابیّت.

٢١. ظهور. دەرکەوتن بینینی نووری ئەوە لە ریّی بینینی روت — دوور لە ماددە.

٢٢. شنگی شەنگی: بە دەرکەوتنی دەسەلاّتی درەوشانەوەی نوورەکانی اللّه ئەلّیّن لە ماددەدا.

٢٣. تشنگی، توشنەگی تینویّتی. بەزۆر ئاوردانەوە ئەلّیّن.

٢٤. شیّوە: بە جوانییەتی و شکۆمەندی ئەلّیّن.

٢٥. شمائل، شەمائیل: بە کەمیّك راکشان و راچەنینی خوایی ئەلّیّن لە هەر باریّك کە ئارامی گرتبیّت، بەلاّم جاریّك بەگەلّ یاو هەندیّکیش نا تا مرید فیزی کەساس و زەبوون نەبیّت.

٢٦. مکر، مەکر: بە فریودانی هەلّخەلّەتانی عاشق ئەلّیّن جاریّك لە ریّگەی میهرەبانی و جاریّکیش لە ریّگەی سەر پیّچی و قین گرتنەوە.

٢٧. فریب: بە إستدراجی خوایی ئەلّیّن و کەم کەم نزیك بوونەوە لیّی.

٢٨. وفا، وەفا: بە بایەخدانی ئەزەلی ئەلّیّن بیّ کردنی هیچ کاری خیّر و پاراستن لە شەڕ و خراپە.

٢٩. جفا، جەفا: بە داپۆشینی دلّی سالّیّك ئەلّیّن لە زانست و بینراوەکان.

٣٠. جور جەور: بە راگیرکردنی سالّیّك ئەلّیّن لە بەرزبوونەوە.

٣١. ناز: بە فریودان و هەلّخەلّەتانی خۆشەویست ئەلّیّن لەلایەن دلّخوازەکەیەوە (مەعشوق — بۆ عاشق).

٣٢. خشم، خەشم: بە دەرکەوتنی سیفاتی قهر ئەڵێن.

٣٣. کین: بە دەستەڵاتداری و زاڵبوونی سیفاتی قهر و قین ئەڵێن.

٣٤. جنگ، جەنگ: بە تاقیکردنەوەی خوایی ئەڵێن بە جۆرەها بەڵای ئاشکراو نهێنی.

٣٥. صلح. سوڵح: بە قەبوولکردنی کردار ئەڵێن بە هۆی نزیکبوونەوە.

٣٦. پردە، پەردە: بە بەرهەڵستکارێك ئەڵێن، واتە کۆسپە لە بەینی عاشق و مەعشوق هۆیەکەی رێگاکەیە نەك مەعشوق بێت.

٣٧. حجاب: بە کۆسپەیەك ئەڵێن کە عاشق لە دیتنی مەعشوق رێگا بگرێت بە ویست و دەسەڵاتی مەعشوق بێت بە جۆرێك لە جۆرەکان لەلایەن عاشقەوە بێت.

٣٨. نقاب: هەر هەمان واتای هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە.

٣٩. بام: بە کانگای تجلیات و شکوە ئەڵێن.

٤٠. خانە: خۆی بە خۆی ئەڵێن کە گومبوونی بوونییەتی.

٤١. مستوری، مەستووری: بە پاکوخاوێن زانینی ئەو پەری چۆنیەتی خوا ئەڵێن لە هەست و تێگەیشتنی خەڵکی گشت بگرە لە پێغەمبەران و ئەولیاکان (د.خ) پۆشراوە.

٤٢. تیزی، تیژی: بە دانە دواوەی کرداری بەندەکان ئەڵێن.

٤٣. سلطان، سوڵتان: بە چاودێری کاروباری کرداری بەندەکان ئەڵێن.

٤٤. سرکشی، سەرکەشی: بە سەرپێچی ویست و مەبەستیساڵێك ئەڵێن بە دەسەڵاتی ویستی خواوەندی.

٤٥. تندی، توندی: بە سیفاتی قەهار ئەڵێن لەسەر عاشق، وەکو دەسەڵاتی خوایی بێت نەك بە پێی پێویستی خواست.

٤٦. أمیری، ئەمیری: بە ویستی ساڵێك ئەڵێن کە ئەخرێتە بەری.

٤٧. توانائی، توانایی: بەرەوشتی فاعلی مختار ئەڵێن.

٤٨. توانگری، تەوانگەری: بە دەستکەوتی خۆ رەوشتە باڵاو بەرز ئەڵێن.

٤٩. دستگاه، دەستگاه: دەستکەوتی گشت خوو رەوشتە بەرزەکانە لەگەڵ بوونی دەسەڵاتی لەسەر گشت خۆ رەوشتێك.

٥٠. ستواری: بە گەمارۆدانی دەسەڵاتی خوداوەندی ئەڵێن.

٥١. تاخیر: بە هاتنی فەرمانی خوایی ئەڵێن.

٥٢. ترك یار: بە ڕاکێشانی خوایی ئەڵێن کاتێك لە سلوکدا پێشکەوێت و بە زەحمەت و تێکۆشانی زۆر کاری بکرێتەوە ناکاو گرتن و کێشان ڕوویدات وکارو کردەوەکانی قبووڵبکرێت و بارەکانی تری تەواو بێت و بە مەبەست بگات.

٥٣. غارت، غارەت: بە گرتن و کێشانی خوایی ئەڵێن بێ بیانووی هیچ سلوکێك و کارەکانی پێش بکەوێت، بە ڕێگایەك کە ساڵێك تیا کۆڵەوار بێت تا وەکو مەبەست ئەگەر چی فەرمان و کردار بڕوات و بێت بە سەریا.

٥٤. تاراج: بە خود دەسەلاتی ساڵێك ئەڵێن لە گشت بارەکانی ئاشکراو نهێنی.

٥٥. آشنائی: بە پەیوەندیی بوزورگی خالیق ئەڵێن کە بوونەوەری ئافەریدە کردووە وێنەی بەندیواری ئافەریدەکەر بە ئافەریدەکراوەوە.

٥٦. بێگانکی، بێگانەکی: بە خەریکبوونی عالەمی خوایی ئەڵێن کە بە هیچ ڕوویەك کەم و کوڕی بە هیچ خێرێك ناچوێت و وێنەی نییە.

٥٧. تکبر، تەکەبور: بوزورگداری بێ نیازییە لە گشت چەشنەکانی کرداری ساڵێك.

٥٨. شهد، شەهد: بە بوونی وجود گشتی ئەڵێن.

٥٩. دمە، دەمە: بە بوونی وجودی خوازراو ئەڵێن.

٦٠. گویند، گوی: بە پایە و جێگای بەندەگێتی — عبودیت — ئەڵێن.

٦١. محلە: بە خۆ ڕەوشتدارکردنی ڕەوشتی باڵا ئەڵێن.

٦٢. آستان - ئاستان: بە کردار و عبادەت ئەڵێن.

٦٣. در، دەر: بە دەرگای گوێڕایەڵی و فەرمان بەرداری ئەڵێن.

٦٤. یار: بە ڕەوشتی خوایی ئەڵێن و گشت ئافەریدەکراوێك دیمەن و وێنەی ئەو ئەنوێنێ و هیچ ناوێك لەم گونجاوتر نییە کە وشەی یەگانەگی پڕ بە پڕیەتی — توحید — و ساڵێکی دەورە داوە.

٦٥. غمکسار، غەم گوسار: بە خۆ ڕەوشتی ڕەحمانی دڵسۆزی حەق تەعالا ئەڵێن کە هەموو شتێك ئەگرێتەوە، واتە هەموویەتی و گشتییەتی تێدایە.

٦٦. غمخواری، غەم خواری: بە خۆ ڕەوشتی ڕەحمەتی حەق تەعالا ئەڵێن کە تایبەتی تێدا بێت.

٦٧. میهربان، میهرەبان: بە خۆ ڕەوشتی پەروەردەگاری ئەڵێن.

٦٨. دڵدار: بە ڕەوشتی فراوانی ئەڵێن (باسطی وکەیفخۆشی و خۆشەویستی لە دڵدا بێت).

٦٩. دلبر، دولبەر: بە ڕەوشتی گرژی و تەنگی قابزی ئەڵێن و ئازارو و سزای دڵی تێدا بێت.

٧٠. جانان: بەرەوشتی "قیومی" ئەڵێن کە گشت بوونەوەر بەو ڕاگیرکراوە کـە چـرکەیەك پەیوەندی بوونەوەر نەبێت پێیەوە هیچ شتێك نابێت و مانی نامێنێت.

٧١. جانی: بە ڕەوشتی مانەوەی هەتا هەتا ئەڵێن کە هەرگیز نەمان ڕێی تێی ناکەوێت.

٧٢. إستوار: بە دەسەلاتی خوایی ئەڵێن بەسەر خۆشەویستی سالێکدا.

٧٣. قامت، قامەت: بە شایستەی پەرستیار ئەڵێن، واتە شایەنی پەرستن و پاداش کە لەو بەولاوە کەس شایانی پەرستن نییە.

٧٤. قدرات: بە پێشکەوتنی خواوەند ئەڵێن لەسەر خۆشویستنی سالێك.

٧٥. زلف، زولف: بە گوم بوون و پۆشینی پێناس ئەڵێن کە کەس ڕێ و پەی تێنابـات بـام پێ نابات.

٧٦. موی: بەدەرکەوتنی پێناس ئەڵێن، واتە گشت کەسێك بە زانینی وجودی ئەو زانیاری دەست ئەکەوێت و ڕێکەی نییە.

٧٧. گیسۆی: بە ڕێگای خواست و مەبەست ئەڵێن.

٧٨. پێچ زلف، پێچی زولوف: بە دیمەن و شێوەی خواوەند ئەڵێن.

٧٩. تاب زلف: بە نهێنییەکانی خوا ئەڵێن.

٨٠. پێشانی: بە دەرکەوتنی نهێنییەکانی خوا ئەڵێن.

٨١. فرق، فەرق: بە خوو ڕەوشتی زیندوویەتی خوا ئەڵێن

٨٢. سر: نهێنی بە خوو ڕەوشتی ویستی خوا ئەڵێن.

٨٣. أبرو، ئەبرو: بە کەوتنی پشتگوێ خستنی سـالێك ئـەڵێن لەیلـەکان (واتـە کەوتنـە خوارەوەی و گوێ پێنەدانی سالێك لە پلەکان) بە هۆی کەم و کورییەك کە لێی دەرئەکەوێت "و پەیدا ئەبێت".

٨٤. کەمان ابرو، کەمانی ئەبرۆ - کەوانی برۆ: پایەدارەکان کە لـەو پلـەدارترو مـەزنترو سەفا بینتر بن: واتە روون بینتر بە خستنەڕووی کەوتنی سالێك ئەڵێن لە پایە و پلە و بە هـۆی کەم و کوڕی و درێخی کردنی و دووبارە گەیشتنی بە مەبەست— بە هۆی دەستەلات و کێـشان، و بایەخدان بەو پلە و پایەیەی کە بوویەتی.

٨٥. طاق ابرو، تاق برۆ: بە پشتگوێ خستنی ساڵێك ئەڵێن کە لە پایە و پلە ئەکەوێتە خوارەوە،بە هۆی کەم تەرخەمی ساڵێك کە ئەیکات و گوێ پێ نەدانی.

٨٦. مژه، موژە: کەم تەرخەمی کردنی ساڵێکە لە کردار و بە دەسەلاتی خوایی و حیکمەتی.

٨٧. تیر موژە، تیری موژە: بە کەم تەرخەم نەکردنی ساڵێك ئەڵێن بە ئاشکراو بە نهێنی.

٨٨. چشم، چەشم، چاو: بە رەوشتی (سیفەتی) بینایی و بینینی خوایی ئەڵێن.

٨٩. دیده: بە ئاگاداری و پێزانینی خوایی ئەڵێن لە گشت کاروبارێکی خێر و شەڕ (چاکە و خراپە).

٩٠. چشم مست، چاوی مەست: بە پەردە دادان و پۆشینی خوایی ئەڵێن لە کەم و کوری کەم تەرخەمی ساڵێك و هی تر کە یەشتا کەسی تر بە سەریا ئاگادار نەبووبێ لێشی بوورابن.

٩١. چشم خمار، چاوی بە خومار: بە شاردنەوەی کەم تەرخەمی ساڵێك ئەڵێن لە ساڵێك واتە نەخستنەڕوو، بەلاّم هەڵماڵینی بۆ مەزنە پایە بەرزەکان کە لەو کامل ترو پایەدارترو روون تر بن و جارێك روون و ئاشکرایە بە زووبانی ئەوانەوە و جارێکیش ناء.

٩٢. چشم اهوانا، چەشی ئاهوو وانە: چاوی مامزی ئاسکیانە بە داپۆشینی خوایی ئەڵێن کەم و کوری لە غەیری ساڵێك، بەلاّم وریا کردنەوەی ساڵێك لەو کەمتەرخەمییە کە کردوویەتی تا بایەخی پێ بدات بۆ ئەوەی ساڵێك کەڵکی لێوەرگرێت و ئەو کەم و کوڕیە نەیەڵێت زاڵ بێت بە سەریاو پینە و پەرۆی خۆی بکات (مەبەستی دووەم). ئەو ناوانەی لە نێوان عاشق و مەعشوق دایە و تیایدا بەشداران دێتە ئاراوە و لە دەربڕیندا ناوێکی تایبەتی نییە، بەلاّم لە رووی واتاوە نەك وشە سازی جارێك تایبەت ئەبێ و جارێك ناء.

١. مجلس، مەجلیس: بە ئایەت و کاتی ئامەدەگی بوونی فکرە لای خوا و بەتاڵی تەواو ئەڵێن.

٢. عشرت، عوشرەت: چەش و لەزەتی هاودەمییە لەگەڵ نوری خوا و هەست و ئاگادارییە لەو لەزەتە.

٣. شراب، شەراب: بە هەڵچوون و زاڵبوونی عەشق ئەڵێن سەربارەی کردووە کە شایانی لۆمە و تانە بێت و ئەو خاوەنی پایە و بالاّ بێت ئەوانە وێنەیان کەمە و لە کۆتایدا تایبەتن و سلوکیان کۆتایی پێ هاتووە.

٤. شراب، خم، شەرابی خوم: بە ژیانی تێکەلاّو و ئاوێتە ئەڵێن بەرامبەر بە بەندە گێتی.

٥. شەراب پەخت: بە ژیانی پوخت ئەڵێن رووت لە مادده.

٦. شراب خانه، شەراب خانه: بە عالەمی فریشتەکان ئەڵێن مەلکوت.

٧. می، مەی: بە زاڵبوونی عەشق ئەڵێن لەگەڵ کردەوەیشدا سەلامەت بێت و ئەمانە ئەهلی کەماڵن کە خواسی لە نێوان سلووکدان .

٨. میخانه، مەیخانه: بە عالەمی لاهوت ئەڵێن.

٩. می کده، مەی کەده: بە پێی پارانەوە ئەڵێن یا کونیەتی لالاوە ئەڵێن.

١٠. خمخانه: بە ئاستانە و هێلانەی کەف و کوڵی عەشق ئەڵێن، واتە هەڵ ئەچێت ئەویش عالەمی دڵە.

١١. بادە: بە پیاڵەی عشق ئەڵێن کاتێ کە لاواز بێت، واتە خەڵکی رەشۆکی سادە وابێت و لە سەرەتای سلووکدا بێت.

١٢. ساقی: بە شەراب ئەڵێن.

١٣. قەدح: بە وەختێك ئەڵێن.

١٤. جام: بە ئەحواڵ ئەڵێن.

١٥. سراحی، سوراحی: بە پایە و جێگا ئەڵێن.

١٦. خم، خۆم: بە هەڵوێست ئەڵێن.

١٧. جرعە، جورعە: بە ناوی رەوشت "سیفات" ئەڵێن و بارودۆخێکە لە سلووکی سلووك گەڕ شارابێتەوە و پۆشرابێت.

١٨. مستی، مەستی: داگیرکردنی عەشقە، واتە گشت سیفاتەکانی ناوەوە و دەرەوە ئەمە بریتییە لە پلەی سەرەتایی سەرخۆشی و مەستی.

١٩. مستی خراب، مەستی خەراب: بە قووتا چوونی گشتی ئەڵێن بێ ئاگاداری لە هیچ روویەك.

٢٠. نیم مەستی: بە ئاگاداری رۆچوون ئەڵێن و سەرنجدان لە قوتا چوونی خۆی.

٢١. خرابات، خەرابات: بە وێرانی سەر تێك چوون ئەڵێن.

٢٢. هشیاری، هوشیاری، هۆشیاری: ئافاتێکە لە زاڵبوونی عەشقەوەیە و رەوشتی دەروو ناوەوەیە و بریتییە لە هۆشیاری سەرەتایی بام بە هۆشی هاتنەوە.

٢٣. خمار، خومار: بە گەڕانەوە ئەڵێن لە جێگا و پایە و گەیشتنە بە "قهر" سەرنگون بوون نەك بە رێگەی دابران.

٢٤. رندي، رەندی: بە سرنجدابڕین ئەڵێن لە گشت کردارە جۆرا و جۆرەکانی تاعەت.

٢٥. فلاشي: هاودەمی دەستپێ کردنی کارەکانە هەر چۆنی حاڵ پێویست بکات و هەڵگرێ.

٢٦. أوباشي، ئەو باشي: واز هێنانە لە پاداش و چاکە هەم لە کردنی تاعەت و هەم خۆپاراستن و وازهێنان لە تاوان و گوناه لەبەر زاڵبوونی خۆشەویستی.

٢٧. لا أبالي: بێ باکییە لە هەر شتێك کە بکرێت یا بوترێت لەبە دەم گێلیدا.

٢٨. شمع، شەمع: بە نووری خوا ئەڵێن.

٢٩. کباب، کەباب: بە پەروەردەکردنی دڵ ئەڵێن لە (تجلیاتدا) لە شکۆمەندیدا

٣٠. سبوحي: بە گفتوگۆ ئەڵێن.

٣١. عیوني: دواندنی دەم بە دەم ئەڵێن.

٣٢. شاهد: بە تجلي ئەڵێن.

٣٣. ئەقڵ: بە هەڵدانەوە و دەرخستنی نهێنی ئەڵێن.

٣٤. شبانگە: بە خاوەن دارێتی ئەحواڵ ئەڵێن.

٣٥. بە هاتنی نوور رووناکی ئەڵێن یەك لە دوای یەك.

٣٦. شب، شەو: بە عالەمی غەیب و نادیار ئەڵێن هەروا بە عالەمی (جبروت)یش ئەڵێن ئەم عالەمە هێڵێکە کێشراوە لە نێوان "وجود و عەدەم" بوون و نەبوون.

٣٧. شب قدر، شەوی قەدر: بە وێستان و مانەوەی سالێك ئەڵێن لە هەمان کاتی لەناوچووندا پێ بە پێی بوو نییە بوونی بە بوونی حەق تعالی بام لە ناوچوونی وجودی سالێك لەبەردەم وجودی حەق تعالی.

٣٨. شب یلدا، شەوی یەڵدا: واتا شەوی تاریك بە کۆتایی رەنگەکان ئەڵێن کە زۆربەی زۆریەتی "سواد اعظم ".

٣٩. عید، جەژن: بە جێگای کۆبوونەوە ئەڵێن یا پایەی گشتی.

٤٠. نورزو، نەورۆز: بە جێگای بلاوەکردن ئەڵێن.

٤١. کفر: بە تاریکی عالەمی بلاوەکردن ئەڵێن.

٤٢. ترسا، تەرسا: بە معاني و حەقایق ئەڵێن کاتێ کە ورد بێت.

٤٣. دیر: بە عالەمی ئینسانی ئەڵێن.

٤٤. کلێسا: بە عالەمی حەیوانی ئەڵێن خەڵکی زیندەوەر.

٤٥. بت: بە خواست و مەبەست ئەڵێن.

٤٦. ناقوس: دیسان بە جێگای جیابوونەوە ئەڵێن کە یاد بکرێتەوە.

٤٧. چلیپا: بە عالەمی سروشت ئەڵێن.

٤٨. توبە، تەوبە: بە واز هێنان لە شتێك ئەڵێن و رووکردنە شتێکی تری چاکتر و تەواو.

٤٩. ئیمان: بە هەندێك دانایی لە بارەی حەق تعالی لە عالاوە ئەڵێن.

٥٠. اسلام: بە کردار و گەڕان و دواکەوتنی ئەڵێن.

٥١. دید: بە بڕوایەك ئەڵێن کە لە جێگای جیابوونەوە سەری بەرزکردبێتەوە.

٥٢. زهد: بەروو وەرگێڕان ئەڵێن یا وازهێنان لە زیادی و پلتەی دونیا، بەلاّم لە کاتێکدا کە نەفس بۆی بە پەرۆشەوە بێت و حەزی لێ بکات وە بیبەوێت .

٥٣. عیبادەت: بە هەوڵ و تێکۆشانی سالێك ئەڵێن.

٥٤. نماز، نوێژ: بە فەرمانداری و گوێ رایەڵی کردن ئەڵێن.

٥٥. روزە، أمساك: بە گرتنی اشتیهاو نفس ئەڵێن یان ئاورنەدانەوە .

٥٦. زکات: بە وازهێنان پالاّوتەکردنی نەفس ئەڵێن و پەسەندکردنی سوودی خەڵك ئەڵێن بەسەر هی خۆتا.

٥٧. کعبە: بە جێگای بەیەك گەیشتن ئەڵێن.

٥٨. صبح: بە رۆیشتن ئەڵێن بۆ لای خوا.

٥٩. بیابان، چۆلاّی: بە رێ گرتن ئەڵێن یان رێگا بڕین.

٦٠. سجادە، سەجادە: بە بەست و گرتنی ناو دڵ ئەڵێن، واتە لە هەرچی رووی دڵی لەو بێت.

٦١. تامات،: بە دۆست و شوناس ئەڵێن یا زانیاری بالاّ.

٦٢. فرقە: بە رێکوپێکی دەسەلاّت ئەڵێن یام بە نیشانەی دیەن و وێنەش هەم ئەڵێن.

٦٣. فروختن: بە وازهێنان ئەڵێن لە تەکبیر و تێکۆشان لەگەڵ خودای مەزن.

٦٤. دام: بە ئەندازەی دەسەلاّت "اختیار" ئەڵێن.

٦٥. گرو کردن: تەسلیمی وجودو بوونە بە حوکمی ئەندازە و قەدەر و وازهێنان لە تەکبیر و هەوڵدان بە خواستی خۆی.

٦٦. بدل کردن: بە لادان ئەڵێن لە شتێك بۆ شتێك تا مەبەستێکی پێ دەستگیر بێت.

٦٧. درباختنی: بە سرینەوەی کردار و رەفتاری رابوردوو ئەڵێن لەبەر چاو.

٦٨. ترك کردن: وازهێنان بە هیوا بڕین ئەڵێن لە هەر شتێك.

٦٩. رفتن: بە بەرزبوونەوە ئەڵێن لە عالەمی بەشەرییەت و ڕۆیشتن بۆ عالەمی ئەرواح.

٧٠. برحاستن: بە نیاز و بریاردان ئەڵێن، واتە سووربوون لەسەر مەبەست.

٧١. نشستن: بە دامرکان و ئارامی ئەڵێن.

٧٢. امدن: هاتن بە گەڕانەوە ئەڵێن بۆ عالەمی بەشەرییەت لە عالەمی ئەرواحەوە تا لە عالەمی سەرخۆشی و مەستی نوقم بوون.

٧٣. دروون: بە عالەمی مەلەکوت و فریشتە ئەڵێن.

٧٤. عقل: بە ئامێری جیاکردنەوەی خێر و شەڕ ئەڵێن.

٧٥. فهم: ئامێری تێگەیشتن و زانینە یا تێگەیشتن.

٧٦. عالەمی فریشتەیە.

٧٧. پایز: بە جێگای وشکەڵ ئەڵێن.

٧٨. جهاد: بە پایە و جێگای زانیاری ئەڵێن.

٧٩. تابستان: بە پایەی زانست ئەڵێن.

٨٠. زمستان: بە جێگاو پایەی کەشف و ئاشکرا کردن ئەڵێن.

٨١. گلزار: بە گەشانەوەی گشتی و فراوانی ئەڵێن، بەڵام هەرچی بدرێتە پاڵ بەویش ئەخوێنرێتەوە.

٨٢. بستان: جێگای گەشانەوە و فراوان بوون ئەڵێن و تایبەت نییە بە شتێك هەموو شتێك ئەگرێتەوە.

٨٣. نرگس: بە ئەنجامی زانست ئەڵێن کە بە کردار پەیدا بێت لە ئاهەنگ و خۆشی زۆرەوە.

٨٤. گڵ: بە ئەنجامی علم ئەڵێن لە دڵدا پەیدا بێت.

٨٥. لالە: بە ئەنجامی تێگەیشتن و زانست ئەڵێن کە بیبینێت.

٨٦. شکوفە: بە بەرزی پایە ئەڵێن.

٨٧. بنفشە: بە رازێك ئەڵێن "نکتە" کە هێز کاری تێنەکات.

٨٨. ریحان: بە نوورێك ئەڵێن کە لە رادەبەدەری وەرزش و پاڵاوتن پەیدا بوبێت و دەسکەوتبێت.

٨٩. نشوە: بە سەرکەوتن ئەڵێن.

٩٠. نما: بە دەستگیربوونی عیزەت ئەڵێن لە پەروەردەکردنی پەروەردگارەوە بێت.

٩١. زردی: لاوازی سلووکە: بەوە ئەڵێن.

٩٢. سرخی، سووری: بە هێزی پتەوی سلووك ئەڵێن.

٩٣. سزی، سەوزی: بە کاملی تەواوی گشتی ئەڵێن و هەرچیش بمێنێتەوە قیاس ئەکرێتە سەری لە هەر جۆرێکەوە بێت بۆی تەئویلی بۆ ئەکەن.

٩٤. أبر: بە پەردەیەك ئەڵێن کە ببێتە هۆی ئاگاداری و بینین بە هۆی هەوڵ و خەباتێك کە ئەینوێنێ.

٩٥. باران: بە هاتنە خوارەوەی رەحمەت ئەڵێن.

٩٦. جوبیا: بە عیبادەت و بەندە گێتی مجازی ئەڵێن.

٩٧. سفیدی: بەیەك رەنگی ئەڵێن، واتە بە رووتێکردنێك دەستیان کەوتبێت و تەرکی هەموو شتێکیتر بکات، لە خوا بەولاوە.

٩٨. کبودی، کەبوودی: بە تێکەڵ کردنی خۆشەویستی و ناخۆشەویستی ئەڵێن.

٩٩. إب، ئاب، رەوان: بە گەشی و خۆشی دڵ ئەڵێن.

١٠٠. سیل، سەیل: بە زاڵبوونی ئەحواڵ ئەڵێن.

١٠١. بۆی: هوشیاری و وریایی ئەڵێن لە پەیوەندی و پەیوەستی دڵ کە لە بنچینەدا بوویەتی لە یەکەم پلەی گشتیدا و ئێستاش لە حاڵ و بارێکی تردا تووشی جیاوازی و جیابوونەوە هاتووە و گرفتار بووە.

١٠٢. نسیم، نەسیم: بە یادی بایەخ پێدان ئەڵێن.

١٠٣. مطرب، موتریب: بە هۆشیاریکەر ئەڵێن.

١٠٤. ترانە، تەرانە: بە ئاینی خۆشەویستی ئەڵێن.

١٠٥. نالەزار: بە گەڕان ئەڵێن بە شوێن خۆشەویستیا.

١٠٦. نالەی زیر: هەر بە خودی خۆشەویستی ئەڵێن.

١٠٧. سماع: بە جێگە دانیشتن ئەڵێن.

١٠٨. پای کوفتن: بەرووتێکردنی دڵ ئەڵێن.

١٠٩. دست زدن: بە پاراستن و چاودێری ئەڵێن ئەوانیتری چەنگ و ساز و دەبان وەکو ئەمان پێوانە ئەکرێت بە وردی سرنجی لێ بگرە هەر یەکێ لەمانە سەربەخۆ بە تەئویلی ئەم ئەندازەیە ئەکرێت و ئەم میتدارە بە پوختە و کورتی رافەکرا غەیری ئەمانە بە ئاشکرای ببینە، بەڵکو واتای راستتری بێت و پەیوەندی بە دڵەوە پتر هەبێت وای بۆ بڕیار ئەدرێت.

١١٠. چشم، شهلا: بە دەرخستنی پلە و پایەی بەرزی سالێك لەسەر سالێکی تر ئەڵێن و سەرچاوەی شۆرت لەم جێگایەوە پەیدا ئەبێ و ئەمەیش کەم لە فروفێڵ دوور ئەبێت.

١١١. چشم ترك: بە شاردنەوە و داپۆشینی ئەحواڵی و کەمالاتی سالێك و پلە و پایەی بەرزی ئەو ئەڵێن کە هەر خوا ئاگاداریەتی و لە خەڵکیتر شاراوە ئەم پایەیەی.

١١٢. چشم نرگس: بە شاردنەوەی ئەحواڵ و پلە و پایەی بەرزی سالێك ئەڵێن کە خەڵك بزانێ یام خۆی بزانێ یام نەزانێ وەلی یە ئەم دوو قەومە لەیەك چەشنن.

١١٣. رووی بە ئاوێنەی درەخشان و درەوشاوەی "تجلیات" ئەڵێن.

١١٤. ماە رووی: بە درەوشانەوەی دوو ماددە ئەڵێن کاتێك لە خەودا بێت یان لە کاتی ژیریدا خۆی لای خۆی بێت.

١١٥. چهرە: بە درەوشانەوە ئەڵێن "تجلیات" و ئاگاداربێت بەسەر چۆنییەتیدا و زانا بێت بەسەر ئەوانیتریشدا.

١١٦. رخ: بە درەوشانەوەی "تجلیات" تایبەتی ئەڵێن.

١١٧. چهرە گلگون: بە درەوشانەوەیەك ئەڵێن "تجلیات" کە لە ماددە و ئامێرەوە نەبێ جا لە خەودا بێت یام لە بێهۆشی.

١١٨. خال سیاە: بە عالەمی نادیار "غیب" ئەڵێن.

١١٩. خط: بە زانیار بە عالەمی نادیار ئەڵێ، واتە "عالَم الغیب"

١٢٠. لب: بە ئاخاوتن و گوتن ئەڵێن یان بە وشە.

١٢١. لب لعل: بە ناوەخنی وشە ئەڵێن.

١٢٢. لب شکری: بەو وشەیە ئەڵێن هاتووەتە خوارەوە کە پێغەمبەرەکان بە هۆی فریشتە و ئەولیا بە هۆی پالاوتنی خۆیەوە ئەڵێن یا خاوێن کردنی.

١٢٣. لب شیرین: بە وشەو ئاخاوتنی پێ هۆ ئەڵێن "واسط" بە مەرجێ بوونی هەست و هۆش.

١٢٤. دهان: بە خوورەوشتی بێژەر ئەڵێن بە ئاشکرا.

١٢٥. دهان کوچکی: دەم بچووکی: بە خوورەوشت و پێناسی گفتۆگۆکەر ئەڵێن کە دوور بێت و خاوێن بێت لە (فهم) و گومانی ئینسانی، واتە لەم رێگایانەوە نەبێت.

١٢٦. سخن: قسە بە هێماو ئیشاراتی خوایی ئەڵێن بە گشتی.

١٢٧. در سخن: بە هەڵماڵین و دەرکەوتن ئەڵێن بە هێماو ئیشاراتی خوایی لە ماددە و غەیری ماددە لە مەحسوس و مەعقول و ئاشکرا کردنی نهێنییەکانی خوایی.

١٢٨. سخن چون در: بە ئیشاراتی ئاشکراو روون ئەڵێن لە مادده و غەیری مادده مەحسوس و مەعقول.

١٢٩. غمزه: بە ئیشاراتی هەست پێ کراو ئەڵێن.

١٣٠. زبان: بە نهێنی "أسرار" ئەڵێن.

١٣١. زبان تلخ: بە شتێك ئەڵێن کە بگونجێت لەگەڵ "تقدیر"دا.

١٣٢. ذقن: بە شتێك ئەڵێن بگونجێت لەگەڵ سروشتی ساڵێك.

١٣٣. زنج: بە جێگەی تێبینی ئەڵێن.

١٣٤. خد: بە جێگەی لەزەت ئەڵێن.

١٣٥. چاه، زنخ: بە چەواشە بوونی نهێنی "أسرار" ئەڵێن لە بینراودا.

١٣٦. بناگۆش: بە دەقیقە ئەڵێن.

١٣٧. سلسله: بە پەناهگرتنی خەڵك ئەڵێن بە مەزینەتی خوای بزورگ بە جۆرێکی گشتی.

١٣٨. دوش: بە سیفەتی بزورگێتی خوا ئەڵێن.

١٣٩. سینه: بە سیفەتی زانیاری خوایی ئەڵێن.

١٤٠. سرحون سم: بە هاتنە دەرەوەی ساڵێك ئەڵێن کاتێك پەروەردەکردن گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی ساڵێك و هەرگیز سەرپێچی بە هیچ جۆرێك لێی روو نەدابێت کە ئەرك و ئەرکدانە سەر بە سروشتی ساڵێك سەرپێچی و جیاوازی بۆ پەروەردەگەر نەبێت.

١٤١. میان: بە رابووردوو ئەڵێن مابێتەوە لە نێوان داواکەر و داوالێکراودا لە بارەی رۆیشتن و پایە و جێگاو داپۆشراو و هیتریش.

١٤٢. میان باریك: بە بوونی پەردە ئەڵێن بۆ ساڵێك کاتێك کە پەردەی تر نەبێت.

١٤٣. موی میان: بە سرنجی ساڵێك ئەڵێن لە بارەی برینی ئەو پلانەوە لە خۆیو لە غەیری خۆی.

١٤٤. دست: بە سیفەتی تەوا نائی ئەڵێن.

١٤٥. بە سیفەتی دەورەدان ئەڵێن " إحاطة"

١٤٦. ساعد: بە سیفەتی هێز ئەڵێن.

١٤٧. بازو: بە خواست و چوونە سەر "شیت" ئەڵێن.

١٤٨. هدیه، بەخشندە: بە پایەو پلەی پێغەمبەرایەتی و ویلایەت ئەڵێن، واتە هەر جۆرێك هەڵبژاردن و پالاوتەکردن بێت.

١٤٩. بعث: به سرووش ئەڵێن الهامی ئاشکراو روون.

١٥٠. سلام و درووود: به کردارو رەفتاری پەسند ئەڵێن.

١٥١. پیام: به ئەمرو نەهی ئەڵێن فەرمانی کردن و نەکردن که ئافەریدەکراوه بەوه کارو رەفتار بکەن و خوا یار بێت به رێگای واجب.

* * *

# مەبەستی سێیەم

لە بارەی چەند وشەیەك کە تایبەتن بە عاشق و ئەحواڵی ئـەو، ئەگەرچـی بـە چەشـنێکیتر پەیوەندی بە مەعشوقەوە هەیە.

١. (وصال): ویسال بە پایەی یەگانەگی ئەڵێن لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵ خوادا.

٢. کنار: بە دەستکەوتنی نهێنی و بەردەوام بوونی چاوەدێری ئەڵێن.

٣. بوس: بە پێشاندانی ئامادەیی ئەڵێن بۆ قبووڵ کردنی چۆنییەتی وشە — کلام (عملی و عیلمی و صوری و معنوی).

٤. فراق: بە گومبوون ئەڵێن "غیبت" لە پایەی وەحدە تا "یەکیەتیدا".

٥. هجران: بە لاکردنەوە و هۆدانەوە ئەڵێن بێ هیچ حەقێك چ نهێنی و چ ئاشکرا.

٦. غم بند: بە بایەخدان ئەڵێن بە خواست و مەبەستی مەعشوق.

٧. أندوه: بەسەر لێشێوان ئەڵێن لە کارێك نەیزانێت ڕێی تێ نەبات.

٨. وجد، فقدان، حسن: بە بارودۆخێك ئەڵێن کە لە دڵدا پەیدا بێت ببێتە هۆی خواست و داواکردن بە بایەخی تەواو و داخێکی زۆر گران بێت لە جیابوونەوەی لە خەمگین خانەدا "کلبـة الاحزان" خانەی دڵتەنگی.

٩. غمگداز: بە جێگای ئامادەگی ئەڵێن.

١٠. محنت: بە زەحمەت و ئازارێك ئەڵێن بە هـۆی مەعـشوقەوە بـە عاشـق بگـات و لـە دەسەڵاتیدا نەبێت.

١١. میدان: بە مقام و پایەی دەرکەوتن ئەڵێن.

١٢. چوگان: بە هەڵسەنگاندنی گشت کارێك ئەڵێن لە ڕێگای زۆر لێکردن و لەناوچوون.

١٣. کون: بە پێی بڕیاری زۆر لێکردن و لە ناوچوون ئەڵێن.

١٤. تظلم: بە هاوار و پەنابردن ئەڵێن بۆ حەزرەتی بێچوون کە بیپارێزێـت لـە شـەیتان و نەفس لە درێغی و کەم و کوڕی خۆی.

١٥. ناڵە: بە پارانەوە و دواندن ئەڵێن.

١٦. فریاد: به زیکری ئاشکراو دەنگ ئەڵێن، واتە دەربڕین بە توندی.

١٧. واله: به نیشانەی تەواوی عەشق ئەڵێن که زوبان کۆڵبێت له بارەی بەراستی نەك لە ڕێی بەخشندەوە، بەڵکو لەو پەری بێ چارەیی دابێت.

١٨. فغان: به دەربڕین و دەرخستنی بارەکانی دەروون ئەڵێن.

١٩. رنج: به بوونی شتێك ئەڵێن که پێچەوانەی ویستی دڵ بێت.

٢٠. درۆ: به بارێك ئەڵێن که له خۆشەویستییەوە روو بدات و دڵدار توانای هەڵگرتنی ئەوەی نەبێت.

٢١. بیمار: به دژواری و پەژارە و پەشێوی ئەڵێن له ناخەوە بێت.

٢٢. مردن: به دەرکردن و داماوی ئەڵێن له خوای مەزن.

٢٣. راحت: به بوونی شتێك ئەڵێن که بسازێ و بگونجێ لەگەڵ خواست و ویستی دڵ.

٢٤. زیندگی: به قبووڵ و رووتێکردن ئەڵێن له حضوری حەق تعالادا.

٢٥. تندروستی: به جێگیربوون و مانەوەی دڵ ئەڵێن و به هێزی دەرەوە و ناوەوە.

٢٦. ناتوانی: بەبێ هێزی و دەست نەگەیشتن ئەڵێن بۆ هەر مەبەست و خواستێك.

٢٧. إفتادگی: به دەرکەوتنی بارودۆخێك ئەڵێن و به توانا نەبوون و دەسەڵاتی عیبادەت و بەندە گێتی به هۆی سزای ئەو "حضرته".

٢٨. خرابی: به بنبڕکردنی هەڵگێر و وەرگێر و تەگبیری عەقڵ ئەڵێن به رووتێکردن و تەسلیم بوونی تەواو.

٢٩. بێهۆشی: به پایه و جێگای سڕینەوە ئەڵێن که سیفات و رەوشت بسرێتەوە.

٣٠. باهۆشی: به پەکخستن و لەناوچوونی دەروو ناوەوە ئەڵێن له عەشق و دێوانەیی.

٣١. طغرا: به دەسەڵات و یاساکانی عەشق ئەڵێن بەسەر و سیفاتی عاشق له کردەوە پارێزراوەکان.

٣٢. بندگی: به جێگای ئەرك خستنه سەر ئەڵێن.

٣٣. ازادی: به جێگای سەر شێواندن ئەڵێن.

٣٤. بێنوایی: بەبێ توانایی ئەڵێن.

٣٥. فەقیری: به هەژاری بێ دەسەڵاتی ئەڵێن که عیلم و کرداری لێ دڕانرا بێ، واته لێی سەندرابێتەوە .

٣٦. سعادت: به خوێندنی سەرمەدی ئەڵێن.

٣٧. دووری: هەست کردنە بە ناسینی إسم وسیفات و کردار هی خواوەند.

٣٨. کاهلی: بە سستی رۆیشتن ئەڵێن ئەمەیش وەختێك ئەبێت کە ساڵێك کەوتبێتە رێ کردن و ساڵێك باڵا بێت، ئەم جۆرە رۆیشتنە بەرزترین و باڵاترین هەنگاوە پێویستی بە گەڕانەوە نییە و وایش ئەبێت هۆکەی کەم و کوڕی ساڵێکە کە گوزەر بکات هەنگاوی بەرەو نزمی ئەچێت و سەرەو خوار ئەبێتەوە.

٣٩. شتاب: بە رۆیشتن ئەڵێن.

٤٠. بازوی: بە روتێکردنی پاڵفتە ئەڵێن لە کارەکان نە پاداشتی بوێ و نە پایەی بەرز بەڵکو تەنهای بۆ خوا بە پووختەیی ئەیکات.

٤١. حضور: بە جێگای یەکێتی و تەنهایی ئەڵێن.

٤٢. غیبت: بە کانگای ریشەدار و سەخت ئەڵێن.

٤٣. گرمی: بە گەرمی خۆشەویستی ئەڵێن.

٤٤. سردی: بە ساردبوونەوەی نەفس ئەڵێن، ئەمە کۆتایی جێگەی خۆشەویستییە، واتە دوا پلەیەتی.

٤٥. خواب: بە لەناوچوونی دەسەلاتی خودرایی ئەڵێن لە کرداری ئادەمیزاد دەچێت.

٤٦. بێداری: بە عالەمی هۆشیاری ئەڵێن لە بارەی بەندە گێتییەوە.

٤٧. محمل: بە ئارامی ئەرك هەڵگرتن ئەڵێن.

٤٨. زر: بە ریازەت تێکۆشان و بەربەرەکانی ئەڵێن لەگەڵ نەفسدا.

٤٩. سیم: بە پالاوتەکردن و خاوێنکردنەوەی دەرو ناوەوە ئەڵێن ئاشکراو نهێنی.

٥٠. شست و شۆی: بەلابردنی کەم و کوڕی ئەڵێن ورد و درشتی فڕێ بدرێت کە لە درێغی کردنەوە هاتبێتە دی و لە روونی و پاکی و بێگەردی حضوری عاشق و معشوقەوە بێت.

٥١. جهت و جودی: بە وردە گرتن ئەڵێن لە هەرلایەکەوە بێت.

٥٢. گفتوگۆی: بە تانەو لۆمەوە گازیندەی خۆشەویست ئەڵێن.

## له نووسراوێکی تردا ئەمانە هەیە

١. جام: بە بارودۆخی دائەنێن.

٢. صراحی: بە پایە و جێگا ئەڵێن.

٣. مستی: بە گەمارۆدانی عەشق ئەڵێن کە پەنگ بخواتەوە.

٤. هشیاری: بە دیسان گەڕانەوەی عەشق ئەڵێن زاڵ بێت بە سەریا.

٥. صبوحی: بە ڕووداو ئەڵێن.

٦. صبح: بە دەرکەوتنی بارو چۆنییەتی ساڵێك ئەڵێن.

٧. عید، جەژن: بە جێگای کۆبوونەوە ئەڵێن.

٨. نورۆز: بە جێگای جیابوونەوە ئەڵێن.

٩. صبا: بە پەرێشانکردنی دڵی ساڵێك ئەڵێن بە پەژارە و شێواندنی نەفس..

١٠. دیر: عالەمی ئینسانی ئەڵێن.

١١. جۆش: بە ئاشکرا کردنی حالآت ئەڵێن.

١٢. اسلام: بە کرداری ڕێك و جوان و لە بار ئەڵێن.

١٣. دف: بە بروایەك ئەڵێن لە کانگای جیابوونەوە سەر دەرئەکات.

١٤. زهد: پشتگوێ خستن و ڕوو وەرگێڕانی ساڵێکە لە لەزەت و خۆشی و چەشی نەفسانی و هەوای نەفسی چەپەڵی فەرماندەری خراپە کردن ئەڵێن.

١٥. فخ، فاقە: بە سلوك و ڕۆیشتن ئەڵێن لە ڕێگای خوا.

١٦. بیابان: ڕووداوی ڕێگایە واتە بەو ڕووداوە ئەڵێن لە ڕێگا ڕووئەدات.

١٧. کعبە: بە مقامی نەفس ئەڵێن بەو کانگایە ئەڵێن.

١٨. خرقە: بە چاکبوونی ساڵێك و لەبار بوونی ئەڵێن.

١٩. سجادە: بە کرانەوەی دڵی ساڵێك ئەڵێن.

٢٠. ثابت: بە عالەمی زانست ئەڵێن.

٢١. زستان: بە عالەمی گەرداو و لێشاو و فەر (فیض) ئەڵێن.

٢٢. گلزادە: بە گەشانەوە و کشانەوەی سفای دەروون ئەڵێن، واتە بێگەردی ناوەوە.

٢٣. نرگس: بە ئەنجامی ناوەوە ئەڵێن.

٢٤. سبزی: بە خودی زانیار و پێناسی ئەڵێن.

٢٥. سرخی: بە خەستی هێزی سلووك ئەڵێن.

٢٦. زردی: بە خۆرەوشتی خۆ بە کەم زانینی ساڵێك ئەڵێن.

٢٧. سفیدی: بە یەك رەنگی ساڵێك ئەڵێن.

٢٨. فقر: بەبێ پێویست ئەڵێن.

٢٩. بیداری: بە دەرکەوتنی نووری (فیض) ئەڵێن.

٣٠. سعادەت: بانگ کردنی ئەزەلی و سەرمەدییە.

٣١. ساربان: رێنموونی رێگای حەقیقەتە.

٣٢. طریق: بە رێگای کعبە و گەیشتن ئەڵێن بە پلە و پایە.

٣٣. طی: بە دەستەوەدانی وجودی ساڵێك ئەڵێن.

٣٤. تابستان: بە عالەمی تێگەیشتن و زانیاری ئەڵێن.

٣٥. بوستان: بە جێگای گەشانەوەو کشانەوە ئەڵێن.

٣٦. زستان: بە عالەمی (فیض) ئەڵێن.

٣٧. ریحان: بە نورێك ئەڵێن کە لە گەرد ماڵی دڵ و وەرزشکردنی نفس دەستکەوتبێت.

٣٨. ابر: بە پەردەیەك ئەڵێن کە ئەوپەری نەبێت.

٣٩. باران: بە هاتنەوە خوارەوەی بارانی (فیض) و میهرەبانی ئەڵێن بەسەر ساڵێکدا.

٤٠. نشوە، طرف: چاو هەڵبرینێکە کە ساڵێك تێی ئەکەوێت.

٤١. برخی: بە هێزی سلووك ئەڵێن.

٤٢. زردی: بە رەوشتی تواضع ئەڵێن.

٤٣. سفیدی: بە یەکڕەنگی ساڵێك ئەڵێن.

٤٤. هجرت: ئاوەڕدانەوەی بێ ماف و حەقی خوای تعالایە.

٤٥. غم: بایەخدانی مەبەست و خواستی مەعشوقە.

٤٦. بام: جێگای شکۆمەندی خۆنواندنە کە هەستیاری خەڵکی سادە پۆشرابێت.

٤٧. فقر: فقر: بەبێ ئیحتیاجی ئەڵێن.

٤٨. بێداری: بە دەرکەوتنی نووری (فیض) ئەڵێن.

٤٩. سعادەت: بە بانگ کردن و خوێندنی ئەزەلی و سەرمەدی ئەڵێن.

٥٠. شقاوەت: بە هەڵخزانی ئەزەلی ئەڵێن و خستنە خوارەوەی نعوذ باللە.
٥١. پاکبازی: بە رووتێکردنی پوخت و پاڵفتە ئەڵێن.

کزەڵ ١٦- ٣ - ١٩٧٨
وەرگێڕانی لە ٢٢-٤-١٩٨٥

❊ ❊ ❊

جارێکیان کۆمەڵێك مەلای ناوچەی مەریوان ئەڕۆنە خزمەت "شێخ علاءالدین" لە بیارە قانعی شاعیریشیان لەگەڵدا ئەبێت دوای یەك دوو رۆژێك مەلاکان نیازی رۆیشتنەوە ئەکەن شێیخیش بانگیان ئەکات بۆ خواحافیزی یەکە یەکە پێیان ئەڵێت: فلاَن مەلا بۆم نووسیون شەش تەنەکە برنج لەگەڵ گەنم بتانداتێ وەکیلەکانی مەریوان تا سەرە دەگاتە سەر قانع بە قانع ئەفەرموێت بۆم نووسیویت سێ تەنەکە برنج و چوار تەنەکە گەنمت بدەنێ لەوێ و دوعای خێریشت بۆ ئەکەین قانع: خێرا ئەڵێ قوربان هی منیش بکە بە شەش تەنەکە، بەلاَم لە ئێستاوە تا رۆژی قیامەت هەر دوعای شەڕم لێ بکە برنجەکەم پێ چاکترە لە دوعای خێر.

❊ ❊ ❊

کابرایەك هاتە خزمەت مەلایەکی قسە خۆش و چەند کەسێك لە خزمەتی مەلا دانیشتبوون، پرسی مەعنای چییە لە خەڵك ئەبیستم نێرەکەری عوزەێر پێغەمبەر!
مەلاش بێ سێ و دوو وتی ئەوانەی نێربازی ئەکەن هەتیو گێن لە قیامەت چەندجار هەتیوی گا بێت ئەوەندە جار ئەو کەرەی لێ ئەپەڕێنن و هەر بۆ ئەوەیان داناوە کابرایەك لە ناو دانیشتوانا بە هەردوو چەپۆك کێشای بە سەری برادەرەکەیا وتی قوڕی عالەم بەسەرت فلقە کۆن ئەتکەن بە دەربەن.

❊ ❊ ❊

کابرایەك ئەمرێت ئەیبەنە سەر قەبران کاتێك ئەیشارنەوە ئەم و ئەو بۆی بەسۆز ئەبن و داخی بۆ ئەخۆن کابرایەکی هەورامی لەوێدا ئەبێت بە دەنگێکی بەرز روو ئەکاتە گۆرستانەکە و

ئەڵێ خەڵکینە بە شاهێد بن من ئامادەم بیگۆڕمەوە ئەم ژیانە لەگەڵ مردووەکان بە شەرەفم حازرم ئیتر داکۆکی بۆ ئەکەن خۆ هەر چۆنێ بێت رزگارم ئەبێ لە خەڵك پەرستن و دوو رووی چەوت و خوارییە ئەوەی مرد مەردە.

* * *

یەکێك هەبوو لەم شارەدا زۆر ئەیقیڕاند لە خۆپیشاندانداندا کە مظاهرە ئەکرا وتاری ئەخوێندەوە، واتە عهدی گۆڕکراو، گەنجێکی قسە خۆش هەبوو ناوی ناڵێم چووە بن دەستییەوە وتی شیرە شیر مەکە بە شەرەفم پەشیمان ئەبیتەوە، کێرم بە تەلاقی ئەوەی پەشیمان ئەبێتەوە، تا سەر ئەڕوات و ڕێگا بەرنادات تۆ لات وایە ئەمەش نسکێنە هەڵقوڕاندنە یان بارخانەت خستووە لە زۆنگ و زەلکاوی بێ باریدا لە باتی روویەك بارەهەت هەیە.

* * *

لە دێیەك لە ناوچەکانی هەورامان دێی تەنگی سەر لە رۆژانی تاریکی نەزانی ئەمە رووی داوە چەند ساڵێك بەر لە ئێستا:

کابرایەك بانگەواز ئەکات لە خەڵکی و ئەڵێت ئەی ئەهلی تەنگی سەر تەنگیتان نەگنۆ کناچە و قێخوا لوان پەی بلکی فلشان کەردن قورئانیش پەی گێلوو.

ئەی ئەها تەنگی سەر تەنگیتان نەگنۆ، کناچە و قێخوا لوان پەی بلکی فلچشان کەردەن قورئانیش پەی گێلوو.

یەکێك بە دەنگێکی بەرز وەلاّم ئەداتەوە، وێم فلچم کەردەن، وێم فلچم کەردەن بانگەواز کەر بانگی ئەکاتەوە دووبارە هەیم لوا پەی بەزی بارە پەی مزگەفتی تا تەلاقەش نەگنۆ. برا خەیلێ خاسەن وەسەر چەمەکەم.

* * *

ئەمەیش رووداوێکی جەوان مەردییە کە لە بەری پشتی خۆشناوەتی رووی داوە و بەسەدان کەس ئاگاهی ئەدەن.

ناوی هەردوو دێیەکە (خ، ج) بێت چاکە مەلایەکی ناودار و شۆرە تاوی لە دێی (خ) بوو کوڕێکی هەبوو ناوی فریاد بوو هەروا پیاوێکی بەناو و شۆرەت هەبوو لە دێی (خ) کچێکی زۆر جوانی هەبوو ناوی زێبا ئەبێت تا بڵێیت کچێکی جوانی شەنگی شۆخی خاوێنی بە حەیاو

حورمەت ئەبێت لە تانە و لۆمە و تەشەر بەدوور ئەبێت، تۆزی بوهتانی ناپاکی داوێنی گەردی نەگرتووە یەشتا و دڵیشی بە تیری هیچ لاوێك نە ئەنگیوراوە، واتــە وەك میوەیــەكی بەلــەزەت تازەهاتبووە بەرو تەماعی تێ ئەكرا، ببێت بە دایك و كەیبانووی ماڵ و خێزان بەڕێوەبەری مــاڵ بەكورتی تازە پێگەیشتبوو بە كەڵكی دڵنوازی و دڵداری ئەشیا.

فریاد چەند ساڵێك بوو پێشمەرگە بوو هەر حەزی ئەكرد خزمەتی كورد و كوردستان بكــات وقۆچی قوربانی نەتەوەكەی بێت، هیچ باوكی رای لەو كارە نەبوو، بەلاّم چاریشی نەبوو هەر ئەم كوڕەو (٣) سێ كچی حورمەتداری جوانی بە تەربییەی هەبوو كە خوێنەوار و رۆشنبیری ئایینی قاڵی كردبوون (پەریزاد، دلاویز، گوڵپەری).

رۆژێك كاك فریادی پێشمەرگە پشووی داواكرد لەسەر لقەكەی كە بێتەوە بۆ لای باوكی و كەس و كاری، دیدەنییان بكات. مانگێكی ماوە وەرگرت و كەوتە رێگا بەرەو ماڵ ئەبوایە بە لای دێی (ج) بڕۆشتایە، كە گەیشتە ئاقاری دێی ماڵی باوكی (زێبا) دڵی راچەنی و زێبــا خانی لەبەردەمدا بەدیكرد و وەكو بووكێكی میهرەبان و دڵسۆزی شەرمن كە هاتبووە دەرەوە ئەگەرا بە دوای هەندێك ئاژەڵدا لــە نــاو دارســتان و باخــچەی دەوری دێــدا كــە چــاوی پــێ ئەكەوێت بە تیری ئەوینی گرفتار ئــەبێت هــەر دەســبەجێ و ماندوونــەبوون و قــسە خــواس ئەكەوێتە بەینیان.

ئیتر شەیتان سواری مێشكی ئەبێت و ئەڵێت ناوت چییە ئەڵێت ناوم زێبایــە، ئــەڵێ شــووم پێ بكەو دڵ بدە بە من بابتخوازم؟ ئەویش ئەڵێ من باوك و برام هەیە بــێ رەزامەنــدی ئــەوان ناتوانم هیچ بڕیارێكی شووكردنی خۆم بدەم.

لەناكاو پەلاماری ئەداوت و دەس بە دەمیا ئــەگرێت راپێــچی ئــەكات و بەلایەكــدا وێڵــی ئەكات بەو ئێوارە وەختەدا ئەڕۆن ماوەیەكی بــاش رێگــەیان لێ ئــەگۆڕێت و ئەیكاتــە تــۆف و بەفرو دونیا ئەبێتە تارای سپی یەكرەنگ و گیر ئەخۆن لە ناو ئەو دارستانەدا پێــی ئــەڵێ زێبــا گیان لەبن ئەم دارە دانیشە تا رێگایەك بەدی ئەكەم هەر بۆ نیو سەعات دێمــەوە لات، بــەڵكو خوا دەروومان لێ بكاتەوە.

لەولایشەوە ماڵە باوكی زێبا گشت مــاڵی دێ ئەپــشكنن و ئەپرســن و چــوار دەوری دێ ئەگەرێن هەواڵی نابێت بە تایبەتی كە دونیا بەفر گرتوویەتی رێكای بەستووە ئەمیش دێــت چاوی بە دێ ئەكەوێت ئەچێتە ماڵێك لــە دەرگــا ئــەدات، دەرگــای لێ ئەكەنــەوە دێــن بــە دەمییەوە قاچ و قولی ئەشــۆن و ئەیبووژێننــەوە خەبــەریان ئــەداتێ كــە ژنــی خۆیــشی لــە

گەڵیایەتی لە دەوری ئاوایی جێی هێشتووە، ئەوانیش لەگەڵیا ئەڕۆن بۆ ئەو ئاقارو ئاستە، واتە باوکەکەیان ئەچێت تەماشە ئەکات ئەمە زێبای کچیەتی ئەچێتە بن دەستی ئەڵێ کچم دەنگ مەکە و مەیکە بە هەرا با پێی نەزانێ ئەم گەنجە هەرزەکارە پێشمەرگەیە ئەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە کوڕە ئەبەنە ژووری میوان و جێگای تایبەتی.

کچە گەرم ئەکەنەوە هەنگوین و دۆشاوی بەدەمدا ئەکەن. باوکی پێی ئەڵێ هیچ لاقەی کردووی وتی ناوەاللە بابە هەر ئەوەندە دەستی بە دەمدا گرت و دووری خستمەوە هەر هەوڵی ئەوەی بوو رەق نەبینەوە و بگەینە ئاوەدانی و ڕێمان لێ گۆڕا وا هەر هاتینەوە ماڵی خۆمان ئێستا ئەو ئێوە ناناسێت و دێیەکەیش یاد ناکاتەوە باوکی زێبا: بانگی دایکی زێبا و منداڵ و کورەکانی ئەکات و ئامۆژگارییان ئەکات بە هیچ کلۆجێك دەری نەبڕن و وانەکەن کە ئەم کوڕە تێبگات زێبا کچی ئێمەیەو لێی بشارنەوە تا خۆم کاری خۆم دەکەم و پێی هەڵدەستم. دەور لە فریاد ئەدەن زۆر ڕێزی لێ دەگرن و خزمەتی دەکەن لە پێخەف و خزمەت و خواردن و قسەی خۆش و ڕێگەی نادەن و پێی ئەڵێن ژنەکەیشت وا لە ناو ماڵ و خێزان وەکو منالی خۆمان خزمەتی دەکەین تا دوو سێ ڕۆژێك بەو حاڵەوە دەمێنێتەوە هەر بەفرو کرێوە تا بنمیچی خانوو گوێی دەوەن دادەگرت و ڕێگای جێگاوبانی تریش ئەبەستێت.

باوکی زێبا، ئەنێرێت مەلای گوندی بانگ دەکات و لەگەڵ دوو شاهیدا.

بە فریاد ئەڵێت تۆ ئەم کچەت هەڵگرتووە با مەلا یەکجاری لێت مارە ببڕێت و ئەمن دەبم بە باوکی هەردوولاتان بەڵێ ئەنجامی ئەدەن و لەوانیش دەگەیەنێ کە نابێ ئەم حاڵە لای فریاد بدرکێنی. لە گوندا دووکانی چاکی لێ ئەبێت ئەچێت جلکی بۆ هەڵئەگرێت و ئەیکاتە بووکێکی شەرعی جوان و بۆی ئەگوێزێتەوە ناو ژوورێك لەو ژوورەکانی خۆی هەر لە حەوشەدا بەڵام خێزان و دایکی زێبا و کوڕەکانی ئەم نهێنییەی لێ ئەشارنەوە بەم جۆرە تا بەهار دادێت و دونیا ڕەش ئەبێتەوە ئەمجا بنکە و بارگە ئەبەستێت بۆ فریاد و بە ئەندازەیەك نرخینەی چاکەوە هەرسێ کوڕەکەی لەگەڵیانا ڕەوان ئەکات تا بگەنەوە ماڵی باوکی فریاد لە دێی (خ) لە ماڵی مامۆستا. جا ئەحەسێنەوە ئەم لاولای فریاد ماچ ئەکەن دوعا ئەخوازن و دەست ئەکەنە ملی زێبا، زێبا دەس ئەکات بە گریان و لە دەمی دەرئەچێت ئەڵێت دەستی دایکم و باوکم ماچ ئەکەم، پێم لێ مەبڕن مامۆستا ئەڵێت کوڕم مەسئەلە چییە؟! من حاڵی بکە با تێ بگەم. ئەویش ئەڵێت بابە ئەو ئافرەتە خێزانمە و ئەمانیش برامن سێ مانگە دڵنوازیم ئەکەن و خۆم و ژنەکەم بەخێو ئەکەن لە ماڵی خۆیاندا مامۆستا ئەڵێت ئەم ژنە کێ دای پێت، ئەڵێت هەڵم

گرت ئەمە حالو ئەمە سەربووردەی من بوو، مەلا ئەلێت باوکم ئێوە راوێستن با چاك هەزمی بکەم چۆن ئەبێ ئێوە هەروا بە خۆڕایە بڕۆنەوە کە خاوەنی ئەم چاکەیە بن؟! ئەمجا بیر ئەکاتەوە ئەلێت لە دلی خۆیدا چۆن ئەم (٣) سێ هەرزەکارانە دەستیان کردە ملی ئەم کچە و ماچیان کرد!! بۆچی ئەم ژنە ئەلێت دەستی دایکم و باوکم ماچ ئەکەم ئەمە راستی کارەکە وانییە.

ئەوان زۆر پێ داگیری ئەکەن لە گەڕانەوەی ئەڕۆن مەلا تەماشا ئەکات ژنە ئەگریت زۆر بە کوڵ ئەلێت کچم من جارێ لەم حالە ناگەم تۆ راستیم پێ بلێ. بۆچی دەستت کردە مل ئەو گەنجانە بێ پەرواو بێ هیچ شەرمێك؟

ئەمیش ئەلێ مامە گیان ئاخر برای دایك و بابیمنن فریاد لە مەسئلەکە ناگات و لێی شاردراوەتەوە مەلا خێرا ماینێکی ئەبێت زینی ئەکات و سوار ئەبێت بە دوایاندا ئەڕوات تا لە دوای یەك دوو سەعاتێك ئەیانگرێتەوە، بە زۆر و بەخواهیش ئەیانگێڕێتەوە دایان ئەنێت.

روویان تێ ئەکات وامەزانم سەربرپیوە بۆتان ئەبێ بۆم بگێڕنەوە لە نووکەوە لە راستییەوە بۆی ئەگێڕنەوە، چونکە هیچ رێگایەکی پێچ و پەنایان بۆ ناهێڵێتەوە. مامۆستا ئەلێ ئەمجا راستە فریادیش سەری سوڕ ئەمێنێت و لە جوان مەردی ئەوان قێزی لە خۆی ئەبێتەوە.

مامۆستا دێت دایکی فریاد لەگەڵ دوو پیاوی تردا ئەنێرێتە شار جلکی (٣) سێ بووکیان بۆ هەڵئەگرێت و هەر (٣) سێ کچەکەی لە هەر سێ برا مارە دەکات و ئەیکات بە زەماوەندی دێیەکە و هەر لە ماڵی خۆیدا بۆیان ئەگوێزێتەوە هیچ ماوەی ئەم لاولایان نادات و ئەنێرێت بە دوای دایك و باوکی زێبادا کە بێن بۆ زەماوەندی کوڕەکانی خۆی، مەلا دەستی کرنووشی مەردایەتی باوکی زێبا ئەگرێت و ئەلێت وا تۆم بە برای خۆم قبووڵ کردو ئەوانیش بە کوڕی خۆم و یەشتا قەرزار بارم لە پاداشتی پیاوەتی ئێوە بەخوا مرۆڤایەتی و جەوان مەردی هەروا ئەبێت. روو ئەکاتە فریاد ئەلێ کورم تۆیش چاکە لە مامتەوە فێربە خوا بە چاکی گێڕا هەڵە و سەرکێشی تۆ.

* * *

سۆفی عەولا هەبوو. ژنێکی زۆر جوانی هەبوو رۆژێ یەکێکی زۆڵ و لە خوا نەترس لە جێگایەکی تاریك ژنەکە ئەگرێت و رایئەکێشێت، ژنەکە پێی ئەلێت تۆ کێیت؟؟ ئەویش ئەلێت سۆفی عەولا ئەویش ئەلێت لە خۆ پیادان و گورج و گۆلی بێ بەلا بیت، بەلام بە زەحمەت مام عەولا بیت. دەك لەبەر حەمرت مرم سۆفی هێندە ئاودارو بێ ئۆفی.

* * *

پیرەژنێك هەبوو (١٠) مێردی کردبوو ژنان چوونە لای لێیان پرسی لەو دە مێردەی کردت کامیان باش بوو.!

ئەویش وتی: بەخوا هەر هەموویان خۆیان بۆ پێشەوە ئەکوتا ئەیان ویست نیوەی لەشیان تێ بئاخنن رووی باوکی هەموویان رەش بێت.

* * *

مامۆستایەکی قسە خۆش هەبوو لە سلێمانی لە ساڵەکانی (٥٠ — ٦٠) مەلاکان هەفتەی دووجار کۆئەبوونەوە قسەی بە توێکڵ و خواردنی خۆشیان ئەخوارد یەکێك لە خۆیان رووی کردە مەلا (ف) وتی: ئەگەر تۆ خاوەن دەسەڵات بوویتایە چیت ئەکرد؟؟ بۆ ئەم زاتانە وتی {دوو مەلا هەبوو یەکێکیان دوو ژنی هەبوو خۆی شۆخ و جوان نەبوو، ئەویتریان خۆی شەنگ و شۆخ و باڵا بەرز بوو، بەڵام ژنەکەی جوان نەبوو لە پیاوی ئەکرد }.

وتی دەستم ببوایە ئەمیانم ئەخەساند تا هەر نەوەی نەبێت چونکە ئەو کۆڵانەی پڕ کردووە لە منالّی ناشرین لە مرۆڤی نەکردووە.

ئەویشیان داری حەدم لێ دەرئەکرد، چونکە هەر نێری گاوە و ژنی نەدیووە ئەمە چەند ساڵە نێربازە.

* * *

حسێن حوسە هەبوو لە سلێمانی یەکجار جنێو فرۆش بوو زۆر و هیچیشی لە دڵدا نەبوو جارێکیان دڵم عاجز بوو لێی قسەم لەگەڵدا بڕی، ئەمەیش لە گیراوخانەدا بووین لە ساڵانی (١٩٦٣ — ١٩٦٤) لەگەڵ جەماوەری کوردی بەدبەختی بیانوو پێگیراوان بە کوردایەتی کردن زۆر هەوڵیدا ئاشت ببمەوە و ئاشت نەبوومەوە ئنجا وتم قسەیەکم بۆ بکە پێ بکەنم و دڵم چاك ئەبێتەوە وتی جارێکیان لە خەستەخانە یەخەی کچێکم گرت لە سستەرەکان ئەویش بێ شەرم و گاڵتەچی بوو وتم وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەرەوە وازت لێ ناهێنم و گشت سستەرەکان لەوێدا بوون وتم پیاو حەز بکات لە گان کێری رەق ئەبێت. ئایا ئێوە حەزی لێ بکەن چیتان لێ دێت! هەرچەندە ئەم لاولای کرد وازم لێ نەهێنا ناچار بوو وتی ئێمەش دەم و لچی رەق ئەبێت، وتم ئای کێرم بە دەمو لچەکەی وتی ئیتر هەموو بە پێکەنین وەخت بوو بمرین منیش هەر جنێوم دابوو.

* * *

جارێکیان کابرایەك هەبوو لە سلێمانی نێرباز بوو زۆریش ئەگەڕا بە دوایا برادەرو دۆستەکانی لۆمەیان ئەکرد زۆریان سەرزەنشت ئەکرد تۆ کوڕی خەڵکت حیز کردن ئەویش وتی باوکم ئێوە لە هەڵەدان من ئینسانی ئازاو بە غیرەتم هەرگیز نەگاوە هەرحیزم گاوە و پیاوی حیز و بێ جەوهەر هەر بۆ گاین چاکە.

* * *

## همه قرضیت بایست که شما أداکنید

کابرایەك هەبوو (سەعدی ئەیگێڕێتەوە — یام زانایەکی فارسەکان ) ژنێك و کوڕێك و سێ کچی ئەبێت کابرایەکی شەیتان و نالەبار دێتە داخوازی یەکێ لە کچەکانی بە ماڵ و پارە دەستی ئەبرێت و کچ ئەگوێزێتەوە پاش چەند رۆژێك کچی گەورە دێت بۆ ماڵیان ئەمیش بە ژنەکەی ئەڵێت بچۆ بۆ بازاڕ شت بکڕە رێزی خوشکت بگرین کە ئەو ئەڕوات پەلی کچە ئەگرێت و ئەیباتە ژوورەوە لە کەلکی ئەخات کە خوشکی دێتەوە لە کاری خۆی ئەبێتەوە ئەڕواتەوە بۆ ماڵەوە دەنگ ناکات پاش چەند رۆژێکی تر کچی ناوەنجیش دێتە دیدەنی خوشکی شوو کردوی ئەویش بە هەمان فێڵ و شەیتانی خراپ ئەکات تف لە حەیتە ئەکات ئەمجا کوڕەکەی دێت بۆ لای خوشکی کە تەمەنی (١٠) ساڵان ئەبێت بە فێڵێ ژنەکەی ئەنێرێت بۆ جێگایەك ئەو منداڵەیش ئەباتە ژوورەوە و خەراپی ئەکات دڵی ئەداتەوە کە گوایە عادەت وایە هەرچی بچێت بۆ لای ماڵی خوشکی ئەبێ وای لێ بکرێت ئەگەر وای لێ نەکات حەیایان ئەچێت ئەڕواتەوە ئەمجا خەسووی دێت پاش چەند هەفتەیەك بۆ لای زاوای ئەویش بە هەمان دەرد ئەگەیەنێ و لە کەلکی ئەخات ئەڕواتەوە دەست ئەکات بە بۆڵە بۆڵ خوا بیبرێت کەی ئەمە زاوایە هەمانە زۆر سەرسەرییە کوڕە منداڵەکە ئەڵێت دایە چوویت بۆ لای خوشکم بۆ تۆشی گا؟؟ هەر وتم پێت ئەڵێم جا کچەکانیش یەکە یەکە دانی پیا ئەنێن کە گایراون دوای دوو سێ رۆژێك زاوای خۆشەویست دێت بۆلای خەزووری بە خۆ بە ژنەوە خەزوری فەساڵی ترش و تووڕە ئەبێت ئەڵێت بۆ عاجزیت ئەڵێت چۆن عاجز نەبم هەمەرا گائیدە نیت بەس ماندە بەندەی مسکین ئەویش ئەڵێت.. همه قرضیت بایت کەش أداکنید .. مەبەستی ئەوە ئەبێت تۆ داوێن پیسی و قەرزاریت ئەبێ قەرزی خەڵك بیژێریتەوە وە بەبیر مەکە تۆ دایکم و من و خوشکم پێکرا هەر رۆژە نا رۆژێك دەستت ئەگرت بەسەر دەستمانە و باراشت لێ ئەکرد بە خوا هەرچی بێت بە ماڵدا بەسەلامەت ناچێتە دەرەوە ئەگەر خۆیشت بێیت هەر قەرزاریت.

* * *

جارێکیان لە شارێك لە شارەکانی رۆژئاوا شێت خانەیەك دەرگای بە رێکەوت ئەکرێتەوە شێتەکان ورووژم دێنیێ و گشتیان بەلەسە ئەبن و بە کۆمەڵ ئەکەونە ناو شار هەرچی پاسەوان و بەرپرسیارانی شێتەکان هەوڵ ئەدەن دابین نابن نایەنەوە جێگاکەی خۆیان!!

دکتۆری پزیشیك کە بەمەی زانی؟؟ خێرا دەستە جلێك لە رەنگ و شێوەی شێتەکان ئەکات بەبەرا سەرو پێتەلاکی خۆی ئەشێوێنێ سەرو قژی پرش و بلاّو ئەکاتەوە لە شێتەکان خراپ تر خۆی شێت ئەکات رائەکات ئەدات بە قیتکی خۆیدا تا ئەگاتە ناویان و بەریان ئەکەوێت کاری شێتی وا ئەکات کە شێت نەیکردبێ پیاسەیەکی چاکی ناوشاریان پێ ئەکات بەم کۆلاّن و بەو کۆلاّندا ئەیان گێڕێت تا ئەیانکاتەوە بە شێتخانەکەوە پێیان ئەڵێت دوام کەون ئێرە خۆشترین جێگایە بۆ عاقڵ و شێت!!

* * *

رەشید ئەفەندی مەهندس هەبوو شێت بوو، بەلاّم دەستی لە کەس نەئەوەشاند، لێ هەرچەند شێت بوو کەچی باری علم و زانیاری نەدۆرابوو جارێکیان لە هەولێرەوە دێتەوە بۆ کەرکوك تەماشا ئەکات پردی ئاڵتون کۆپری دروستئەکەن کرێکاری لەسەرە چادرێك هەڵ دراوە بۆ مەهندیس، واتە ئەندازیار و پێوەر (مساح) هەر ئەگاتە ئەوێ دووجار ئەم سەرو ئەو سەر ئەکات بانگ ئەکات بە تورکی و بە عربی و بە کوردی ئەیکات بە گاڵتە و جنێودان: کام گەوادی مەهندس ئەم پردەی کردووە؟! ئەمە غەڵەتە زۆری پێ ناچێت ئەروخێت دەوڵەت زەرەر ئەکات ماڵی میللەت بە هەدر بۆ خەسار ئەکەن ئەیکات بە هاوار ئەو مەهندسە گەوادەم بۆ بانگ بکەن کە دێت پێی ئەڵێت کورم کە نازانی ئیش بکەیت بۆ پاچ و خاکەناز هەڵناگریت شێتێکی وەکو من چاکترە لە عاقڵێکی وەکو تۆ کە ولاّت وێران بکات جا ئیتر بۆی راست ئەکاتەوە و کاك مەهندس دان ئەنێت بە هەڵەکەی خۆیدا زۆری مەمنون ئەبێت.

* * *

هەر هەمان شێت لە کەرکوك بوو جارێکیان مامۆستا مەلا عمری ئۆمەر گومبەدی ئیجازەی مەلایەتی ئەدا ئێمەش بانگ کرابووین لەگەڵ کۆمەڵێ مەلاو فەقێی ئەو دەورە دەس گیرابوو زەماوەند بوو، شایی و هەڵپەرکێ ئەکرا گۆرانی ئەوترا هەر کۆمەڵێك لەلایەکەوە، ئەویش دەستی گرتبوو بە پێی پەتی و سەری رووت هەڵ ئەپەری و ئەچوو بە هەوادا ئەیوت لە

زەمانی عاقڵیمدا هەڵپەرکێی وام نەکردووە و نەمدیوە ئەمە بـاری خۆیـەتی هـەموویان چـوون یەکێن هەزار عـەقڵ بە قوربانی کۆمەڵێك شێتی وابێت.

نیوەڕۆ ڕۆیشتین نان بخۆین ئەویش بە زۆر خۆی پیا کرد و هاتە ناو مەلاکان چووینە ماڵـەوە نان و چێشت ریز کرا هەر هەستاو دەستی دایە کەوچکێك و ڕۆیـشتە سـەر لەنگەرییـەك پـلاو دەستی کرد بە خواردن کە یەشتا کەس نەچووبووە سەر سفرەکە ئەیوت کاتێـك ئێمـە ئەفـسەر بووین لە تورکیا وامان نان ئەخوارد، کە دەستی ئەبزواند کەوچـکەکەی هـەڵ ئـەدا خێـرا چـی لەناودا بوایە وەکو فتبوڵ رای ئەکردە دەمیەوە بـەبێ هـیچ ئـەرکێکی دەسـتکرد. یـەکێك لـە مامۆستاکان کە بەر پرسیاری میوان بە رێکردن بوو وتی: ئەوە چوویتە کوێ رەشید ئەفنـدی؟؟ وتی: من نەچوومە هیچ کوێیەك ئەو هاتە منەوە مەبەستی پارووە برنجەکە بوو،!،.

❋ ❋ ❋

جارێك لە شەمەندەفەرێکدا دوو کوڕی گەنج سوار ئەبن یەکێکیان کورد ئەبێت و قینی لـە هاوڕێ عـەرەبەکەی ئەبێتەوە.

لە بەرانبەریاندا پیرەژنێك و کچێکی جوان سوار ئەبن و رێگـا ئـەبڕن. رێکـەوت وا ئـەبێت ئەچن بە "نفق" ێکدا (تونەیل) زۆر تاریك ئەبێت یەکتر نابینن کاتێك ملچەی ماچێك دێـت و شەقەی شەپازلەیەك کەس کەس نابینێت بزانن کێیە، پیرێژنەکە ئەڵێت من لەوەدا نەماووم ماچ بکرێم کچەکە ئەڵێت منیش بەم جوانییە سەیر لەوەیە ماچ نەکراوم، خەڵکی تـر مـاچ ئەکـەن کابرای کوردە ئەڵێت چووم دەستی خۆم ماچ ئەکەم، شەپازلەش لەم نگریسە ئەوەشێنم.
کابرای عـەرەبیش ئەڵێت: أنا مامسوی کل شی وەما أدری!!،،،

❋ ❋ ❋

کابرایەك ژنەکەی نەخۆش ئەبێت. ئەیبات بۆ لای دکتۆر، بەڵکو دەرمانێکی بۆ بنووسێ لە رێگا تووشی برادەرێکی کۆنی دونیا دیدەی ئەبێت پێی ئەڵێت بۆ کوێ ئەچن؟ ئـەویش ئـەڵێت ئـەم هـەر ئەڵێت نەخۆشم ئەیبەم بۆ لای دکتۆر. کابرای هاورێی پێی ئەڵێت بۆ کوێی ئەبەیت تێری بکـە چـاك ئەبێتەوە ئەڵێت بەخوا تێرو تەسەلە خۆ ئێمە بێ ئیدارە نین ئەڵێت بێ قەزا بیـت تێـر گـانی بکـە و تێری بگێ، ژنەکەش ئەڵێ دە ئامۆژگاری ئەو موسڵمانە بگرە گوێت، بۆ قسە ئەچێت بە گوێیدا؟!

❋ ❋ ❋

کابرایەك شێت بوو لەو دەشتی دزەییە، براکانی بەهەر فرت و فێڵێـك بـوو بردیـان بـۆ لای سید یحی گوایە شێت لای ئەو چاك ئەبێتەوە لە رێگا تووشی ئەبن پاش ماندوو نـەبوون لێیسان ئەپرسن بۆ کویێ ئەچن؟ شێتەکە خۆی بۆ وەلاّم ئەداتەوە: براکەم خوا لەمە خەرابتر نـەدات ئـەم برایانەم شێت بوون ئەیان بەم بۆ لای شێخ یحی، بەڵکو خوا رەحمیان پیێ بکات چاك ببنەوە.!!

❊ ❊ ❊

دوو کابرا دز ئەبن، لە ناوچەی خۆیان دوور ئەکەونەوە تا شتێکیان دەستگیر ئەبێت تووشـی پیاوێك ئەبن بارێکی پێیە لە پشتی گوێدرێژێکدا. ئەمانیش چاکو چۆنی لەگەڵدا ئەکەن ئەزانن رێگای دوورە ئەیگرن توند دای ئەبەستن بە پشتی گوێدرێژەکەوە و راست بە ناو دێدا ئەڕۆن بـێ هیچ سڵەمینێك، ئەمیش هاوار ئەکات خەڵکینە بمگرن بمکەنەوە، ئەمانە دزن و رزگارم کەن بۆ خاتری خوا، کەرەکە و بارەکە بە زۆر و ساختە ئەبەن، ئەوانیش لەسەر خۆیان ئەڵێن خوا ئەکات تۆ چاك ئەبیتەوە با ئێمە دز بین ئێمە کەر و باریش ئەکـەین، قوربـانی هـەر جنۆکـە و شـێتی وازبێنیێ لە تۆ. بەم جۆرە کابرایان روت کردەوە و ماڵەکەیان برد.،،،

❊ ❊ ❊

کابرایەك هەبوو ناوی حەمە دۆمە بوو، بێوەژنێك هەبوو ناوی فاتە قلێش بوو ئـەویان چەند ساڵێك بوو بێوە پیاو بوو، ئەمیشیان هەروا چەند ساڵێك بوو بێوە ژن بوو، هەر کەس لەسەر پایزە بێستانەی خۆی بە شەو و بە رۆژ ئێشکچی بوو، بۆ خۆیان رێك کەوتبوون. کە شەو دادەهات ئەچوونە لای یەکتر رایان ئەبوارد. خەلیفـەی داخلـی شـاری بغـداد ئـەکرد شەوێك ژنەکەی پێی وت خەڵکی ئەڵێن سەعە حەز لە خەجیێ ئەکات، {حەمە دۆم — فاتە قلێش} ئەویش لەسەرخۆ گوتی پێوە ئەدا، ئـەیوت خـەڵکی درۆ ئێـژن خـەڵکی ناحـەزن بوختتان ئەکەن.

❊ ❊ ❊

شاعیرێکی گەلی ئەم شیعرەی داناوە:

**سید السادات شاڵ وە سەرەوە**

**شاڵەکەی دانانیشت وە کەرەوە**

کابرایەك هەبوو بە ژنی شێخێك فێر بوو بوو لە شێخە دەست بڕەکان بوو، رۆژێك ئەڕواتەوە ئەبینیٚ کابرا لە بارێکی ناگونجاودا ئەبێت لەگەڵ ژنەکەیدا، لە خۆپیادانددا ئەبێت ئەویش پشتێنەکەی سەوز بوو دای بە سەریاندا.
وتی یا شێخ وازبێنە با دوو کوتەك بوەشێنم خۆ من تازە هەر کوێر ئەبم لە دەستم دەرچووە، خۆیشت ئەزانی.

* * *

کابرایەك ژنەکەی مردبوو دڵیان ئەدایەوە، ئەویش دەنگی نەئەکرد. پاشان وتی بڕۆن ئەم دەردە لە فلاٚنە کەس بپرسن ئەو ژن مردووە ئەو ئەزانیٚ چ دەردێکی گرانە.

* * *

وتی: ساڵێك کابرایەك مار پێوەی دابوو. ئازاری یەکجار زۆر بوو کە چاوی بە فلاٚن کەوت دەستی کرد بە گریان وتیان تا ئێستا بۆچی نەئەگریای؟ وتی ئەو مار پێوەی داوە ئەزانیٚ من چەند بە ئازارم. دەردەدار لە دەردەدار ئەزانیٚ.

* * *

گوێم گرتبوو لە وتووێژی کوردێك و عەرەبێك کە لەقرتی بە کوردەکە ئەکرد بە ئیهانەوە. کوردەکە وتی: ئایا ئەزانی ئێوە بۆچی عقاڵ و یەشیماغتان نرایە سەر لە چییەوە هاتووە. وتی لا والله.

* * *

وتی پاشایەك هەبوو زۆر زاڵم بوو، هەتیو بازیش بوو هەموو رۆژێك منداڵێکی ئەگا. هەر یەکجار ئەیگا و دووبارەی نەئەکردەوە، تا هاتە تەواو بوون رۆژێك یەکێکیان هێنا تومەز ئەمە دووەم جاریەتی وتی پادشا: خۆ تۆ جارێکیتر وات لەمن کردووە، سەر و دەورەی خۆم دیوە. شتێکم با ببێت دیاری بێت، زۆرم لیٚ نەکرێت. بۆ ئەبیٚ هەر من دووجار بەکاربهێنرێم؟!
وتی: باشە هەرچی جارێکم والێکرد با یەشماغێك بکات بە لەچك کە بوو بە دواون عگالێکیش بە سەرا بکات و تا ماوە نابێت فرێی بدات ئەمە نیشانەی پیرۆزییە..

بەلاّم کوردێکیان بۆ هێنا وتی بۆ کوێم ئەبەن؟ وتیان بۆ خزمەت پادشا و وات لێ ئەکات و عقال و یەشماغت پێشکەش ئەکات. ئەویش بێ سێ و دوو دوخێنەکەی گرێ داو بەلەسە بوو لە دەستیان و رایکردە ئەو شاخە تا ئێستا یاخییە و بەرگری لە خۆی ئەکات و عقالّ بە سەرا ناکات..

*　　*　　*

**سەگ بە ئەمەکترە تا گەورە و دەسداری سپڵە:**

پادشایەك هەبوو دوو سەگی زلی گەورەی هاوشاری راگرتبوو. بە خێوی کردبوون، چاویان سوور بوو بوو پادشا قینی لە هەر کەسێك هەلّبستایە فرێی ئەدایە بەردەمی ئەو سەگانە هەر دەست بەجێ لەت و پەتیان ئەکرد. وا راهاتبون لە خواردنی گۆشتی ئادەمیزاد وەرزێکی هەبوو زۆر دووربین و تیژ بیر بوو، لە دلّی خۆیدا وتی رۆژێك ئەبێت دەرخواردی ئەم سەگانە ئەدرێم و ئەبم بە خۆراکیان،

بیری کردەوە چۆن چاری خۆی بکات ئەو رۆژە هەستا هەموو شەو و رۆژێك گۆشت و خواردنی بۆ سەگەکان ئەبردو دەرخواردی ئەدان تا ماوەیەکی دوورو درێژ ئەمە پیشەی بوو، خۆی پێ ناساندن. رۆژێك پادشا قینی هەستا کە فەرمانی شای بەجێ نەهێناوە بە تەواوی، ئەبێ دەرخواردی سەگ بدرێت. پەلیان گرت و بە روتی فرێیان دایە بەردەم سەگە پیا خۆرەکان هەر لە دوورە تاویان لێ ئەدا پاشان سڵەمینەوە دەستیان کرد بە نووزە نووز بە دەوریا و ئەیان لێستەوە جا دەکەوتن بەلایا هیچیان نەکرد. پاش ماوەیەك پادشا پەشیمانەوە بوو زۆر دەستی ئەفسووسی بەیەکدا بۆ وەزیری زاناو تێگەیشتوو پادشایان ئاگادار کرد کە سەگەکان نەیان خواردووە فەرمانیدا دەری بێنن و بیبەن بۆ خزمەتی پادشا. پادشا لێی خۆش بوو بەخشی. داوای لێ کرد بچێتەوە سەر کارو فەرمانی پێشووی، بەلاّم داوای لێبووردنی لێکردو وتی پادشام ئەم سەگانە لە پیاوی سپڵە زۆر بە وەفا ترن. من چیم کردووە سەگ بمخوات؟ چیم بۆ خاوەن شکۆتان نەکردووە، هەرچی چاکە و باشە بێت بۆ تەخت و بەختتان رێنمونیم کردووە. بێ پاداشت خزمەتگوزاری ولاّت و هاوولاّتیم کردووە بەخوا جارێکیتر کەس یەك وشە لە من نابیستێت، ئەم جارە لە دەمی سەگ رزگارم بوو جارێکیتر رزگارم نابێت ئیتر نقەی لە خۆی بڕی. پیتی نەپێکا پڕ بە چاوی زەق ئەیڕوانی، خۆی کرد بە کەڕو لالّ پادشا وازی لێ هێنا. خۆی کردە خانەنشین پەیوەندی لەگەلّ عالەم بڕی بۆ هەتا هەتایە..

*　　*　　*

**پێکەنیم دێت بە گەوجی تۆ و بێ عەقڵی نادر شا و کەریەتی مێردەکەم:**

ئەگێرنەوە جارێکیان نادر شا ئەبیستێت پیاوێك هەیە لە ولاتێکی بێگانـەدا زۆر عاقڵـە و کارگێڕە، ئەتوانێ ئیدارەی ولات بکات زۆر بە چاکی و هاوکـاری پادشـا. بـیر ئەکاتـەوە هـەر کەسێك بنێرێت بە دوایا ناتوانێ وەکو خۆی کاری بکات بۆ ناو ولاتی فارس دێت خۆی رێـك و پێك بکات و کێشی بۆ ناو ولاتی فارس. دێت خۆی رێك و پێك ئەکات و ئـەڕوات بـە نهێنـی بچێت و بیهێنێت و فریوی بدات.

لە رێگا ماندوو ئەبێت و تینووی ئەبێت داوای ئاوی لێ ئەکات ئەمیش ئاوەکـەی ئـەداتێ زۆر بە میهرەبانی پێی ئەڵێت: گەورەم دیارە جەنابتان ماندووە بۆ کوێ تەشـریفت ئەبـەن و بـە دوای چیدا وێڵیت.؟

ئەویش ئەڵێت: نادر شا منی ناردەووە بەدوای فلانـدا کـە بیبـەم ببێتـە کـارگێڕی ولات و شالیاری لێ هاتوو بێت ژنەکەیش دەست ئەکات بە قاقای پێکەنین. ئەویش پێی ئەڵێت بە چـی پێ ئەکەنیت؟؟ ئەڵێت بە گەوجی تۆ و کەریەتی نادر شاو بێ عـەقڵی مێردەکەم.

سوارەکە ئەڵێت: بەخوا ئەبێت بۆم روون بکەیتەوە و لێرە نابزووم و نارۆم.

ژنەکە ئەڵێت: ولاتێـك وێـران بێـت پیـاوێکی عـاقڵی تیـا نـەبێت. خـەڵکی دەرەوە بێـت فەرمانداری بۆ بکات وا چاکە هەر وێران بێت، ئەگینا شا رێگـا بـدات بـە هـەزاران بلیمـەت دروست ئەبێت و دەرنەکەوێت ئێستا ترس خەڵکی کردۆتە کونەوە. کەس ناوێرێت یـەك تـەنها وشە بدۆرێنێت و بیلێت ئەمە پێی ئەڵێن پیاو قەرز کردن. دەبا ولات هەر وێران بێت و نادر شا بێت، هەر پیاوێکی لا بێت بە قوربانی کەری دۆڕاو بێت خەڵکی دەمی بەستراو بێـت وتـی: ئەی من بۆ گەوجم؟ لەبەرچی؟ وتی: چونکە تۆ پیاو خاسی هەڵبـژێراوی نـادر شـا بیـت چـاکو خەرابی نادر شا بە ئەنجام ئەگەێنیت. بگرە تاوانکردن و لادان لە یاساو خواو پێغەمبەر هەر بۆ ئەوەی پادشایەکی لێ رازی بێت ئەگەر دادگەر بیت نیوەی خەڵکیت لێ نارازییـە و کـاتێکیش شات لێ رەنجا پێستت ئەچێت بۆ دەباخ خانە وتی ئەی بەبێ عەقڵی مێردەکەت لەبەر چی! وتی ئەویش هەر چـاو ئـەگێرێت بـەم لاولادا بـە دوای ژنـدا وێڵـە لای وایـە ئـەوەی لای ئەوانـە و بەوانەوەیە لەگەڵ ئەمی لای من جیاوازی هەیە هی ئەوان خۆشترە هەنگیوناوی تێدایـە نـازانێ هەرچۆن بێت هەر ئاوی غەریزەیە ئەچکێتە ناو منداڵ دانەوە تەنها ئەوەندە هەیـە لای هەنـدێ کەس حەرام پەسەند و مەقبوولە لە حەلاڵ بێزارو سواون ئەمیش لەوان بێ عـەقڵ تـرە کـابرای سوار چاك رووی کردە ژنەکە وتی تۆم قبوولکرد بە خوشکی خۆم هەرسێکیان لە مندا هەیە بێ

عەقڵی و گەوجی کەرێتی من نادر شام یاخوا روت سپی بێت ئافرەتی مەردی سەربەرزی تێگەیشتووی حەڵاڵ دۆست.

* * *

کابرایەکی عەرەب زۆر دڵی بە کچە عەرەبێکەوە ئەبێت تا مێرد ئەکات رۆژێك چاوی لێ ئەبێت میز ئەکات کە ئەڕوات ئەمیش کێری لە جێگای میزەکە وەرئەدات ئەڵێت (مادام ماکو لحم اشرب مرگ، واتە کە گۆشت نییە مەرگە بخۆ القسمە حظ و نصیب ) خۆ تۆ شانسی ئەمەت هەیە.

* * *

کابرایەك هەبوو بۆ منالەکانی رایسپاردبوو ئەو رۆژە چێشتی نۆکیان بۆ لێبنێت باوکیان هانی کوڕەکانی ئەدا زۆر بخۆن ئەیوت چاك بخۆن کێرتان گەورە و زل ئەبێت!! دەی رۆڵە زۆر بخۆن!! دایکی منالەکان لەبەر خۆیەوە ئەیبۆڵاند و ئەیوت خۆی کوێرایی داهاتووە بزانە دوو دەنك ئەکات بە سندانی خۆی؟! دەی خوام کرد بە گژتا بۆ دەست و دەمت بەستراوە.

* * *

منداڵێك ئەبینێت باوکی بە چینچکەوە دانیشتووە کێرو گونە داهێشتووە رەش و چرچ و پیس پاڵی لێ داوە ئەپرسێ بابە بۆچی وا رەش و سیسە بە چی وای لێ هاتووە؟ ئەویش ئەڵێت رۆڵە ئەوەندە چووە بە دایکتا وای لێ هاتووە، کوڕەکەی ئەڵێت ئەی بۆچی دەم و ریش و سمێڵتی تێ ناخەیت تا رەش بێتەوە خۆ ریش و سمێڵت وەك لۆکەی سپی وایە گشت جارێك رەشی بکەرەوە.

* * *

کابرایەك هەبوو لە شاری سلێمانی هەر ئەیوت کێ هەیە لە من ئازاتر لە کەس ناترسم هەرچی شەلاتی ئەم شارە هەیە ناتوانێ من بترسێنێ ئەوانە با بۆ خۆیان هەر فشە بکەن بەخوا لە من بە توانا تر نییە. ئەم جۆرە وشانەی دووپات ئەکردەوە رۆژێك هەرزەکارێکی چەورە هاتە پشت سەرییەوە و وتی کابرا هەڵسە پێوە قنج راوەستە وتی باشە بەسەر چاو وتی هەردوو چاوت لێك بنێ. وتی زۆر باشە. وتی روو بکەرە هەتاوەکە بە زەقی پیا بڕوانە وتی بەسەر چاو.

وتی له جێگەی خۆت راوح بکە ئەگینا بکێشم بە رێسی ملتا سەرت لە ئاسمان گلۆڵـە ئـەکات وتی چاکە سەر چاوم پەلە مەکە ئەو کورسییە بگوێزەرەوە ئەو بەرو لەسەری دانیشە بەرەو پشت وتی زۆر چاکە هەرچی پێ وت کردی و بەسەر چاو ئەنجامیدا کابرای چەورە وتی باوکم بـە خـوا لە تۆ ئازاتر نییە و کەس ناتوانێ هیچ لە تۆ بکـات راسـتە هـەر تـۆ ئازایـت و گـۆی هونـەر ئەبەیتەوە هەر هی وەکو ئێوە دونیا ئەخوات و پێش ئەکەوێت.

❋ ❋ ❋

کابرایەك هەبوو ناوی حەمە زلە بوو ژنێکی هەبوو ناوی شیلان بوو، لە ناو پیاو مـاقولانی دێدا خۆی هەڵ ئەکێشا، ئەیوت عەمرتان نەمێنێ ئێوە خوێرین هەمووتان لە ژنەکانتان ئەترسن من نەبێت تەنها من لێی ناترسم. تا ئێـستا مـن و ئـەو نـاکۆکی نەکەوتۆتـە نێوانمانـەوە. ژن براکەی لەولاوە وەلاّمی دایەوە وتی راست ئەکات تا ئێستا خوشکم هەرچی پێی وتبێت هەر بە قسەی کردووە جارێك نەبووە لە قسەی ئەو دەربچێت ئیتر بۆ لێی ئەترسـێت؟! هـەر کەسـێ وا گوێ لە مست بێت چۆن لێی بخورێت وا سواری بێت ئەوە حیزی حیزان گاوی پێ ئـەلێن ئەمـە چیرۆك و بەسەرهاتی شێخ و بەگ و مەلاو ئاغایە. ئەوانەیش خەڵکی دوو روو بـن تەمـەڵ بـن بناغەی تاوانی رۆژگار و کۆمەڵ و مێژوو ئاین دۆراو ئەکەن بە پیاوی نێری خەساو.

❋ ❋ ❋

کچێکی تازە پێگەیشتوو خەو بۆ دایکی ئەگێڕێتەوە: ئەڵێت دایکە ئەم شەو لە خەوما دیتم کەوتمە ناو چاڵێك پڕ بوو لە کێری قیت و رەق ئەویش کچم خێرە انشاالله، بەلاّم بەلای حوجرەی مەدرەسە و فەقێکاندا هەرگیز نەڕۆیت عەقڵم ئەو تەعبیرە ئەگرێت ئەوێ جێی مەزەنەیە.

❋ ❋ ❋

لە ئەفسانەی چینێکاندا هەیە کە یەزدان یەکەم مرۆڤ (ئادەم) دروستئەکات زۆر شـتی پـێ ئەسپێرێ بیکات و نەیکات، بەلاّم زۆر لاسار ئەبێت بە گـوێ ناکـات خواوەنـد بێـزار و تـوورە ئەکات زۆر جەزرەبەی ئەدات هەرچەند ئامۆژگاری ئەکات پەندگیر نابێت جارێکیـان خـەوێکی خەست و گران ئەکرێت کاتێك بەخەبەر دێت تەماشا ئـەکات ژنێکـی جـوان و شـۆخ بەلایـەوە دانیشتووە سرنجی کێش ئەکات سەری سوڕ ئەمێنێت لێی؟! روو ئەکاتە خـواو ئـەڵێت یـارەبی ئەمە چییە پاڵی پێوە داوم کەچی دەسـتم لێـی بـەرنابێت گـیرەوەی داوی مـەکری بـووم خـوا

ئەفەرمویّت ئەوە پێی ئەڵێن ژن بۆیە بۆتم دروستکردووە حەقی منت لیّ بکاتەوە تا ڕۆژی قیامەت جەزرەبەت بدات و لە چنگی ڕزگار نەبیت بە دەستییەوە خۆت و ئەولادت گرفتار بن منتان لە بیر بەرێتەوە. و دەست وەردات لە هەموو هەست و نەستێکتەوە چاکە و پیرۆزیت لیّ بکات بە خراپە و دڵ تەنگی ئاهەنگ و خۆشی بە ئازار و پەشێوی ئەوە دەردت بێت.

* * *

ئەگێڕنەوە کابرایەك هەبوو علمی کیمیای کۆنی زانیوە، واتە إکسیری وەرگێڕان و کردنی کانەکان بە ئاڵتوون ئەم زانیارییە زۆر کەسی گێژو گێل کردووە، و لەم ڕێگایەدا و زۆر کەس بە نائومێدی سەری ناوەتەوە. هەرگیز بە ئاوات نەگەیشتووە مەگەر جابری کوڕی حەیان: و هۆزو نەوەی بەرمەکییەکان. و خالدی کوڕی معاویە و ژمارەیەکی کەم نەبێت...

* * *

جارێك کابرایەك ئەڕواتە لای یەکێك لەوانەی ئەو عیلمەیان چاك زانیوە، یەخەگیری ئەبێت و و ڕەسمی ئەکات فێری بکات ئەزانیّ وازی لیّ ناهێنیّ دێت دوعایەکی فێر ئەکات کە مەرجە لە کاتی خوێندنیا و لە کاتی دروستکردنی ئاڵتونیشدا نابێت بە هیچ جۆر ورچی سپی و گورگی زۆر ڕەش بە یادیا گوزەر بکات، ئەگینا ڕەنجەکەی پووچەڵ ئەبێتەوە بەو جۆرە کابرا لە کۆڵ خۆی ئەکاتەوە، چونکە لەلا شعوردا چەسپاو دەرناچێت. ؟!

* * *

مەلا محەمەدی دەم لار هەبوو خەڵکی لای پێنجوێن بوو، یەزدان هیچ جوانییەکی پیّ نەبەخشیبوو. بەلاّم قسە ڕێك و دروست بوو هەر خالق ئەزانیّ چۆنی دروستکردبوو ڕۆژێك لە شاری سلێمانیدا بە بازاڕدا ئەڕواتە خوارەوە {ئەو کاتە خەڵکی سلێمانی پیاوی بیچم سەیرو قسە خۆشی زۆر تیا بوو کار و کاسبیان هەر فشقیات و پێکەنین بوو } کابرایەك لەوانە خێرا ڕائەکات بە دوایا پەلامار ئەدات خێرا دەستی چەند جارێك ماچ ئەکات مەلا محەمەدیش ئەڵێت: ببوورە لێم ناتناسمەوە جەنابت کێی؟! ئەویش ئەڵێت قوربان تۆ عەفووم بکە منیش یەکەم جارە بە خزمەتت ئەگەم. بەلاّم ئێمە لە مەلا ئایینییەکان ئەبیستین کە باری تەعالا لە کەس ناکات و کەسیش لەو ناچێت، و جەنابیشتان لەم شارەدا لەکەس ناکان و کەسیش نییە لە ئێوە بچێت. کەوابوو ئەوی جەنابتان باری تعالا بێت بچووکی خۆم پێشکەش ئەکەم ئەویش ئەڵێت أستغفرالله

من نیم: کابرا تۆ چیت لێم پەیدا بوویت؟! ئەویش ئەڵێت: ترحیۆ کەوابوو ئێوە ئەبێ شەیتان بن بەم نارێك و ناشرینییە!! دە پێم بڵێن گۆیەند و گەرداوی چیت بە دەستەوەیە؟ کام نەگبەتیت بۆ ئەم شارە هانیوە....؟ خوا بمان پارێزێت لە ئاژاوەی بێچووە زۆڵەکانی دەستی ئێوە قوربان ئەگەر بڕوایش ناکەن فەرموون ئەمە ئاوێنەو خۆتان ببینن، ئەوسا چاوێکی خێرتان لە ئێمەش بێت. ئیتر هاورێکانی دایان لە قاقای پێکەنین و چەپڵە مەلا محەمەدیش: بە جنێودان چاکی لێ هەڵکردو ڕۆیشت و مەلاکان ئێستاش هەر پێی ئەڵێن باری تعالی.

❊ ❊ ❊

هەر کەسێك لە دێدا ژیا بێت ئەزانێت و ئەبینێت کە کەر بزەڕێت سەگ ئەوەڕێت، دەس ئەکات بە لوورە لوور تا کەرەکە لە زەڕین ئەکەوێت ئەم پرسیارەیان لە مەلا کرد: بۆچی کەر بزەڕێت سەگ ئەوەڕێت. ئەلورێنێت؟!

وتی لە کتێبی پێشینەدا دیومە کەر کە ئەزەڕێت ئەڵێت منەتی خاوەنم بە کێرم. ئەم حەیتە زورنایەی بۆ ئەنێرم، بە ماکەری دونیا فێرم کە سەگیش گوێی بەم دەنگە ناخۆشەیە ئەبێت دەنگ و واتاکەی لە ناخی کار ئەکات. سەری پێی دێشێت. بۆ ئەوەی گوێی لە وشەو رستەی ناشرین نەبێت پڕ بە دەم ئەلورێنێ و هاوار ئەکات دەك لەحنەتی خوا لەوە بێت سپڵە و نمەك بە حەرامە، چاکەی چاکەکەرانی لەبەر چاو نییە یاخوا هەر بەشت باری قورس و گران بێت خوا نەمکەی بە هاودەمی شتی بێ وەفا ژنی بێ حەیا، ئاغای بێ بەقا هەژاری تەوەزەل، حاکمی بەد کردار و عمل.

❊ ❊ ❊

عەرەبێك ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەکات کە ئەم جۆرە ژنە هەرگیز مارە نەکات و نەیهێنێ:

المتأففة، والمتمرضة، والتشكية، والمتسلطة والمتعتة، والمتحدثة، بكل ما ترى وتسمع،

واتە ئەو ژنەی هەمیشە ئاخ و ئۆف بکات، و ئەو ژنەی کە بە درۆ خۆی نەخۆش نیشان بدات و بناڵێنێ، و ئەو ژنەی هەر هەمیشە ببۆڵێنێ و گازندە دەربڕێت، و ئەو ژنەی زوبان درێژ بێت و خۆی بە درۆ بە شت بزانێ، نرخ بۆ مێردەکەی دانەنێت. ئەو ژنەی گوێ هەڵخات و قسە بژنەوێ و بیدزێت، و هەرچی ببینێ و بیبستێ بیگێڕێتەوە، منیش ئەڵێم: الغير المهتمة ببيتها: واتە گوێ بە ماڵ و ڕێکوپێکی خێزان نەدات، جل شڕ و ریپاڵ بێت.

❊ ❊ ❊

کابرایەك هەبوو لە هەڵەبجە ناوی شێخ جەعفەر بوو سێ بە سێ تەلاّقی پیائەکێشاو ئەیوت جنۆکە هەر نییە، بەلاّم من لە ترسا وەختە گیانم دەرچێت ئەوەندەی لێ ئەترسم. بۆ هەر کوێ ئەچم وا ئەزانم لەگەڵمایە.

* * *

لە شارەزووردا کابرایەك ئەگەڕاو هەر هەواڵی ئەپرسی لە شێخ و بەم جۆرە، کابرایەکی دیت وتی:
شێخەکەی سووری سووری سەری، چیخ شڕ دیانی مسی قوپیاو دەم، گاتاسیاو چاو، مووی بەرگونم ریش نەت دیگە؟؟؟

* * *

**ئۆخەی ئۆخەی بەرەکەم، خەمخۆری خۆم و کەرەکەم.. لە فائق قسە خۆشم بیستووە!!**

کابرایەك ژنێکی ئەبێت. بەسەر مێردەکەیەوە دۆست ئەگرێت و بە خۆی فێر ئەکات و تەنها کەرێکیان ئەبێت و خەڵکی ئاژەڵ و مالاّتی ئەبێت، دەمە و بەهاران خەڵکی مەڕ شەواژۆ ئەکەن. ژنەکەی پێی وت: پیاوەکە بۆچی کەرەکە نابەیت بۆ شەواژۆ؟! خۆ ئێمە هەر ئەم کەرە شك ئەبەین با لە دەستمان نەبێتەوە هەتا دێت هەر لەر ئەبێت ئەویش ئەڵێت ژنەکە کێ کەری شەواژۆ کردووە تا من بیکەم؟! وتی تۆ چاو لە خەڵك بۆ ئەکەی شەوی دوو سەعات بیبە دەرەوە با بۆ خۆی بلەوەڕێت زۆری لەگەڵ ئەڵێت تا قایلی ئەکات لەولایشەوە بەڵێن و گفتی بە دۆستەکەی دابوو بێتە پالّی. کابرا پاش نوێژی عیشا کەرەکەی برد بۆ دەرەوە بۆ لەوەڕاندن ماوەیەکی باش ئەمێنێتەوە تا ئەگاتە ماڵەوە تەواو تەڕ ئەبێت و سەرما ئەی قەسرێنی، لەملایشەوە کابرای دۆستی ژنە خێرا دێت خلیفە داخلی بغداد ئەکات و ئەڕوات کاری ئەنجام ئەدات ژنەکەیش طهارەت ناکات و خۆی وشك ناکاتەوە کە دێتەوە خۆی گەرم ئەکاتەوە ژنەکەی بە دەوریا دێت گوایە زۆر خۆشی ئەوێت دڵسۆزییە ئەمیش کە گەرم ئەبێتەوە مرخی ئەبزوێت و ژنە رائەکێشێنێ و پیا ئەکێشێت ئەبینێت ناو گەڵی تەرە،پێی ئەڵێت بۆچی وا تەڕ ئەبێت؟؟ ئەڵێت هەر لەبەر خەمی تۆو کەرەکەیە ئەگرییێت و فەرمێسك ئەرێژێت لەبەر ئێوە گریاوە سەر و چاوی تەڕ بووە وشك نابێتەوە، ئەویش دەستی بەسەر سەریا ئەهێناو ئەیوت:

ئۆخەی ئۆخەی بەرەکەم خەخۆری خۆم و کەرەکەم
ئۆخەی ئۆخەی بەرەکەم خەخۆری خۆم و کەرەکەم

* * *

کابرایەکی شاگرد قەساب بانگی ئەکرد: های گۆشتی نێون.. های گۆشتی نێون هەر کەس بیکرێت و بە کولاوی بیخوات: شەوی پێنج و رۆژی چوار ئەیخاتە کار مرخی ئەبزوێنێ قەت ژن دڵی ناشکێنێ. شاگرد قەساب بە کۆلان ئەگەڕا و ئەو بانگ و هاوارەی دووپات ئەکردەوە بێوەژنێك تەلار و قەسرێکی ئەبێت و گوێی لە شاگرد قەساب ئەبێت.

ئەمیش بانگی ئەکات ئاوەرە شاگرد قەساب گۆشت فرۆش. ئەوە مانای چییە بە رۆژ پێنج و بە شەو شەش؟؟

ئەویش ئەڵێت خانم هەر کەسێك لەم گۆشتە بخوات و بیکرێت هەمیشە بەهێز ئەبێت بە شەو شەش و بە رۆژ پێنج جار ئەپەرێت بێوەژنەکە پێی ئەڵێت دەیسا وابێت وەرە پێشەوە من شووت پێ ئەکەم لەسەر ئەو مەرج و قەرارە بەڵێ مارەی ئەکات و ئەبێت بە حەلاڵی.

جا یەکدوو مانگ لەسەر قەرارەکە پێنج و شەش بە رۆژ و ئەو ئەبات بەڕێوە، بەلاَم باریکە بنێی ئەیگرێت هەر ئەوەندە ئەتوانێت دار دارە بکات و بڕوات بەڕێوە هێزی تیا نامێنێت ملی لەسەر موویەك بەند ئەبێت.

رۆژێك تووشی پیرەژنێك ئەبێت ناسراو مەعمیلی ئەبێت لێی ئەپرسێت رۆڵە بۆچی وا هێزت لێ بڕاوە. چییە نەخۆشیت؟؟ ئەمیش ئەڵێ لێم مەپرسە هیچ چارم نییە و ماکریم! پشت هەڵ ئەکات بڕوات پیرەژن ئەڵێ تۆ مەڕۆ کورم دەرمانت لای منە و هەر من ئەتوانم چارەت بکەم قسەم بۆ بکە ئاخری وازی لێ ناهێنێت دووچاری ئەکات بۆی بگێڕێتەوە:

ئەڵێ گۆشتی نێوەنم ئەفرۆشت و ئەم وت هەر کەسێك بیکرێت بە شەو شەش و بە رۆژ پێنج جار ئەپەرێت تا رۆژێك تووشی ئەم بێوەژنە ئەبێت و مارەی ئەکات و ئەچێتە چاڵی ئەو قەول و قەرارە بە پێنج و بە شەش هێزی لێ بڕیووم. تەنگی پێ هەڵ چنیوم پیرەژن ئەڵێت ئەمە چاری هەر لای من هەیە خوا بیکات رزگارت دەکەم تۆ من بکە بە دایکی و میزەڵدانێکی چقچەقەم بۆ پەیدا بکە لەگەڵ گۆچانێکدا ئەویشی بۆ هاورد. وتی:

لای ژنەکەت بڵێ دایکێکی پیرم هەیە ئەبێ بیهێنمە لای خۆم و بە خێوی بکەم، ئیتر حەقت نەبێت. ئەمیش ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە لای ژنەکەی ئەیدرکێنێ ئەڵێت جا بۆچی نایهێنی منیش حەز ئەکەم خزمەتی ئەکەم و دڵنوایی ئەکەم.

بەیانی دەستی ئەگرێت و ئەیهێنێتەوە بۆماڵەوە دەست بە گۆچان و پشتی کۆمەوە هەر بە حاڵ ئەتوانێت هەنگاو هەڵبێنێ. ژنەکەیشی چاوی پێ ئەکەوێت خێرا ئەچێت دەستی ئەگرێت و ئەچێتە ژێر باڵی. ئەمیش بە نهێنی چەقچەقە میزڵدانەکەی لە ژێر ڕانی توند قایم کردەوە لە هەنگاوی یەکەم دەنگێکی لێوە دێت هەر لە تڕ ئەچێت وا قورسی ئەخاتە سەر ژنەکە ددان بە خۆیدا ئەگرێت پێ ناکەنێت بۆ جاری دووهەم و سێهەم لە وزەیدا نامێنێت دەست ئەکات بە پێکەنین، ئیتر هەر لەوێدا خۆی تووڕە ئەکات و ئەڵێت:

هەتیوە سەگەی سەگباب نەم وت من نایەم بۆ لای ژنەکەت، گوڕ گۆڕەکەی باوکت پێم ئەگوت وامەکە، کەچی وای لێکردم بە ڕۆژ پێنج و بە شەو شەش وازی لێ نەهێنام تا هەردوو کونی پاش و پێشی کردم — بە یەك تا بۆم ناگیرێتەوە. دەی بمگێڕە وە لای ئەم ژنە نابم و ئیدارە ناکەم، سبەی دووەی دەوهۆڵم بۆ لێ ئەدات نازانی خۆیشی وەکو منی لێ دێت.

بە ڕۆژ پێنج و بە شەو بیکە بە شەش. تا سەری ئەمیش ئەگریت لە هەش. ئیتر ئەگەڕێتەوە جا کە کوڕەکە بۆ شەو ئەچوو بەلایە نەی ئەهێشت ئەیوت هەفتەی جارێك زیاتر نابێت باوکت دایکتی والێکرد و تۆیش ئەتەوێت وا لە من بکەیت!!

ئا بەو جۆرە رزگاری کرد لە ئالۆش و خرۆشی ژنی تەڕپۆش.

❊ ❊ ❊

## غەریزە:

هیچ ڕێگایەك نییە کە ئینکاری بوونی بکرێن، چونکە ئەمە نوورێکە نەفش ئەخاتە گەشە و ڕووناکی بنکە و بنچینەی گەشەکردنی لە تەمەنی وێڵ و نەفامییەوە دەست پێ ئەکات، هەر ئاوا لە پەرەسەندندایە تا ئەگاتە چل ساڵی. بە چاوی خۆمان خەڵکی ئەبینین کە جیاوازیان لەوەدا هەیە. لە تێگەیشتنی زانیاریاندا زیرەك و کوز دوبن هۆشیاری و بێ هۆشی فەرمایشێك لە حەزرەتەوە ئەگێڕێتەوە بە دوور و درێژی کە فەرموویە خوا عەقڵی دروستکردووە بە چەند جۆرێکی زۆر بە قەد گڵ و لم. هەیە دەنکێکی پێدراوە هەیە دوو دەنك یا سێ یا چوار یا زۆر بەمەن و بە خەروار.

❊ ❊ ❊

## چیرۆکێکی سەیر:

ئەگێڕنەوە پزیشکێك ئەچێتە سەر نەخۆشێك و چلّ و پلّدانی دەستی ئـەپێوێت و ئـەیگرێت پێی ئەلّێت: رەنگە میوەت وەرگرتبێت؟؟

ئەلّێت بەلّیّ وایە پێی ئەلّێتەوە ئیتر مەیخۆ بۆ تۆ خراپە. رۆژی دوایی ئەچێتەوە لای لێدانی دەستی ئەگرێت ئەلّێت رِەنگە گۆشتتی فرووج خواردبێت, نەحۆشەکە ئـەلّێت بـەلّیّ وایـە پێـی ئەلّێتەوە ئیتر مەیخۆ بۆ تـۆ خەراپـە، خـەلّکی سـەری سـورِ ئـەمێنێت لـە زانـایی و زیرەکـی پزیشکەکە، بەلاّم پزیشکەکە کورێکی ئەبێت ئەلّێت بابە چۆنت زانی؟؟ میوە و گۆشتی فرووجی خواردووە ئەلّێت رۆڵە هەر بە پزیشکی رووت نەم زانیوە، بەلّکو بە فەراسـەتیش وتـی چـۆن؟؟ وتی کە چوومە مالّی نەحۆشەکە بینیم چلّ و چێوە و پەلکی میـوە کـەوتبوو لەبسـەر بانیـان و سەروچاوی نەخۆشەکەیش ئاوسا بوو، پف هەلّدرابوو وە لێدانی دەماری دەستی نەرم بوو. زانیم کە میوە بکەوێتە بەردەستی خۆی بۆ ناگیرێت وا زانیم میوەی وەرگرتووە بـەوە کـاتیّ دانم پیـا نەنا وتم رەنگە میوەت وەرگرتبیّ و رۆژی دوایی دیتم پەرِی مریشك و فروجم دی لە بەرمالّیاندا کەوتبوو و لێدانی دەستی پرِ بە پرِی پلّی ئەدا زانیم کە هەر نەخۆش فروج ئـەخوات. بۆیـە وتم رەدگە فروجت خواردبێت.

کورِەکە گویّ لە باوکی گرت. حەزی کرد رێگای باوکی بگرێت. رۆیشتە سەر نەخۆشـێك لێـدانی دەماری دەستی گرت وتی رەنگە گۆشتی کەرت خواردبێت؟ حاشـا چـۆن گۆشـتی کـەر ئـەخورێت. بەچکە پزیشك خەجالّەت بوو هاتەوە لای باوکی، باوکی بانگ کرد و لێی پرسی چۆن وات زانـی کـە گۆشتی کەری خواردووە؟! چونکە لە مالّیانا دیتم بەرجل و قەرسەقولّم دیت زانیم کە ئەمانە هەر هی گوێدرێژە لە پاشدا وتم ئەگەر کەرەکە زیندوو بوایە پێوەی ئەبوو کە زیندوو نەبیّ دیارە سەریان برِیوە و خواردوویانە باوکی وتی: ئەگەر یەکێك لـەم پیـشەکی و شـتانە راسـت بوایـە هیـوای نەجابـەتم لیّ ئەکردیت؟! بەلاّم گشتی هەر قۆر و بیّ کەلّکە، چاوەرێکردنی نەجابەت لە تۆ شتێکی مەحالّە.

* * *

ئەگێرنەوە ئەبووحەنیفە رەحمەتی خـوای لیّ بێـت یـەکێك ئەچـێتە لای لـە کـاتی وانـە وتنەوەدا ئـەبێت شێوە و هەیئەتێکی ویقاری ئەبێت بە هاورێکانی ئەفـەرموێت ئاگاتـان لـە خۆتان بێت ئەم کابرایە شتتان لیّ نەدزێت و نەیبات. کە دائەنیشێت شێخ باسی وەختـەکانی نوێژ ئەفەرموێت بـەیانی کـاتیّ لـە تلوعی فـەجری دووەمـەوە دەس پـیّ ئـەکات بـەر لـە

خۆرهەلاتن کە هەتاو هەلهات وەختی نوێژ نامێنێت کابرا ئەلێت ئەی ئەگەر خـۆر هـەلهات بەر لە فەجر ئەو کاتە حوکمی چۆنە و چۆن ئەبێت. شێخ لا ئەکاتەوە ئەفەرموێت وەکو خۆتان بن کارەکە لەوە بەدەرە کە چاوەڕێمان ئەکرد.

شتێکی سەیرە: مرۆڤی بەلەکی دار بەپێی روت بڕوات بە زەویـدا هـیچ لـە جێگـەی پێـی ناروێت ئینسان بخەسێنرێت بەدەنی لاواز ئەبێت. پێچەوانەی زۆر لـە گیانلەبـەرانی تـر و بـۆنی بۆگەن ئەبێت و رای ئەگۆڕێت و زۆر حەز لە خواردن ئەکات. ئێسقانی درێژ ئـەبێت پەنجـەکانی خوار ئەبێت، حەزی پەڕینی زۆر ئەبێت زۆر شەیتانی "أحلام" ئەبێت تەمەنی درێژ ئەبێت قژ و مووی کەم ئەکات. دەنگی تیژ و نەرم ئەبێ وەکـو ژن. سـەیر لەوەدایـە خەسـێنراو زۆر تـووڕە ئەبێت، زوویش ئاشت ئەبێتەوە و ناتوانێ نهێنی بشارێتەوە. سڕ ناپارێزێـت و حـەز لـە یـاری شترنج ئەکات.

لەوانەیە کوێر زۆر حەز لە پەڕین ئەکات، بەلاّم خەسیو چاوی بەهێز و تیژ و چاکە. ئـەم دوانە هەر کامیان زیاد بکات ئەویتریان کەم ئەکات کوێر فەهم و حفظ و نیکـاحی زۆر. لـە گان تێر نابێ.

* * *

**باسێکی نەفس:**

نەفس کاریگەرییەکی سەیری هەیە مرۆڤی زانا واتـێ ئەگـەن بـە پێـی جەوهـەری نـەفس جیاوازی هەیە. لەوانە:

نەفسی بالاّی بەرزی نوورانی و پاکی هەست بە عالەمی ئەرواح ئەکات، وکەلّك و فـەیـض وەرئەگرێت لە عالەمی ئەرواح و زۆر شتی سەرسوڕهێنەر و هەیە نەفسێکی چڕی لێلّە عاشق و گرفتاری تەن و جیسمە، بەشی عالەمی ئەرواح براوە هیچی تێ ناگا و پێی ناگات.

هەندێك لە حوکە ماء بۆ ئەوە ئەچن و ئەلێن: نفووسـی گۆینـدە و بێـژەر واتایـەکی زۆری هەیە، هەندێ جۆری تێدایە. هەر جۆرێك سەر بە خۆیەکی تایبەتە وەکو رۆلّەی رۆحێك بێت لە رۆحێکی ئاسمانی ئەم یان ناوی لێ ئەنرێت: خاوەنی تەلسمات و زانا بە سروشتی تەواو و واتـێ ئەگەن ئەمانە ئەتوانن ئەو نەفسانە چاك و رێك بکەن. جارێك بەخەو پێ بینینی جارێکیش بـە سروشی و إلهام، و هەندێك جار بە چرکە و تەزووی ترس و بیم. لەو نەفسە پیرۆز و پاکانە رۆحی پێغەمبەرەکانە "د.خ" چونکە کە یەزدان ویستی بییان کات بە پێشەوای ئادەمیزادو خـەلکی

جۆرەها پیرۆزی و رابەری و پێشەوایی پێبەخشین و لە ناخی رەوشتیاندا بنج بەست و جێگیری کرد و هەرچی رەوشتی ناشرین و چەپەڵ هەبوو پاکی کردەوە لەوان، تا ببنە نموونە و پێشەوا بۆ خەڵکیتر و تا چاویان لێ بکرێت و دەسەلاّت و شتی سەیری بۆ وەپێ ئەنوانـدن تـا خـەڵکی سەریان بۆ شۆر بکات. کڕنووشیان بۆ بەرێت.

لەو رۆحانە دیسان رۆحی ئەولیانە، چونکە لە رۆحی پێغەمبەرەکانـە بـەهرەوە بـوون دوای ئەوان کەوتوون لەوان ئەچن و شت و کاریگەری سەیر ئەنوێنێ و ئەیکەن وەکـو ئەوانـەی پلـەو پایە دارانی دونیا نەویستەکان و بەندە زاناکان و خۆشەویستانی خوا کەشیفای نەخۆش ئـەدەن، کە داوا بکەن وە بە داوای ئەوان زەوی دیکەکار پاراو ئەبێت و ئاو ئەدرێت و ئازارو درم و ستەم بە دوعای ئەوان هەڵ ئەگیرێت و لا ئەچێت و باڵندە و جڕو جانەوەر دێنە سـەر بـاری خۆشـی و هێمنی و ملکەچی و چاکی. زۆر شتی تری ئا لەم جۆرە ئەخەنە بەهرەوەری و هەندێك نـەفس و گیان لەبەر هەیە ئەبنە خاوەنی فیراسەت و عەقڵ و پێشبینی، ئەوانەن بە بـارو دۆخـی دیـاری ئەکەنە بەڵگەی شتی نهێنی و شاراوە، واتە بەڵگە خوازێکی راست و دروستە بۆیە خوای مەزن: ئەفەرمووێت: " أنا في ذلك لآيات للمتوسمين" واتە ئەمەیە بەراسـتی نیـشانەی زانـاو سیمای مرۆڤی تێگەیشتوو. پێغەمبەر"د.خ" فەرموویەتی "اتقوا فراسة المؤمن فأنـه ينظـر بنـور الله تعالى" واتە خۆتان لە هەستیاری زەکای مرۆڤی ئیمانـدار بپـارێزن، چـونکە بـە نـووری شـت ئەبینن ئەگێڕێتەوە ئەبو سعیدی خەراز ئەڵێت لە کەعبەی ماڵی خوا هەژارێکم بەرچاو کـەوت هەر هیچ سیپاڵی بەبەرەوە نەبوو ئەوەندە نەبێ کە عەورەتی داپۆشیپوو ئەڵێت منیش چارەم لێ گرژ کرد نەفسم قێزی لێ هاتەوە هەستی پێکردو تێگەیشت وتی:"واعلموا ان الله يعلـم مـا فی انفسكم فـاحرزوه " واتە: بزانن کە یەزدان ئەزانێت هەرچی لە نەفستاندا هەیە خۆتـان بپـارێزن نەکەونە هەڵەوە. ئەڵێت پەشیمانەوە بووم لە نەفسی خۆمدا إستغفارم کـرد وتـی " وهـو الـذی يقبل التوبة عن عباده ويعفو عن السيئات" واتە هەر ئەو تەوبە لە بەندەی خۆی قبووڵ ئەکات و لە تاوان و نامە گوزووری خۆش ئەبێت، ئەگێڕنەوە ئیمامی شافعی و محەمەدی کـوڕی حـسن رحمەتی خوایان لێ بێت " پیاوێکیان بۆ لاهات یەکێکیان وتی ئەوە دارتاشـە، ئـەویتریان وتـی "نەء " ئاسنگەر بووم ئێستا دارتاشم.

هەروا کەسانی تر هەن پێیان ئەڵێن قیافـەدار پـسپۆر. ئـەمیش لەسـەر دوو بەشـە هەیـە پسپۆرە لە پێ هەڵگرتندا جێگە پێ هەڵ ئـەگرێت و هەیـشانە مـرۆڤ و ئـادەمیزاد ئەناسـنەوە ئەیگەیێننەوە سەر رچەڵکی راستەقینەی خۆی، بەڵگەو دیمەن و شـێوەی ئەندامـەکانی لەشـی

ئەمەیش هەر تەنها هۆزێك هەیە تایبەتین و ئەتوانن بیکەن "بەنی مدلج "کە تیرەیەکە لە عەرەب و پێی ئەزانن و دە هەندەی خوایە منداڵێکی ساوا هەڵ ئەگرێت و لە ناو بیست ژندا ئەیداتە دەستی دایکی راستی خۆی، و هەڵەیش ناکات.

* * *

ئەگێرنەوە لە بازرگانێکی دەوڵەمەند کە گوایە عەبدێکی بە کەلەپوورو میرات بۆ ئەمێنێتەوە و پیرەمێردێکی رەش ئەبێت کابرا ئەڵێت:

جارێك لە سەفەرێکمدا ئەرۆیشتم و سواری وشترێك بوو بووم و عەبدەکەم سەرو جلەوەی رائەکێشا، لە ناکاو پیاوێکی عەرەب لە هۆز و تیرەی بەنی مدلج بەلاماندا رابورد تێمان راما بە چاکی جا وتی: ئەم سوارە کە زۆر لە جلەو کێشەکە ئەچێ هەر لەوە ئەڵێت دای لە دڵم ئەم وشەیە و کاری تێکردم تا گەڕامەوە بۆ ماڵەوە چوومە لای دایکم پێم وتوو هەڵم پێچا تا دانی پیانا وتی کابرای بەنی مدلجی راست ئەکات، چونکە مێردەکەم پیاوێکی پیر بوو ماڵ و حاڵێکی چاکی هەبوو منداڵی نێرینەی نەبوو ترسام ئەم ماڵ و حاڵەم لە دەس بچێت و خەڵکی بیبات دوای مردنم. ئەم کابرا عبدە رەشەم سواری خۆم کرد. باری دوو گیانیم بە تۆ بوو ئەگەر بمزانیایە لە قیامەت ئەشارێتەوە بۆم لە دونیا پێم نەئەوتی ئەویتریان جێ هەڵگری ئاسەواری پەنجەو شەقڵی دەست و پێیە ناسینەوەی سمۆچك و قەوارەیەتی، ئەم بەڵگەو پێ زانینە لە زۆر ولاتدا هەیە بە تایبەتی هۆزێك لە مغریبدا هەیە جێگایان خۆڵ و لمە دزێك بچێتە ناویان یا یەکێك لایان هەڵبێت بە پسپۆرانە شوێنەواری پێیەکە هەڵ ئەگرن تا ئەیدۆزنەوە ئەوە سەیرە جێگەی پێی گەنج و هەرزەکار لەپیر جیا ئەکەنەوە و پیاو لە ژن، و ئاوارەو غەریب لە نیشتیمانی.

لە دوای ئەمانە نفووسی کاهینەکان دێتە کایە ئەمانە زانست و شت لە ئەرواحی نزم و پەست وەرئەگرن و بارودۆخی بوونەوەر ئەخەملێنن، و رووداوەکان دەستنیشان ئەکەن گوایە خەو ئەبینن و پەری جنۆکە مامۆستاییان ئەکەن، لەم بارەوە بەسەر هات زۆر هەیە ناخی راستیان پێکاوە زۆر جار هەڵەیان نەکردووە، وەکو چیرۆکی "سطیح وشق" لەگەڵ ربیعە بن مضری لە خمی.

* * *

ئەگێرنەوە چیرۆکی ئەسکەندەری جیهانگیر ولاتێکی گرت، رۆیشتە ناو هەیکەلەکەیان ژنێکی تیا دیت جل و بەرگی ئەتەنی و ئەیچنی و وتی: ئەی مەلیك ملکێکی پان و

بەرینت پێ دراوە پاشان کار بەدەستی ولاتی رۆیشتە لای وتی ئەسکەندەر خانەنیشنت ئەکات دەستت لەکار ئەکێشێتەوە، ئەم توورە بوو وتی توورە مەبە نفووسی گیاندار هەندێك کار پێ ئەزانن بە نیشانە و بەلگە کە ئەسکەندەر هات من خەریکی و پانی و درێژی پۆشاکەکە بووم رێکم ئەخست و چاکم ئەکرد و کە تۆش هاتی من لێ بوو بوومەوە ئەم ویست بیبڕم و کارەکە وا دەرچوو ئەلێن سەیفی کوڕی زی یەزن داوای کۆمەکی و سەرکەوتنی لە کیسرا کرد تا بچێت بە گژی حەبەشییەکاندا و کیسرا سەربازێکی زۆری پێدا دا لە دەریاو بەرانیدا کۆمەکی پێکرد و شای حەبەشە مەسروقی کوڕی ئەبرە هەبوو بۆیان هاتە مەیدان بەسەد هەزار سەربازی حەبەشی و جیمتری و بەنی کەهلانەوە و هەردوولا یەخەگیری یەکتر بوون لە جەنگ و نەبەردێکی گەرمدا وە مەسروق شا یاقوتێکی سووری لە تاجە ئالتوونییەکەی قایم کردبوو ئەدرەوشایەوە وەکو ئاگر و سواری فیلێ گەورە بووبوو ئەجەنگا، لە فیلەکە دابەزی و سواری وشترێك بوو ئەمجا لەویش دابەزی و سواری ئەسپێك بوو شەڕی ئەکرد ئەمجا بۆ ئیهانە و لووت شکانی چەکدارانی زی یەزن و بە هیچ زانینی و کەم نموودیان لەویش دابەزی سواری کەرێك بوو.

جاهورمز هەر بیری لێ ئەکردەوە وتی و فەرمانیدا پێکرا هێرش بەرنە سەری ملك و مالی پایە مالە، چونکە لە گەورەوە بۆ بچووك هاتە خوارەوە دواییەتی. جا بەشمشیر داگیریان کرد لە گشتلاوە مەسروقیان کوشت بەخۆی و دەست و پێوەندی.

* * *

ئەگێرنەوە "حەزرەتی علی" "رض" کە دانیشت بۆ بەیعەت وەرگرتن، واتە سوێندخواردن لە گەلیا یەکەم کەس تەلحەی کوڕی عبداللە بوو بە دەستێکی شلەپەتە پەیمانی لەگەل بەست حەزرەتی عەلی پێی رەش بینی بوو فەرمووی بێ شك پاشگەز ئەبێتەوە و وابوو زۆری نەبرد رۆیشتە رەحمەتی خواوە.

* * *

ئەگێرنەوە ساعدی کوڕی مەحمودی نەهاوەندی ئەلێت عەرافێك لە بەغداد هەبوو شتی ئەوت کەم وابوو هەلە بکات. پیاوێك هاتە لای وتی من پرسیار و مەبەستێکم هەیە ئەگەر راستم پێ بلێیت ئەوەو ئەمەوئەوەت ئەدەمێ!!

وتی بپرسە. وتی کە پێت بڵێم دڵنیا نیم لە وەڵامەکەی، کابرای عەراف " هەندێك راوەستا جا وتی: ئەپرسێت لە بارەی گیراو و بەندێك! وتی والله راست ئەکەی وتی لە بارەی گیرانی پێمان بڵێ وتی ئەگەر مەرجەکەت ئەبەیتە سەر؟.!! وا پێت ئەڵێم کە چۆنە کابرا رۆیشتەوە و هەر بەڵێنێکی دابوو هێنابوونی وتی ئێستا پێم بڵێ!! وتی زۆر ناخایەنێ بەر ئەبێت و خەلاتیشی ئەکەن ئیتر پاش چەند رۆژێك بەردراو خەلات کرا. هەرچی وت وابوو جا کابرا هاتەوە بۆلای عەرافەکە وتی ئەم کاروبارەم حاڵی بکە چۆنت زانی؟! بەچی ئەم گیراوەت پێ زانی وتی تێ بگە.. من کە پرسیارێکم لێ بکەن لە شتێك ئەڕوانم بۆ بەردەمی خۆم بۆ ئەملاولای خۆم راست و چەپ، ئەگەر شتێکم دیت کە بگونجێ و لە بارودۆخی ئەو شتە بچێت وەڵامی ئەدەمەوە دەقاو دەق وا دەرئەچێت.

کە تۆ لە منت پرسی من کوندەیەکم دیت ئاوی تێدا بوو و پیاوێکیش ئاوکێش بوو وتم پرسیارەکە لە بارەی بەندکراوێکەوەیە کە دووهەم جار پرسیتەوە بینیم هەر هەمان کوندە خاڵی بووەوە و کابرای ئاوکێش تووری دابوو لەوێ و دابووی بەسەر شانیدا وتم دەرئەچێت و خەلات ئەکرێت و هەر خوا خۆی زانایە بە غەیب و نهێنی خۆی.

* * *

مرۆڤ – ئینسان – شناسی: عیلمی قیافە یا ئینسان شناسی و پەی بردن بەرەو شتەکانی خۆیی ئەشخاص بە هۆی نیشانە و هێڵی جیاواز دیمەن و وێنەیەکی عیلمی راستی ئەبێ هەر بێت و نکولی لەو راستییە ناکرێت و هەیە. ئەگەر ئێستا لە زانستە پەسندەکانەوە دوور بێت لەبەر ئەوەیە لەلایەنێکی رۆحی سروشتییەوە ناتوانرێت بنکە و بنچینەی سنووری چەسپاوەی بۆ دابنرێت و جێگیر بێت، و لەلایەکیترەوە تێگەیشتنی و تەفسیری ئەو بناغانە و کاریگەری جیاوازی ئەوانە خێرا دەسکەوت نابێت، و بە ئاسانی قبووڵ ناکرێت لەگەڵ ئەوەیشا لە رووی هەزاران تێبینی زانستی و ئاکار و ئاسەوارەوە شایانی ئەوەیە پشتی پێ ببەسترێت. و بەوردی لێکۆڵینەوە و کەشف کراوە بە رێکوپێکی پێست و هێڵەکانی سیماو فەساڵ: راستوایە کە ئادەمی ناتوانرێت بە وێنە و دیمەن بناسرێت، چونکە لە ژێر دەسەلاتی ئینساندایە نواندن و شاردنەوەی کاتی، ئەگەر بتەوێت کەسێك فریو دەیت ئەتوانیت وای دەرخەیت کە خۆشحاڵ و ئارەزوومەندە، یا ماندوو هیلاکە یا بسۆز و پشتیوان و پەنا دارە، یا سەداقەتدارە کەچی لە حەقیقەت و راستی بە دوور بێت وە لەوانە خاڵی بێت و ئەنجامێکی لێ دەسگیر بێت، بەلام بە گشتی کاتییە، ئەچێتەوە سەر بارودۆخی راستی چەسپاوی خۆی، چونکە گۆڕانی قیافە و

ئەمجۆرە خۆنواندنە تەنها لە ئەشخاسی دەبەنگ کاریگەر ئەبێت و رووئەدات و هیچ لـە توانـادا نییە ئینسانێك بتوانێ ناوچەوانی خۆی بگۆڕێت گەورەی بکات یان بچووکی بکاتەوە، یا شکلی لووتی و دەم و لچی بگۆرێت، یا هێڵە چەسپاوەکانی سروشتی سیمای کە لە ژێر دەسەلاتی ئەو دانییە درەنگ یا زوو بێتە کایەوە، جا بییەوێ یـا نەیـەوێ سروشـتی مـاددە رزادی و نـەریتی پەیداکراوی ئەو دەرئەکەوێت "عادات مکتسبە" و قیافە ناسان لە هێڵەکانی سـیمای ئینـسان "نەك لە رووی پێست چارەو دەم و چاو" بەس پەی ئەبەن بەریشاڵ و نـاخی فـیتری و سروشـتی خاوەن قیافەکە یەشتا لەو شتانەی کە لە خودی خۆی شاراوەیە دەستی بـۆ درێـژ ئەکـەن هـیچ کەس بە تەواوی خۆی ناناسی و تەسەور وا ئەکات هەرچی هەبێ هەر ئەوەیە کەچی زۆر دیمەن و وێنە هەیە زۆربەی جیاوازە لە تەسەوری ئەو و ئێمە تەنها بۆ نموونە هەندێك لەوانە لە خـوارەوە شیتاڵ ئەکەینەوە.

## أ / ناوچەوان:

١. ناوچەوانی بڵند و فراوان خاوەنی هەوڵدەر و کۆشش کەرە.

٢. خاوەن ناوچەوانی زۆر کورت و تەنگ خەسیس و بەد خووە.

٣. خاوەنی ناوچەوانی پان و ساف. بەدرەوشت و سەودایە.

٤. خاوەنی ناوچەوانی قۆقز و تەنگ و نزم نیشانەی هێز و توانای دڵە.

٥. ناوچەوانی گرێدار نیشانەی حەیوانییەتە.

٦. ناوچەوانی خر و گرد نیشانەی لە باری و گونجاوییە.

٧. ناوچەوانی ئەوانەی: فرۆ رەفتەگی بێت و زۆر هاتبێتە دەرەوە "نیشانەی خۆپەسەندییە زۆر هاتبێتە دەرەوە.

٨. ناوچەوانی ئەو کەسانەی گەورەو دەمارو رەگی ئەستووری هەبێت نیشانەی ئەوەیە شتی بەسەردا تێ ئەپەرێت.

٩. چین چینی و لۆچی ئەستوندەگی لە ناوچەواندا هەبێت نیشانەی هێزی دڵە دڵی توند و قەوییە.

١٠. هێڵ و چینی لۆچی ئاسۆیی لە ناو چاودا هەبێت نیشانەی نەرمی و مولائیمی گەیاندنە.

١١. ئەگەر هێڵ و چینی رووی لە ناوچەوانیدا هەبوو، واتە لۆچ و هەمیشە دیارو لەبەر چاو بوو بەڵگەیەکە خاوەنی هەرگیز هۆش و زەکاوەت و زیرەکی نییە.

١٢. ئەگەر بە هیچ جۆر لۆچ و چین لە ناو چاویا نەبوو بەڵگەی ئەوەیە کە سەداقەت و پاکی نییە.

## ب/ ئەبرۆ:

١. ئەبرۆیەك کەوانی و رێك و پێك بێت. نیشانەی باشی و خۆشی خۆی و بێ فیزی دەمارییە "ضمناَ" کەمێك لاوازی بە خاوەنی ئەگەیەنێ.

٢. برۆی ئاسۆیی نیشانەی راستگۆییە.

٣. برۆی پڕ و چڕ نیشانەی داوەرییە، یا شتی وا.

٤. برۆی دەرچووی قوپاو و دەرپەریو و نارێك نیشانەی کینە و بوغزە.

٥. برۆی کورت نیشانەی پارێزگەرییە تەرێزدارە.

٦. ئەبرۆی ئەو کەسانەی توند و بتەوە نزدیکی چاوەکانیەتی.

٧. ئەبرۆی ئەو کەسەی سادەبێ، وەك لەوحی بلّند هەلّچوو بێت ناوچەوانی رێکە.

٨. خاوەنی ئەبرۆی پەیوەست: حەسوودە حەز لە نان برینی خەلّك ئەکات.

٩. خاوەنی ئەبرۆی زۆر لەیەك دوور خوێن سارد و بێ سۆزدارییە یە - بێ سۆزە.

١٠. خاوەنی ئەو برۆیانەی کە بە هۆی چەپکێك لە یەك جیابوونەتەوە دوو روو ئاوی ژێر کایە.

١١. ئەبرۆی تەنك نیشانەی دەماغ وشکی و سووکی و بێ بیرییە.

١٢. ئەبرۆی بلّند و کەچ و مایل بووی، نیشانەی بەدجنسی و بەدرەفتاری و بەدرەوشتییە.

## ج/ چاو:

١. چاوی ئەوانەی " تەنبەل بن" چاویان درشت و دێنە دەرەوە.

٢. خاوەنی چاوانی "گودو فرو رەفتەر" بەخیل و رژدن یا جاسووسن.

٣. چاوی ئەو کەسانەی مات و ئافتادەیە پۆشراوە، خاوەنی زەوق و هونەر و ظریف و هونەرە.

٤. چاوی عاشقان هەمیشە خەندانە و کراوەیە.

٥. چاوی کەسانی بێ دەنگ و مولائیم و کەسانی دلّ بە هێز و بتە و زیندار چاویان زل و گەورەیە "درشت".

٦. چاوی ئەوانەی جێگر و موسرن پێیان گشت کات داگرتووە بە توندی ئەوانە چاویان بچووکە.

٧. خاوەنی ئەو چاوانەی کە لە یەکتر نزدیکن زیرەك و هۆشیار و تێگەیشتوون.

٨. چاوی دوور لە یەکتر زۆر، مرۆڤی سادە و بەدنەفسی ئەگەیەنێنن.

٩. چاوی "بریدە"... نیشانەی مەکر و فێلّ و دەس برن.

١٠. چاوانی نایەکسانی و نارێك هەمیشە دەمەلاسکی کەر و هاندەری خەلّکن و باری رەوشتیان لە هەلّچووندایە.

١١. چاوانی نیوە خەوتوو- نیوە گیراو نیشانەی شەرمی حضور و حجابە کە هەیانە.

١٢. چاوی بچووك و "گود"... قوولّ گنجکاوی ئەگەیەنن بە خەلّکی.

## ج/ لووت /

١. خاوەنی لووتی گۆشتدارو فلتوو زەق، ئەوە زۆر خۆر و تێ نەگەیشتووە. تێ ناگات.

٢. خاوەنی لووتی کراوە و فش و فۆڵ زرنگ و شەیتانە واتە وریایە.

٣. خاوەنی لووتی قەڵەمی جدی و پڕ هێزە، بە توانایە.

٤. لوتی داکەوتوو، مەیلی دەم و لێو بکات بۆ خوارەوە، ئەوە شەخسێکی نەجیبە.

٥. ئەوانەی رۆحیان بەرەلاو ئازادە کراوەن لووتێکی هەستداریان هەیە، کونە لووتیان فشو فۆڵە تا برِ ناخە.

٦. خاوەنی لووتی کەچ و بچووك، ئەوانە عیزەتی نەفسیان هەیە.

٧. لووتی گەورە چاك و باشن خۆشی و چاکی ئەگەیەنن.

٨. لووتی بچووك نیشانەی ظریفی و پەسندییە.

٩. لووتی دەندووکی لە خەست و پۆرخز ئەچێت.

١٠. لووتی نووك تیژ نیشانەی هەژارییە.

١١. لووتی خوار و خێچ نیشانەی دەسەلات و توانایە ئەوە ئەگەیەنێ.

١٢. لووتێك لە چاودا چاك و بچووك و گەش بێت نیشانەی خۆش خوویی و زوو باوەرِ کردنە.

## ه/ دم- دهان

١. ئەگەر دوو لێو چون یەك یەکسان بوو، نیشانەی ئەمانەت و راستی و صداقەتە.

٢. لێوی سەرەوە هەندێك لەمی تر گەورەتربوو چاکی و خۆش نوودی ئەگەیێنێ.

٣. لێوی ژێرەوە بەرجەستە و بلند بێ نیشانەی بێ بایەخی دانە، گوێ بە شت نادات.

٤. تاوەکو لێوەکانی گەورە و ئەستوور بێت، خاوەنی پتر هەوا پەرست و عەیاش ئەبێت.

٥. لێوەکانی هەرچەندێ نازگ بێت تا ئەو رادەیە خاوەنی بێ هەست و تێبینییە.

٦. لێوی گیراو "بستە" نیشانەی هێزی دڵ و شەهامەتە.

٧. لێوی لۆچ و شل نیشانەی دڵساردی و کەم جورئەتە، ساردی و خاوی بەکاردێنێ.

٨. خاوەنی دەمی نیوەکراوە دڵساردو بێ برِوایە، تەسمیمی نییە.

٩. خاوەنی دەمی بەستراو لە گۆکەوتوو "فشردْ شدْ " لاف لێدەرو خۆ پەسندە هەر خۆی ئەبینێ .

١٠. خاوەنی دەمی بچووك و پووچەڵ سووكو بیٚ نرخە "پوچ یاوە" سبك اسد.
١١. خاوەنی دەمی خرو گرد ئەوە خەجاڵەتە و لە هەر سێبەرێكدا بێت.
١٢. خاوەنی دەمی فراوانی كراوە، ئەم هەواو هەوەس و شەهوەت پەرستە.

## ر/ چانە- چەناگە

١. خاوەنی چەناگەی كورت مەحجوب و خەجاڵەت بارە هەروایش پیٚ گیرو چەسپاوە "ثابت قدم".
٢. ئەوانەی چەناگەیان نییە بە چەشنێك پاك و بێگەردە، ئەڵێیت چەناگەیان نییە: نەفسیان لاواز و بیٚ تینە.
٣. خاوەنی چەناگەی دەرپەریوو، وەكو هەوساری هەبێت توند و بەهێز و جاهو ماڵی ئەویٚ.
٤. خاوەن چەناگەی چوار پاڵوو بە مەیل و ئارەزووی خۆی فیدائییە و ئەیەویٚ پیٚ بگات.
٥. خاوەن چەناگەی چاك و باش و هەوا پەرست و ژیان ویستە عەیشی ئەویٚ.
٦. خاوەن چەناگەی تیژ بەدرەوشت و زوو قینی هەڵئەستێت .
٧. ئەو كەسانەی چاك و باشن خودی خۆیان خۆیش و میهرەبانن ئەوانەن چەناگەیان گردو خڕە و هەندێك دەرچووە، ناوەڕاستی دەرچووە "٧، ٨" نە.
٨. ئەو كەسانەی كە خوێن ساردن چەناگەیان چاڵی تێدایە لە ناوەڕاستدا شەقی هەیە.
٩. چەناگە بڵند و خوار و خێچ نیشانەی بەدجینسییە نارەسەنە.
١٠. خاوەنی چەناگەی هێلكەیی، كردارو رەفتاری ناوەنجییە و لە روودایە.
١١. چەناگەی لاوازو رەق و لەجەر هەمیشە جدی و بە تێبینە كرداری تەسمیمی هەیە.

## ز/ گۆش — گویٚ

١. هەر ئەندازەیەك گوێی بچووك بێت بەرادەی ئەوە خاوەنی وردەكاری زەرافەت و هەست بینە.
٢. هەرچەند گوێی گەورە بێت بەو پێیە خاوەنی لەوحێكی سادەیە.

٣. گوێیەك پێچ و پەناو لۆچی بێ تەرتیبی تێدا بێ نیشانەی نەفس لاوازییە. نەفس نزمە.
٤. گوێچکەیەك پێچ و پەناو لۆچی چاکو رێك بێت نیشانەی هێزی دڵ و دەروونە.
٥. گوێچکەی ئەستوور و زل نەزانی و دەبەنگی ئەگەیەنێ – عەوامە.
٦. ئەو کەسەی مێشکو دەماغ و هونەری لە خەڵکی تر بەهێزتر و قورسترە گوێیان خڕو گردە رێکوپێکە.
٧. گوێی مۆسیقا ژەن پان و کوورە "مفعر".
٨. گوێچکەیەك لەگەڵ سەردا جیابێتەوە، واتە پێوە نەلکا بێت نیشانەی سەنعەت و حیلە گەرییە"پیشەسازی هەیە".
٩. گوێچکەیەك کە زۆر چەسپا بێت بە سەرەوە نیشانەی سەرکەشی و بەرەڵاییە.
١٠. گوێی بلاۆکراوە "پان" سەوە بوو ئازاو شەجیعە.
١١. گوێی لوول و هەڵقرچاو نیشانەی بێ حەیایی و هەرزەییە.
١٢. گوێچکەی تیژ و نوکدار سوعبەت چی و "مسخرەیە " سەیرکەرە.

ئەمەندە زۆربەی نیشانەکانی عیلمی قیافەیە بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر زانیاری دەسکەوێت و لێی تێ بگات لە رەوشتەکانی ئەو کەسانە با ئەمانە تێبینی بکات لەگەڵ ئەویشا هەندێك لەم نیشانانە زۆربەی زۆری جیاوازی هەبێت یان نەبێت جێگەی بڕوایە و رەنگە هەندێك جار سفاتی هەندێك ئەشخاس لەو پێو قەرارە نەبێ ئەمەیش رەنگە بە دەگمەن بێت لە سروشتی مرۆڤدا و دوور نییە دەقاو دەق دەرچێت.

هەروا تەواو زانستەکانی تر یەشتا جێگەی خۆیان لە تاقیکردنەوەدا بە تەواوی بەراورد نەکراوە هەروایش زانستی مرۆڤ شناسی یەکێکە لەو عیلمانە کە یەشتا تەواو نەبووە و جار جار بە پێچەوانەوە دەکەوێتە کار، و تاقی کەرەوەکان بە دوو دڵییەوە ئینکار ئەکەن، بەڵام لە ئەنجامدا باوەنەی ئەم زانستە فراوان و بەرین ئەبێت حیلە بازی بەشەر تەنگ تر ئەکات. ئەم نەختە باسە هەر بۆ چەشە جۆری ساڵنامەی فارسی بوو لە ساڵنامەی (١٩٢٨) وەرمگرتووە و منیش وەرمگێڕایە سەر کوردی.

* * *

جارێك مەلای مەشهور ئەچێت بۆ لای پزیشك و ئەڵێت جەنابی دکتۆر زۆر نەخۆشم چارەم بکە ئەویش دەست ئەکات بە لێ پرسینی، کوێت دێشێ؟! ئەڵێت مووەکانی سەرم لە دیوی

دەرەوە گشتیان ئێش ئەکەن ئەلێت چیت خواردووە؟! ئەلێت نان و سەهۆڵ ئەویش ئەلێت ماموستا نە نەخۆشیت وەکو خەڵکی وایە و نە خواردنیشت ئەمە هەر لە قامووسی تۆدا هەیە.

* * *

مێروولەیەك ئەچێتە خزمەتی حەزرەتی سلێمان "د.خ" لە دوای پرسیارو وەڵام و ئاخاوتن حەزرەتی سلێمان دەعوات ئەکات بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ. هەرچەندە هەوڵئەدات کە نابێ و ناکرێت واز ناهێنێ بە خۆو دەست و پێوەند و سوپاوە بانگ هێشت ئەکات سبەینێ بۆ نیوەڕۆ ئەچن بۆ سەر شارەکەی کە لە لێواری دەریادە ئەبێت پێشوازی ئەکات و قاچە کولەیەك فڕێ ئەداتە ناو بەحرەکەوە ئەلێت:

فەرموون گۆشتاو بخۆن حەزرەتی سلێمان قاقا پێئەکەنێ و ئەویش رووی تێ ئەکات و ئەلێت قوربان گەورەم "الدعوة او الهدية علی قدر المهدی " واتە داواتکردن و دیاری لە قەد شان و شکۆی بەخشینەوە من هەر ئەوەندەم لێ ئەوەشێتەوە دیارە درێغیم نەکردووە لە جەنابتان، هیوادارم ئێوەش لاتان پەسند بێت.

* * *

**ماموستا مەلا سید "احمد" فەیلەسووف لۆی گێرامەوە:**

نادر شای گەورەی ئێران پێویستی بە وەزیرێکی لێزان و وریا ئەبێت کە بتوانێ چاری گیرو گرفتی وڵاتی بۆ بکات بە مەرامی ئەو وەزیرێکی ئەبێت پێی ئەلێت: ئەبێ سوورەی "یا ایها المزمَلَ و قل أوحی و تبارك" لەگەڵ زاوەکەی میر موبارەك بخاتە سەری ئاقیقێك لە پەنجەی بکات و نووسرابێت و(١٠) دە شەوی مۆڵەت ئەدات ئەگینا ملی ئەقرتێنێ ئەمیش دۆش دائەمێنێت نازانێت چی بکات تا شەوی نۆیەم ئەچێتە تەویلە خانەوە بە خەم و پەژارەوە سەرمەیتەر عەرزی ئەکات جەنابی وەزیر ئەتبینم زۆر ناکۆکی و پەژارە گرتوتی ئەلێت هەر خواردن ناخۆیت! بڵێم چی هەرچی هەبێت چاری بە تۆ ناکرێت. ئەویش ئەلێت ئەگەر پێم بفەرموون رەنگە لەو گیروگرفتە رزگارتان بکەم، ئەویش بۆی ئەگێرێتەوە رووداوی نێوان خۆی و نادر شا سەرمەیتەر ئەلێت ئەم شەو چارت دەکەم من خۆم مۆر هەڵکەنی و سیاغەتی ئەزانم بۆت ئەنووسم لە نقیمی مۆری ئەنگوستیلە بۆ هەڵئەکەنم. ئەو شەو سەری شەوە ئەم شیعرە ئەهۆنێتەوە.

**یا ایها المزمّلَ و قل أوحی و تبارك**

**نادر قولی و أفشار داماوی میر موبارەك**

نادر قولی خان لە عەشیرەتی هەو شاری ئەبێت و زاراوەکەیشی ناوی میر مووبارەکە وە لەسەری ئەنگوستیلەکەی هەڵ ئەکەنێت، بەیانی ئەیدات بە وەزیر ئەڵێت ئەمە چییە؟ ئەڵێت تۆ حەقت چییە بیدە بە شاە من بانگ ئەکات. بەڵێ کە ئەیبات بۆ نادر شا ئەزانێ ئەم ئەوەندە زیرەك نییە ئەڵێت ئەوەم بۆ بێنە ئەمەی بۆت کرد ئەڵێت مەیتەرەوانە لای من نەیهێنێ یەکسەر لەگەڵیا ئەدوێت ئەیکات بە وەزیری زانیاری و هەموو شتێك.

❊ ❊ ❊

**ڕووداوێکی ڕاستی سەیر:**

ئەمە بە ڕاستی ڕووی داوە لە چەمچماڵدا: کابرایەك دوانزە هەزار دینار وەرئەگرێت لە باتی تەعویزی ماڵ و خانووی وێرانکراوی خۆیدا لە حکوومەت ئەو ساڵە کوردستان بە گشتی وێرانکراو خەڵکی ڕاگوێزرایەوە بۆ شارەکان و دێهاتە یەك پێگرتووەکاندا بە زۆر نیشتەجێ پێ کرابوون سەرۆك جاشێك ڕاوێژ ئەبێت، واتە "مستشار" پێی ئەزانێ و دوای ئەکەوێت تا ئەچێتە ماڵەوە ژمارەی خانووەکە و کۆڵانەکە دەستنیشان ئەکات و لای خۆی هەڵی ئەگرێت ئەو شەوە دێتە سەر کابرای پارە وەرگرتوو بە زۆری دەمانچە و تفەنگ پارەکەی لێ ئەستێنێ "چەمز بیرێکی ئاو لە حەوشەکەدا ئەبێت، لە پەشۆکاوی خۆی هەر خێرا جانتاکەی دائەنێ و بۆی دەرئەچێت و ڕائەکات ئەپەشۆکێت و ئەشلەژێت ئەکەوێتە ناو بیرەکەوە ڕانێکی ئەشکێت خاوەن ماڵ بەمە نازانێت. بەیانی کە ماتۆرەکە پێ ئەکەن و دایگیرسێنن هاوار ئەکات کارەبا گرتمی بۆ خاتری خوا دەرمبێنن کوشتمی کە ئەچن تەماشا ئەکەن کابرای دزەیە، پۆلیسخانە ئاگادار ئەکەن و دەری دێنن بە خۆی و جانتا پارە دزراوەکە کە دزی بووی لە ماڵەکەی سەندبوو بە سزای قانوونی گەیشت لەگەڵ تۆڵەی سزای خوایی لە دونیادا. کاشکی گشت ناحەقییەق وا زوو تۆڵی ئەسێنرا و ئاشکرا ئەبوو.

❊ ❊ ❊

ژنێکی سۆزانی نەزرێك قەرار ئەدات لەسەر خۆی ئەگەر فلانە شتی بۆ، بوو بە مەرامی خۆی گەیشت مەرجی بێت یەکێك "گانێك" بدات بە کوێرێکی هەژار بەڵێ مەرامەکەی دێتە دی بەیانییەك دێت بۆ مزگەوت ئەگەرێت کوێرێك ئەدۆزێتەوە و پێی ئەڵێت وەڵامی ئەداتەوە

زۆر مخسودی تریشت بۆ جێ بەجێ ئەکات، ئەیباتــە ژوورەوە پیــا ئەکێــشێت و لێ ئەبێتــەوە و ئەڕوات، سبەینێ ئەو کاتە چاوەڕێ ئەکات لە خۆیەوە بانگ ئەکات: کوا خێر و مەندێکی وەکو دوێنێ ئەم وەختە خێرێك بکات؟ رەحمەتی لێ بێت؟؟!!

*　　*　　*

## رەنگە وا نەبێت

بۆیان گێرامەوە (رەنگە خەون بووبێت) ئــەڵێن جارێــك مــەلا مـصطفی بـارزانی لــە تێــك هەڵپژانێکدا لە دەوروبــەری شــارێکدا لــە هاورێکــانی و پێــشمەرگەکانیدا دائــەبرێت و تــەنها ئەکەوێت، ئەمیش خۆی ئەکا بە شــاردا و روو ئەکاتــە مزگــەوتێك و لــە حــوجرەی فــەقێکان بێدەنگ دائەنیشێت تا هەلێك برەخسێنێ بگاتەوە بە هاورێکانی. کەچی لە ناکــاودا فەقییــەك زەبەلاح و زۆر گەوج دێتە ژوورەوە ئەم ئەو ناناسێت دێتە وەلاّم بە جەنابی مەلا مصطفی ئەڵێت کابرا هەلّسە ئەو پێلاّوانە ریزکە و گسك بدە لە ناو ئەم حەجرەیە تۆ چۆن سوختە زەبەلاحێکی؟ دەی ئەو جێگایەش قەدی بکە و هەڵیبگرە جەنابی مەلا مستەفا تێ ئەگات ئەم کابرایە هــیچ عەقلّ و هۆشێکی نییە هەر راست ئەبێتەوە چی ئەڵێت بە قسەی ئەکات و تەرقی ناکاتەوە لەو کاتەدا فەقێ مستعدەکە دێتەوە چاوی بە مەلا مستەفا ئەکەوێت، پێی ئــەڵێت جــەنابت مــەلا مستەفای بارزانیت؟ رێزی لێ ئەگرێت و ئەڵێت خەجالّەت خــۆم ئــەم فەقێیــە شــێتە ناکــات و نابێت شێتانە جوولاّبێتەوە لەگەڵتا؟ لەگەلّ وا ئەڵێت کابرا ئەبوورێتەوە و ئەکەوێت بــەلادا جــا ئیتر فەقێکە سەری لێ ئەشێوێت ئەگەر بانگی خەلّك ئەکات هــاتنی مــەلا مــستەفا ئاشــکرا ئەبێت ئەگەر هاوار ناکات ئەوە کابرا لەوانەیە بمرێت و گیانی دەرچێت، ئەمــەیش لــە تــرس و هەیبەتدا بوو رابووەوە!! جەنابی مەلا مستەفا دلّی دەداتەوە ئەڵێت مەپەشۆکێ چاك ئەبیتــەوە ئاو پرژێنی سەر و چاوی ئــەکات و دێتــەوە هــۆش خــۆی جــا دای ئــەنێت و دلّــی دەداتــەوە و پارەیشیی ئەداتێ. نامەیەك ئەنێرێت بۆ دۆستێکی خۆی دێن ئەیبەنــە لای خۆیــان و دەربــازی ئەکەن جا گشت جارێك بەخشندەیەکی باشی بۆ هەردووکیانی ئەنارد لە دەرفەتێکدا.

بەلّێ لە خەودا بۆیان گێراومەتەوە رەنگە شتی وا روو بدات.

*　　*　　*

جارێك: وا رێك ئەکەوێت مامۆستا مەلا شێخ عبــدالکریمی دۆلّــە بــەکرە خــۆی و چــەند کەسێك ئەچن بەسەر کابرایەکدا کــە گــاوان ئــەبێت وا خەریکــە ماکــەرێکی پــیر ئــەگێت.

جاشولکەی زۆریش ئەبێت لە ناو گاگەلەکەدا، بانگی ئەکات و پێی ئەڵێت بۆچی ئەم ماکەرەت هەڵبژاردووە و پیرە بۆچی ئەو جاشوولکانەت نەویستووە؟ ئەویش هیچ ناشڵەژێت ئەڵێت قوربان ئەوانەم گشتیان تاقیکردووەتەوە ئەمیش هەر تامی ئەوانی هەبوو.

*　　*　　*

**مەلا عەبدولحەمید لە هەولێر بۆی گێڕامەوە:**

گوایە مەلایەك خۆی ئەیگێڕایەوە بۆ دۆستێکی خۆی وتی: ئەم شەو وام کرد لەگەڵ مەلا ژندا سێ چوار جار کوتەکم بە قوڕاودا دا پاشان هیچم پێ نەما پشتم لە مەلا ژن کرد مەلا ژنیش هەر ئەیەویست تێی بەرێم، بەڵام پشتم تێکرد و تریکم کەند، مەلا ژن وتی ئەوە چی بوو مەلا؟! وتم تا ئێستا فیشەکم پێوە ئەناو چاکم ئەپێکا، بەڵام فیشەکم پێ نەماوە ئەمجا بەر طۆبی ئەدەم.

*　　*　　*

لە دێیەك لە دێیەکانی ناوچەی هەورامان گوایە ئەم ڕووداوە ڕوویداوە: واتە کچی کوێخا ڕۆیشتۆتە دەرەوەی دێ، و کوڕێکی هەرزەکار سواری بووە کە هاتووەتەوە گێڕاویەتەوە بۆ باوك و دایکی ئەوانیش قورئانیان بۆ گێراوە و بانگەوازیان بۆ کردووە:

ئەی ئەهلی و خەڵکی تەنگی سەری تەنگیتان نگنۆ.کناچە و قیخوا لوان پەی پەلگی. فلچە شان کەردەن، قورئانیش پەی گیلو، ویم فلچەم کەردن هەیم لوا پەی یەزی بارە پەی مزگەفتی تا تەلاقیش نەگنۆ.

*　　*　　*

**( شێخ عبدالرحمن سیوسینان گێرایە)وە کە**

کابرایەك هەبوو لە دێیەك لەو قەراغە کچێکی منداڵکار ئەخوازێت و ئەیگوێزێتەوە، کە شەو ئەچێتە لای زۆر بە توندوتیژی خۆی پیا ئەدات و پیا ئەکێشێت، کچەکە هاوار ئەکات وای مامە گیان؟! ئەویش وەڵامی ئەداتەوە بیبەمە پێشەوە؟ ئەڵێت نەء ئەڵێت بیکێشمەوە؟ دەری بێنم ئەڵێت نەخێر زۆر خۆشیشە پێی ئەڵێت " ئەی خۆ واز لە کێری خۆم ناهێنم نەیبەمە پێشەوە، نەیهێمنە دواوە، ئەی بڵێ چی بکەم خۆ نایبڕم وەك خەیار هەر تیا بێت.

*　　*　　*

ژن و مێردێك کەوتنە ناو گاڵتە و گەپ و پیاهەڵدان بە یەکتری ژنەکە وتی بە پیاوەکەی خۆزگە منیش ببومایە بە پیاو بۆ چەن ڕۆژێکیش بوایە؟! مێردەکەی وتی بە گۆڕی باوکت و دایکت ببویتایە بە پیاویش هەروام لێ ئەکردیت!! چونکە پێت فێربووم. هەرکەسێك چاو بەرەژێر کرا ناتوانێ پەلە قاژە بکات.

* * *

کابرایەك هەبوو ناوی مام هەباس بوو. جارێکیان بۆی ڕێك دەکەوێ هەندێك هەنجیر دەکرێت و دەیخوات، بە برادەرەکەی دەڵێ مەلاکان لە نوێژدا زۆری دەخوێنن "والتين والزيتون" ئەمنیش ئەورۆکە هەردووکیان دەکڕم و دەیخۆم. ڕۆیشت هەندێك زەیتوونی خۆش نەکراوی کڕی و دەستی پێ کرد بیخوات کە نایە ناو دەمی زۆر تاڵ بوو وتی: بەخودا هەنجیرەکە زۆر شیرین بوو، بەڵام زەیتوونەکە هەنجیرەکەی لە کەڵك خست. بەه کە تاڵە.

* * *

ڕۆژێکیان ڕێوییەك لە بیابانێکدا ئەسوورایەوە، بینی حوشترێك یەخ بووە، لێی کەوتووە ئەمیش ئەم قەوارە زلەی لا سەیر دێتە بەرچاو.خۆی فڕێ ئەداتە سەرپشتی لەو کاتەدا حوشتر ڕاست ئەبێتەوە، تەواو بەرز ئەبێتەوە ئەچێت بە حەوادا ئیتر ڕێوی زات ناکات خۆی فڕێ بدات و دەستی لە زەوی بەر ئەبێت حوشتر دەست ئەکاتە لۆقە کردن و هەڵبەزین و دابەزین لەو کاتەدا تووشی چەقەڵێکی دەشتی ئەبێت ئەڵێت هار بووی ئەفەندی ئۆغر بێت بۆ کوێ ئەچیت؟! ئەویش ئەڵێ بەخوا مام جەناب ئەزانێت بۆ کوێم ئەبات!! پێی ئەڵێت قەی ناکات خێر ئەبێت ئەڵێت خێری چی؟! من وا هەناوم داکەوت ئەوەندە هەڵبەزو دابەزم پێ بکات، خوا ئەزانێ بەرەو کام هەڵدێر ئەمبات؟ پێی ئەڵێت بێچە ژەکاری بێ بیرکردنەوە و خۆ هەڵ قورتاندن لەشت هەر ئەبێت مام جەناب دیاریبکات، هەڵمەچۆ لە یەکێك لە خۆت گەورەتر بێت، کارێك مەکە تا نەزانی ئەنجامی چییە، دەبڕۆ لە بیابان بۆ خۆت بمرە خوات لەگەڵ لەو بەرزییە یا خێڵ بڵێ!!؟.

* * *

مەلا فایقی شێت هەبوو لە سلێمانی لە مزگەوتی عازەبانی هەرچی پارەییەکی ببوایە ئەیکرد بە لیرە و هەڵی ئەگرت. ئەچووە ناو بازاڕ بە دەنگێکی بەرز هاواری ئەکرد بژی هەورامی، لەسەر بەردی رەق خۆیان ئەژێنن.

* * *

لە زەمانی کەریم قاسمدا مەلا سالح و مەلا عومەر و هەندێکیتر گیران دەس بەسەر کران لەو جنوبەدا، بەسرە و ناسرییە دا مەلا فائیقش هاواری ئەکردو ئەیوت مەلا سالح و جماعەت ئێوە مەلان حەقی دینتان چییە دەبڕۆ ئەوە دەردتان بێت بیخۆن چیتانە لە دین و سیاسەت.

* * *

مەلا ئەحمەدی مفتی زادە لە سنەدا تێکۆشەرێکی چاك بوو لە دین و لە رامیاریدا ئەیفەرموو ماشاالله لە گەورەیی خوا بەراستی ئەم دینی ئیسلامە عەزیم و گەورەیە ئەم هەموو مەلایە هەیە یەشتا ئیسلام هەرماوە پەرە ئەسێنێ ئێمەش خولاّمان هەیە.

* * *

کابرایەکی بێ دینی خەڵکی سلێمانی هاتووچۆی ناو ئاغاکانی ئەو ناوچەی پشدەری ئەکرد رۆژێك ئەچێتە ماڵی ئاغا بە میوانی، ئاغا لە ماڵ نابێت کچێکی بەشووی ئەبێت بەسەرردان دێتەوە بۆ ماڵی باوکی. شەو لە دوای خەوتنان هەڵ ئەسێت سواری کچی ئاغا ئەبێت لەکاری خۆی ئەبێتەوە!! کارەکەرەکەیان ئاگای لێ ئەبێت و مرخی ئەجوولێت، پاشی بەینێکیتر راست ئەبێتەوە لە ئاغا ژن ئەویش وای لێ ئەکات، دیسان راست ئەبێتەوە لە کچی ئاغا لە دوای پشوودان کارەکەرەکەیش ئەڵێت لای خۆی ئێمەش خوولاّمان هەیە، لایەك لە ئێمەش بکەرەوە!!.

* * *

**مەلا ئیبراهیم ـ ی گەلۆسی:**

ئەم برادەرە گشت کارێکی پێکەنیناوی بوو جارێك کابرایەك ئەمرێت بانگی مامۆستا ئەکەن پێی ئەڵێن نابێ بێیت بۆ گۆڕستان، چونکە کە هاتی کارو ئیشی وا ئەکەیت و وا ئەدێیت. کە خەڵکی لە قەبرسان خۆیان ناگرن ئەکەونە پێکەنین و قاقا لێدان ئەڵێن بابە تۆ

مەیێ چوار کەوێژ گەنمت ئەدەینێ ئەویش رازی ئەبێت کە ئەوان ئەگەنە گۆڕستان ئەمیش چونکە دوو کەویژ بۆ پێوانە ئەبێت لە دێیەکەیاندا یەکێکیان گەورە و ئەویتریان بچووك ئەبێت ئەچێت هەردووکیان ئەگرێت بە دەستەوە و رائەکات بۆ گۆڕستان بانگ ئەکات بەم دوانە بە کامیان بۆم ئەپێون با حیسابی خۆم بزانم.!!

* * *

دوو کابرا لە دەشتی دزەیی لە ناو خۆیاندا ئەخاوتن و ئەدوان یەکێکیان بەویتر وت ئایا خودا گەورەترە یان پێغەمبەر "محمد دروودی خوای لێ بێت" وەلاّمی دایەوە محمد گەورەتر ئەویتر وتی ناء خودا گەورەترە خۆیان ماندوو کرد ئەنجام وتیان با بچینە لای خارە عەمەدی لەو گوندەی نزدیکی خۆمان لێی دەپرسین ئەومرۆیەکی دونیا دیدە و لێزانە پێماندەرێ رۆیشتن بۆ لای خارە عەمەدی و سەلامیان لێکرد چاکو چۆنیان گۆت خارە عەمەدی گۆتی بابم بەخێرهاتن گەلێك سەرچاوی من. ئیش و کارێکتان هەیە؟ روویان تێکردو گۆتیان ئەتو پیاوێکی دنیا دیدەی هاتینە پرسیارێکمان هەیە مەگەر ئەتوو پێ بزانی گوتی دەفەرموون بیلێن، گوتیان ئێمە لە ناو خۆماندا نیزاعمانە ئەو دەلێت خودا گەورەترە ئەمن دەلێم پێغەمبەر گەورەترە ئەمەیش نازانین مەگەر تۆ پێمان بلێیت، گوتی والله بابم لە زەمانی ئێمەدا لە سولتان عەولای عارەبی و حوسەین غازی بەولاوە کەسی دی نەبوو ئێستا لە زەمانی ئێوە ئەم خودا و پێغەمبەرە پەیدا بووە، خۆتان بۆچی بەوەی ماندوو دەکەن.

* * *

کابرایەکی دەشتی دزەیی گەیشتە ئەویتریان گۆتی ماندوو نەبی چاکی چۆنی وەلاّمی دایەوە پێی گۆت ئێوە مەلاتان هەیە گۆتی ناوالله لۆچی؟ پێی گوت بانگێکتان بۆ بدات وەختی پێ بزانن. پێی گۆت ئەە لە منت نەکەوێ بەسەری تۆ مالّی مام بایز نێرەکەرێکی ملهوڕی دێزەیان هەیە کە گەیشتە نیوەڕۆ یەکجاری دەزەرێت، ئەو نێرەکەرە سەد مەلای دێنێت.

* * *

پیاوێکی کاروانی بە دین لە خۆشناوەتی رێی دەکەوێتە دێیەکی دەشتی دزەیی بەخانە خوێ دەلێت خەلّکی گوندیم بۆ گازیکە با بێنە ئێرووکە، بانگیان ئەکات و خڕ دەبنەوە. کابرای کاروانی دەلێت بۆ ئێوە زۆر عەیبە مەلاو مزگەفتتان نییە. لە کنە خۆتان ئیسلامن کوو وە دەبێت هەتا دێمەوە بۆ جارێکی تر ئەبێ مەلاو هەبێت و مزگەفت و کردبێت، ئەوانیش پێکرا بەلێنی دەدەنێ.

پاشی یەك و دوو مانگێك ڕێگای دەکەوێتەوە ئەوێ و لێیـان دەپرسـێتەوە ئـەمانیش دێـن هۆدەیەکی دەکەن وەکی مزگەوت بە تەواوی، ئەڵێن بۆ مەلا چی بکەین ئەڵێن پلکـە بـە سـێ ژنەکی ڕێکو پێکە جوان و خاوێنە ئەیکەن بە مەلای خۆیان نوێژی لە دواوە دەکەن.

کابرای کاروانی لای خۆشناوەتی دێتەوە بۆ دێیکە تەماشا ئەکات پلکە بەسێی بێوەژن پێش نوێژیان دەکات، ئەڵێت خوا بتان گرێت کو دەبێت ژن وەکو مەلا پـێش نوێـژی بکـات هەرچـی نوێژێکتان لە دوایەوە کردووە گشتی بەتاڵە ئەبێ بیگێرنەوە یەکێکیان دەڵێت بەسـەری ئـەنگۆ خەبەریەتی وایە نوێژمان گشتی بەتاڵە، چونکە پلکە بەسێ دادەنوێوە بۆ ڕکوع ئەمن کێرم لـە خۆرا ڕاست دەبووەوە لێی، چونکە ئەوەم وەبیر دەکەوتەوە لەوەبەر چیمان پێ دەکردو خۆمان پێ دا دەدا زۆر ڕاستە نوێژمان بەتاڵە هی گشتمان.

* * *

## مەلا ئیبراهیم ـ ی کەلۆسی هەبوو لە دەشتی دزەیی زۆر مەشهور بوو لەمەلای مەشهورە سەیر تربوو.

کابرایەك ئەگاتە مامۆستا لێی ئەپرسێت لە کێندەرێ دێیتەوە گـوتی لـەلای فلانـە کـەس هەژارە زۆر نەخۆش بوو گوتی ئەیچۆنە: وتی بەخوا ئەو کەر بوایە و ئـەمنیش سـەگ بوومایـە بەجێم نەدەهێشت تا دەتۆپی و دەستم دەکرد بە خواردنی کەلاکەکەی، بەلاّم بەداخەوە..

کابرایەك سوێند ئەخوات بە تەلاّق لە سواری کەرەکەی نایەتە خوارەوە، پاشان گیر ئەخوات بە مەلا ئەڵێن ئەڵێت بیبەنە ژێر دارێك پیا سـەرکەوێت پاشـان بـە دارەکـەدا بێتـە خـوارەوە بەوجۆرە ڕزگاری ئەکات، بەلاّم پێنج دینار پاداشتی کەریەتی.

* * *

## ئێمە ئەمانخوێند لـە دەشـتی دزەیی موسـتەعیدێکمان هـەبوو زۆر قـسە خۆش بوو ئەیوت:

من ئەگەر ژن بێنم ئەبێ ئەم مەرجانەی تیا بێت وەکو:

فەقێ ئیبراهیم بێت لە پاکو خاوێنیدا، چونکە ئەم ڕۆژی پێنج جار بە سابوون گەڵ و گـونی ئەشوات. دە جاریش دەستوپلی.

وەکو فەقێ دلێر وابێت لە ڕێکوپێکی و ڕەزیلیدا، چونکە ئـەم نایـەڵێت هـیچ شـتێك هەسار بێت، ڕیپاڵی تێدا نییە، ئەبێ گشت شتێك بەقەد پێویست سەرف بکرێت.

وەکو فەقێ سەعید وا بێت لە قسەکردندا: کە هەمیشە بمرە لەگەڵیا چاری بێ یەك وشە نادوێت، پیاوێ بکوژێت زەوبش لێی نابیستێت. بێدەنگ و هێمن و لەسەر خۆیە.
وەکو فەقێ خەسرەو وابێت: ئەگەر میوان هات وەکو حاتەم وایە چی پێ بکرێت و بیبێ بۆی دائەنێت رووخۆش و دڵسۆز و میهرەبانە.
ئەبێ وەکو مەلا سەلاح وابێت کە زۆر زانایە گشت شتێك ئەزانێ وەکو کەیبانوویەکی سەرەوایە.

* * *

## دڵداری لە نێوان کوڕ و کچێکی لادێ لە کۆندا:

کوڕە ئەچێت بۆ جێگەی ژوان و زۆر چاوەڕێ ئەکات کچەکە نایەت ئەمیش بەم "فەردە" ئاگاداری ئەکاتەوە ئەڵێت:

**بە فیدای باڵات بم موورو لە گەردن**

**سەرما کوشتمی بێ بۆ گوو کردن**

کچەیش وەڵامی ئەداتەوە:

**سەرما کوشتیتی چاوت دەربایە**

**چاوەڕێ مەکە ئێستا گووم نایە**

* * *

## ئەژی گۆران گێڕایەوە کە بەسەر خۆی هاتووە:

وتی پێشمەرگە بووم لە ناوچەی قەرەداغ ئەم ویست شەو بڕۆم بۆ دێیەکی تر، کە رێگاکەی بۆ ئەوێ شیوو دۆڵ و دارو درەخت بوو پیاوی شارەزا نەبوایە رێگای دەرنەئەکرد، داوام کرد لە پیاوێك ماینێکی دامێ سواری بم و بینێرمەوە بۆی، منیش سواری بووم رۆیشتم نەم زانی جوانوویەکی لەبەرەو تەمەنی ساڵێك ئەبوو، شەوەکەی زۆر تاریك و شەوە زەنگ بوو چاو نەی ئەبینی زستان بوو هەور چەخماخەی ئەدا ئەم بەرو ئەو بەری رێگاکە شاخ بوو، دۆڵ و ئاوەرێژ بوو، لەو کاتەدا دوو قاچی زل و قورس کەوتە سەر هەردوو شانم بە قورسی داگیری کردم، هاوارم کرد فلان پێشمەرگە: پەل بەست کراوم و گیراوم، لە دڵیشدا وەختبوو گیانم دەرچێت زۆر تریش بیستبووم کە ئەو ناوە جنۆکەی زۆر لێیەو خەڵکیان هەڵبزرکاندووە ترسانوویانە کە هاورێکەم هات تفەنگی خستە سەر پێ و هاتە پێشەوە بەهەزار حاڵ بینی ئەمە جوانووەکەیە

ویستوویەتی پێ بخاتە سەر کۆڵی دایکی ئەمجا هەوڵمان ئەدا بێتە خوارەوە، بەڵام بە هەزار حاڵ لەشانم کردەوە بەڵام وەختبوو لە ترسا گیانم دەرچێت.

* * *

ژنێك هەبوو لە ناو دەشتی دزەیی خێر خواز و چاکەکەر بوو، زۆر جار لە مانگی مەولوددا مەولوودی دەکرد و دەیخوێندەوە، خەڵکێکی زۆری بانگ دەکرد، مەلا دەست بە خوێندنەوەی مەولوود دەکا ئەخوێنێتەوە هەرکەسێك بەدڵ مەولوودی بخوێنێتەوە و پارە سەرف بکات لە خوێندنەوەی مەولوودا حەفتا حۆری ئەدەنێ کوڕی ژنەکە کە خاوەنی مەولوودەکە بوو چووە بندەستی مەلاکەوە وتی مامۆستا پرسیارێکم هەیە، گوتی بلێ: وتی ئەگەر پیاو مەولوودی بکات حەفتا حۆری بدەنێ ئەی ئەگەر ژن مەولوود بکات چی دەدەنێ؟ گوتی ئەویش وەکی پیاو وایە هیچ فەرقی نییە لەلای خودا لە خێردا، ئەمیش هەڵسایە سەرپێ و دەیدا بەسەری خۆیدا ئەی هاوار لۆ پیرە داکم بەواللە کەڵەسوود دەبێ، داکم بەری حەفتا پیاو کوو دەگرێت ئەی قوور بەسەرو گوێلکی داکم.

* * *

ژنێکی زۆر قۆشمەو سوعبەتچی هەبوو، رۆژێك رێگەی دەکەوێتە لای مامۆستا مەلا شێخ تەهای بالیسانی لە دێی بالیسان مامۆستا شەرحی "حتی تنکح زوجاً غیره" بۆ فەقێ کەی دەکات و حەدیثەکەشی بۆ دەخوێنێتەوە "حتی تذوقی عسیلته و یذوق عسیلتك" بێ پەردە باسی بۆ دەکات: ئەمجا روو دەکاتە پیرەژنەکە و پێی دەڵێت: باشە وا پیاوەکە لەزەتی پێ دەگات، ئەدی ژنەکە چۆن ئەو لەزەت و خۆشیەی پێ دەگات پیرەژن؟! ئەویش وەڵام ئەداتەوە:

ئەگەر ئەتوو هەنگوینت بێنە بەردەست ئەنگوستی پێدا بکەیت هەر ئەنگوستەکە شیرینی و خۆشی پێ دەگات یان ناو دەم ئەویش دەڵێت هەر ناو زاری، ئەویش ئەڵێت خۆت وەڵامی وەرگرت بە تایبەتی ئەگەر ئەو ئاوەی لە مەلا شوانی وەردەدەیت، توندوتیژ و ئاوەرێژ دەبێت

* * *

جارێکیان لە دێی کەلۆڕ بووم تەسبیحێکم لە هاوڕێیەکی خۆم وەرگرت لە بیرم چوو کە بیدەمەوە ئیتر لێم گوم بوو سێچوار رۆژێك هەر خۆم ئەشاردەوە کە نەم بینێتەوە، کەچی لە ناکاو لە ناو کۆڵانێکدا هیچ رۆح لەبەرێکی لێ نەبوو تووشم بوو بە تووشی هاورێکەمەوە ناچار

هاوارم کرد یا شێخ نورالدین چارەم بکە بە دەنگێکی زۆر نزم بانگم لێکرد، کەچی لە هەواوە فرێ درایە بەر دەمم و هیچ کەسێکی لێ نەبوو وەختبوو شێت بم، دامەوە بە خاوەنەکەی. واللە درۆی تێدا نییە.!!

* * *

جارێکیتر مامۆستای قوتابخانە بووم لە دێی کانی سارد سەر بە دەربەندیخان لە ساڵی (١٩٦٣) بەعس هاتە سەر حوکم و جڵەوی کاری وڵاتیان گرتە دەست و قەسابخانەیان سازکرد لەسەرانسەری عێرقدا، شەیتان لەو ڕۆژەدا لە خۆشیدا هەر سووری ئەداو پیرۆزباییان لەیەکتر دەکرد و بسکەی سمێڵیان دەهات.

مانگێك بەر لە ئینقلابی بەعس بەسەر سەرۆکی دڵسۆزی گەلی عیراق (عبدالکریم قاسم) بە گشتی و بۆ کورد بە تایبەتی حیزبی شیوعی یاداشتێکیان بلاوکردەوە کە تیا نووسرابوو گەلێ ناڕەزایە برا کوژی لە نێوان کورد و عەرەب، پێویستە ئەم گیروگرفتە لە ڕێگای وتووێژەوە چارەسەر بکرێت و مافی گەلی کورد دەستنیشان بکرێت، ئەو یاداشتەیان هێنا بۆ من منیش ئیمزاو مۆرم کرد، کارگێڕی مخابرات و ئەمن لە دەربەندیخان تێبینی خۆیان لێ وەرگرتبوو لەسەر ئیمزا کەران. کە کار کەوتە دەستی بەعس لەگەڵ بەرەی کوردستانی ڕێککەوتن و بەڵێنیان دا کە مافی کورد ئەدەن بەیانی ژمارە سێنگزەیان بۆ قەلاچۆکردنی شیوعییەکان دەرکردو لە ناویان بردن تا توانییان گیراوخانەکانیان پڕ کرد لەوان و منیشیان خستە لیستی شیوعییەکان و بەهاوکاری هەندێك لەکاربەدەستانی پارتی و دڵ ڕەش و ڕەقی ناو پێشمەرگە هەرچیان ناسی پەنجەیان بۆ ڕاکێشاو هیمایان بۆ کرد.

من زۆر بێ ئارام بووم و ئەترسام جێگام بە خۆم نەئەگرت زاورەترەك بووبووم، بەلاّم لەو دێیە ژن و پیاویان هەر باسی مامۆستا و مەلا ڕەحیمیشیان ئەکرد ئەیان وت شێتیشە و پیاوی خوایەو وەلییە، من بە خزمەتی نەگەیشتبووم نەم ئەناسی و نەیئەناسم، بەیانییەك هاتمە دەرەوە بچم بۆ قوتابخانە، چونکە من ئیدارەم بەدەستەوەیە و ئەبوایە زوتر بچوومایە بۆ قوتابخانە و مامۆستاکان بڕۆنە پۆلەکان و من ئاگادارم. کەچی هەر لەبەر خۆمەوە — بەخوا کەس ئاگادار نەبوو هیچ کەس دیار نەبوو ڕووم کردە دەربەندیخان و بانگم کرد: هۆ مامۆستا مەلا ڕەحیم ئەگەر نووستووی بەئاگا وەرە، ئەگەر دانیشتووی گوێم لێ بگرە بانگت دەکەم بیکە بە خاتری خواو پێغەمبەری خوا، بە خاتری ئەو خۆڵە پاکەی بەسەر دەمی پیرۆزی حەزرەتەوەیە بگە پێم وا شێت بووم، ئەگینا لەو پیاوانەی خوابێت و

نەیەیت بە دەنگمەوە لە قیامەتدا شکاتت لێ ئەکەم لە خزمەتی خواو پێغەمبەری خوا سێجار دووپاتم کردەوە ئیتر لە بیرم چووەوە، سبەی بەیانی ڕۆیشتم بۆ قوتابخانە کە چووینە پۆلەکانەوە زۆری پێ نەچوو لە دەرگایاندا فەراشەکەمان مام علی بوو هات وتی: مامۆستا مەلا رحیم هاتووە ئەڵێت مەلا محمودم بۆ بانگ بکە. منیش کەوتەوە یادەم چووم پێشوازیم کرد ویستم دەستی بگوشم و ماچی بکەم نەی هێشت و فەرمووی مەلا محمود بۆچی شکاتم لێ ئەکەی لە قیامەت لای خواو پێغەمبەر، من چیم لە دەست دێت و چیم کردووە؟ گشت مامۆستاکان بانگ بکە با بێن دانیشن، منیش کۆم کردنەوە کە دانیشتن فەرمووی مەلا محمود کە خوا ئیشێك بکات هەموو عالەم هەڵسێت ئەتوانن بیگۆڕن و نەیکات؟ عەرزم کرد نەخێر. فەرمووی ئەگەر نەیکات کەس ئەتوانێت پێی بکات؟ وتم نەخێر ویستی خوا هەمیشە سەرکەوتووە فەرمانی ئەو جێگرە، بە توورەییەوە فەرمووی ئەوەیە وەڵامی تۆ، عەرزم کرد کۆتایی من هات و ترسی پێ ناوێت. زۆر لەگەڵ مامۆستاکانی تردا نەدواو وتی پێویستە خوا بناسن و ترسی پێ ناوێت، بەڵام کاغەزێکم بدەنێ با دووعایەك بنووسم بۆ کاك محمود شریف هەڵبجەیی. کاغەزمان داپێی لێی نووسی (البقرە — النساء) وتی ها فەرموو کاك محمود ئەزانی بخوێنیتەوە؟! وتی بەڵێ نووسیوتانە النساء البقرە فەرمووی ئێ ئیتر تێ ناگەیت؟! هەم دیسان وتی بەڵێ وتی النساء، واتە ژن البقرە، واتە مانگا، وتی بەڵێ وتی دیارە تێناگەیت ژن وەکو مانگایە چاك وایە نەیفرۆشی و خۆت بۆ خۆت بیدۆشی و شیرت پێ بدات ئێستاش هەر تێناگەیت؟ وتی قوربان چاك تێگەیشتم ئیتر هەڵسایە سەر پێ و خواحافیزی کرد نەی هێشت کەس لەگەڵیا بچێت و ڕەوانی بکات. ڕۆیشت فەرمووی جارێکی تر کاری وا مەکە و شکاتم لێ مەکە.

* * *

جارێکیتر لە دێی مۆریاسەوە ڕێم کردو ڕۆیشتم بۆ کەچەڵی و ماوەکان، لەوێوە ڕۆیشتین بۆ سەید سادق کە تازە کرابوو بە ناحیە و ئاوەدانی تێکەوتبوو دوکانی تازەی لێ دروست ئەکرا، شێخ حامید جۆمەرەسی هەبوو وا ناوی دەرکردبوو کە گوایە وەلی و کەرامەتی هەیە ئەویش سەرگەرمی دروستکردنی مزگەوتێك بوو تازە لەوێ دروستیبکات، هەوڵی پیتاکی بۆ ئەدا تا بە چاکی بینایبکات. من ئەوم نەدیبوو ئەویش منی نەدیبوو. یەکێك لە دوورەوە دەست نیشانی شێخ حامیدی بۆ کردم وتی ئەوە فلانە. کەواو سەلطە یەکی جوانی لەبەر بوو شەدەیەکی جوانی تازەی کردبوو بە مێزەر زۆر جوان خاس بوو شەنگ و شۆخ بوو دەستی لەسەر شانی پیاوێکدا بوو هەر پێ ئەکەنین دووریش بوون زۆر بە قایم بانگت بکردایە دەنگت

نەیەگەیشتیّ منیش لە خۆمەوە کە دانیشتبووم لەبەر دوکانێکـدا، بـانگم لیّ کـرد هـۆ شـێخ حامید السلام علیکم ورحمة الله و برکاته ئەگـەر راسـتە توخـوا ئەگـەر هۆشیار و ئاگـاداری مەردانە وەرە بۆ ئێرە بەتەك مندا برۆ بچۆرە ئەو دوکانە لە دوای نەختێك بێـرەوە وەرە سـەلام بکە و بڵێ مەلا محمود چۆنی چاکی لەگەڵ شێخەکانی موریاسدا چـۆنی چـاکی ئـازارت ئـەدەن ئەمجا دائەنیشی و ئەبین بە ئاشناو خۆشەویست.

کاتێکم زانی زۆر لە دوورەوە ئاورێکی لیّ دامەوە و دەستی بە کابرای برادەری خۆیەوە نـاو هات بەرەو ئێمە و بەلای مندا رۆیشتە ناو دوکانەکە و هیچ منی نەدوان نەختێك مایەوە ئەمجا هاتە دەرەوە بەسەرمەوە وێستا وتی "السلام علیکم" چۆنی مەلا محمود چـاکی لەگـەڵ شـێخە درۆزنەکانی مۆریاسدا چۆن ئەژیت سەبر بگرە خوا کەریمە. ئـەمجا فـەرمووی بـا باسـی دزێتـی خۆمت بۆ بکەم کە لە مۆریاس راویان نام: عەرزم کرد ئەم قسە خوار و خێچە مەکـە ئافـەریم خوا یارمەتیت بدات وەکو عەرزم کردوویت با ئاشناو دۆست بین زۆر سوپاسـت ئەکـەم دوعـای خێرم بۆ بکە ئەی ئەمانە ئەگەر کەرامەت نەبێت؟ چی کەرامەتە..

* * *

جارێکیتر: من و شێخ سەعیدی شێخ عیسا لە مۆریاسەوە رۆیشتین بە دزیەوە بۆ بیارە بـۆ خزمەت شێخ علاءالدین لە پێشەوە چووینە محاسفی شەریف و زیارەتمان کرد بەلاّم حالاّتی مـن شێوا بوو هەر لە خۆمەوە گریانم دەهات و موچورکە و تەزوم پێدا دەهات، پاشان دوای نوێـژی عەسر پاش نوێژی عەسر چووینە خزمەتی شێخ علاءالدین خـوالێی رازی بێـت و پایـەی بـەرز بکات خەڵکێکی زۆر هاتبوونە خزمەتی گیروگرفتیان هەبوو چـاری بـۆ گـشتیان دانـابوو هـەر یەکێك بە جۆرێك منیش دانیشتبووم شێتێکیان هێنایە خزمـەتی رووی تێکـردو چـووە بـاری موراقەبەوە، سەری بەرزکردەوە فەرمووی ئەم پیاوە عەشق لێیداوە پێی تێك چووە، بیبەنە نـاو ژووری محاسنەوە شەو با لەوێدا بمێنێتەوە وە فەرمووی یەکێك عانەیەکی پیّ ببەخشێت تا بـۆی لیّ بخوێنم دوعـایـەکی بـۆ بکـەم، کابرایـەك ئانەیـەکی دایـە، شـێخ چـووە بـاری موراقەبـەو تێفکرینەوە منیش لە دڵی خۆمدا رووم تێکرد و لاشەی خۆمم جێهێشت و عـەرزم کرد قوربـان دوعـایەکیش بۆ من بکە کە هەرگیز هەژار نەبم مـەحتاجی سـووك و نـزم نـەبیم سـەری بـەرز کردەوە فەرمووی مەلا محمود داوای دوعایـەکمان لیّ ئـەکات، ئانەیـەکی بـدەنیّ بـۆی بکـەم، ئانەیەکیان داپێم بە نووکی پەنجە لێی ئەنووسی لە مراقەبەدا بـوو منـیش کەوتمـە مراقەبـەوە

عەرزم کرد قوربان دوعایەکیش بۆ هاورێکەم شێخ سعید ئەخوازم بۆی بکەی تکا ئەکەم سەری بەرز کردەوە فەرمووی مەلا محمود داوای دوعایەکی تر ئەکات بۆ هاورێکەی، ئانەیەکیتریان داپێی لە مراقەبەدا ڕۆچوو، سەری بەرز کردەوە فەرمووی مەلا هاورێکەت نوێژ ناکات عەرزم کرد نوێژ ئەکات فەرمووی بەڵێ نوێژ ئەکات هیچیان لە وەختی خۆیدا ناکات کاتەکانی تێ ئەپەرێت و نامێنێ شێخ سعید خۆیشی دانی پیانا وتی کار و ئیشی ئێمە وایە پیا ناگەین.

* * *

لە دانیشتنەکانی ((تحضیری)) ئەرواح زۆر شتمان بەدی ئەکرد بڕوامان پێ نەکرد جارێکیان کچێکی خزمی خۆمم نواندبوو بە خەوی موگناتیسی ناردم بۆ عالەمی بەرز و عالەمی ملکوت، داوای مامۆستا میططرونم کرد کە سەرپەرشتی دانیشتنەکەمان بکات. هەروا داوای کۆمەڵی لە موسڵمانانی جینی لەوانە مەلیك یاروش و یاسمین خان پزیشکی ناوداری ئەوان هاتن نووستووە کە غەرقی ناو خەوەکەی بوو، وتی مامۆستا میططرون لە دەرەوە دانیشتووە منیش ئەچم پێشوازی ئەکەم، خوشك و برایانی چینی لەوێن مەترسە لێم کە هەڵسا وەکو پارچە تەختە دارێك هەڵساو ڕۆیشت و هاتەوە دەستمان گرت و ڕامان کێشا وتی مامۆستا وا لەوێ دانیشتووە کالآیەکی سپی لەبەردایە، ئازادی کوڕم و نەزیری پورزام و بانووی دایکی نوستووەکە پوورە غاتم لەگەڵ حاجی ئەحمەدی مێردی پوورم یەك یەك چوون بینیان لەسەر پێپیلکەکە دانیشتبوو بە هەردوو چاو بینیان بەلآم نەیانوێرا قسەی لەگەڵدا بکەن، کە هاتنە ژوورەوە نوستووەکە وتی وا مامۆستا میططرون ئیشراقاتی نووری ئەگرێتە ناو ژوورەکە و بنمیچەکە ئەگرێت بەڵێ وا بۆ دانیشتوان نزیکی دوانزە کەسێك بوون چاویان پێ کەوت.

* * *

مەلایەك هەبوو غەریزە و مرخی پەڕینی زۆر هەبوو دوو ژنی هەبوو زۆری بۆژە کردبوون هەردووکیان بە دەستییەوە ئارامیان لێ بڕا دەرفەتی ئەبینی و ڕای ئەکێشان و خۆی پێدا ئەدان، ناچار ژنەکان شکاتیان لێکرد لای قازی شەرعی قازی قەراریدا ڕۆژی سێ جاری بدەنێ و سواریان بێت، ئەم کارە فاش بوو لە ناو ژن و پیاوی دێیەکە ژنی وا هەبوو ئاواتی بەوان ئەخواست..

ڕۆژێکیان میوانێکی مەلا هات، دانیشتبوون وتی مامۆستا ژنەکان حاڵتان چۆنە بە دەس ئەم مەلا ئالۆشاویە خنۆکە بێزاری خۆیان دەرئەبڕی حەیاو ئابرو تکابوو. مەلا وتی بڵێم چی ژنە گەورە

پێنج گانی قەرزارم بچووکەکەیشیان حەوت گان جا ئەگەر عەفوم بکـەن پیـاوەتیم لەگەڵـدا ئەکـەن، واتە هەر یەکێکیان لە دوای بەشی خۆیان زیاتری گاون بە قەرزکە رۆژانی دوایی لە سواربوونیان کـەم بکاتەوە بۆی نەدراوەتەوە ئەم قسەیەم بۆ ژنێکی قۆشمە گێڕایەوە وتی سەریان لە قوربنێم واللە کەر بە جۆ بمرێت ئەمجا شەهیدە بۆ لەقە لە نیعمەتی خوا ئەدەن، ئەو بێزارییان لە درۆیە ئەمە مەکری ژنانی ئێمەیە بڕوامان پێ مەکەن.!!

* * *

## پەندی پێشینان

**من دانیشتووم لە یانەی وێرما،        تانە و بەیت ئەدەن بە گون و کێرما**

ڕۆژێك لە شارێك لەم کوردستانەدا خەڵکێکی زۆر دەوریان دابوو لە مزگەوتێك بوو بوو بە مقۆ و دەنگە دەنگ و پێکەنین، کابرایەك توورك پرسی ئەوە چییە؟؟ نەوار نەیۆخ، وتیان پیاوێك تەلاقی کەوتووە ژنەکەی مارە بە جاش ئەکەن. وتی چلۆن؟ وتیان ژنەکەی مارە ئەکەن لە پیاوێك بۆ چەند وەختێك لای ئەمێنێتەوە تا ئەمی پێ تەمێ خواردوو بکەن و سەرشۆر بێت ئەویش وتی: ئەمجا ژنەکە خەتای چییە؟؟ حق وایە مێردەکەی بدەن بە پیاوێکی مل قەوی چەند ڕۆژێك سواری بێت ئاوا سەر شۆر ئەبێت و تەمێ خواردوو ئەبێت.

*　　*　　*

### ڕووداوێکی سەیر:

کابرایەکی شوفێر تاکسی ئەبێت لە یەکێ لە شارەکانی ئەم کوردستانە ئەچێتە دەرەوە بۆ ئیشکردن. دوو ژن دەستی لێ ڕائەگرن کە هەڵیان بگرێت ئەمیش سواریان ئەکات، پێی ئەڵێن بڕۆ دەرەوەی شار ئەڕوات زۆریان ئەگێرێت بڕۆ بۆ ئەملا بڕۆ بۆ ئەولا بە کورتی پێی ئەڵێن ئەبێ بچیتە جێگایەك لەگەڵمان ڕابوێریت و پارەیشمان بدەیتێ ئەویش زۆر ڕجا ئەکات و باوکت چاك و دایکتان باش ئەم گوناە بە من مەکەن و من ئەم کارە ناکەم. ئەوانیش ئەڵێن ئەگەر نەیکەیت وا فیزاح ئەکەین و خەڵکت بەسەرا ئەچرین و ئەیوروژێنین بە ناچاری ئەڵێت چی ئەکەن بیکەن و بیڵێن ئەوانیش ئەقیژێنن هاوار ئەکەن خەڵکینە ڕزگارمان بکەن لە کابرای تاکسییە ئەیەوێت شەرەفمان پێشێل بکات ڕای ئەگرن و ئەی دەنە دەست پۆلیسی ئیجرام ئەوانیش ئەینێرن بۆ فەحس ئەمانیش ڕەوانە ئەکەن بۆ خەستەخانە و فەحس کردن کابرا فەحس ئەکرێت بە جۆرێ شتی خۆیان ئەنجام پزیشك ئەڵێ ئەم کابرایە شتی وای نەکردووە نەك هەر جەنینی لە نطفە یدا نییە و منداڵی قەت نابێت وبەرییە.. ئەمیش ئەڵێ بۆ خاتری خوا خۆ من دوو منداڵم هەیە کەوابوو هی من نییە ئەچێتەوە کەسەکانی خۆی ئاگادار ئەکات چاوەدێرێکی قورس ئەخاتە سەر ژنەکەی لە قافڵدا ئەیگرێت کە کابرایەکی بە خۆی فێرکردووە چەند وەختە و کابرا دەسگیر ئەکات، لەگەڵیا

ڕێك ئەکەوێت بۆی تەڵاق ئەدات بە مـەرجێ دیـزە بـە دەرخونـە و ئـەم مـارەی بکـات ئـەگینا هەردووکیان ئەکوژێت بەم جۆرە کۆتایی پێ هێنا.

*　　*　　*

ئەگێڕنەوە کابرایەك لە نزیك شاری سلێمانی لەسەفەر دێتەوە زۆر ماندوو ئـەبێت ئەیـەوێت بحەسێتەوە کەمێك کەڵەشێرێکیان ئەبێت زۆر ئەقوقێنێ بە تایبەتی کە ئەم چاوی ئەچێتە خـەو دەست پێ ئەکات ئەمیش لە داخا ڕاست ئەبێتەوە سێ بە سێ تەڵاق ئەخوات وای بکـوژم لـە دونیا کەس وای نەکوشتبێت پاشان بیر ئەکاتەوە چی بکات؟! دێت کەڵەشێرەکە ئەگرێت و دێت بۆ لای مەلای ئەو ناوانە، بەڵام نییە وەڵام ئەیگرێتە بن دەستی و دێت بـۆ شـار، لـە ڕێـوە لا ئەداتە چایخانەی علی سمایل و چایەك ئەخواتەوە بەیانی زوو ئەبێت خەڵکی چا خـۆر ڕووی تـێ ئەکەن: خالۆ ئەو کەڵەشێرە هی فرۆشتنە ئەڵێت نەخێر ئەڵێن بۆ دیارییە بۆ کێی ئەبەیت ئەڵێت باوکم وازم لێ بێنن ئەمە بەسەرهاتی هەیە. یەکێك قۆشمەی بەرەڵا ئەچێتە بن دەستی و ئەڵێت کوڕی حیز بۆ ناگێڕیتەوە پێمان بڵێ ئەویش ئەڵێت تەڵاقم لێ خواردووە وای بکـوژم کـەس لـە دونیا وای نەکوشتبێت ئەوا ئەچمە لای هەر مەلایێك چاکی ناکاتـەوە وا هێناومەتـە ئێـرە لای مەلای سلێمانی چارم بکات. کابرایش ئەڵێت چیم ئەدەیتێ من وای بکوژم لە باوکە ئادەمـەوە تا ئێستا ڕووی نەدابێت ئەڵێت بە قوربانت دەبم چیت ئەوێ حازرم؟ ئەڵێت برۆ نـەختێ ڕۆنم بـۆ بێنە لە کەوچکێکدا ئا ئێوەش چەقۆیەکم بـدەنێ، بـە مووسـێك سـەری کەڵەشـێرە ئەتاشـێت دەندوکی ئەبڕێت، پۆپنەو بەربینەی لێ ئەکاتەوە بە ڕۆنەکە سەری چەور ئەکات. هەروا ئـەکات دەرپێکەی دێنێتە خوارەوە سەری ئـەکات بـە قنگـی خۆیـداو لەسـەری دائەنیـشێت چـارەکە سەعاتێك، کاتێ ڕای ئەکێشێت تۆپیوە، ئەڵێت فەرموو باوکم کەس لە دونیا ئەمەی کـردووە؟ فەرموو تۆش حەقی من بدە. ئەڵێت چیت ئەوێت! نـەختێك حەشیـشە ئـەویش ئـەڵێت ئـەی بەسەر چاوان بۆی ئەکرێت...

*　　*　　*

مەلا ئەحمدی قسرتی وڵات　　بۆ شێخ و دەروێش بەخشەش و بەرات
بەم ناوە کچ و بێوەژن ترێن　　بە فرت و فێڵی دەروێشی بۆی دێن
وتوویە:

مەحبوبەیەك كچی دەروێش قادر خواز بێنیان كرد بۆ دەروێش نادر

پرچی درێژ بوو هەتا ناو شانی ئادابی تەوبەی هیچ نەئەزانی

تەوبەیان پێ كرد بە زۆرەملێ هەر ژنێك جوان بوایە ئەیرِوانییە قەلی

رۆژێ لە وەختی نیوەرۆیەكا گەیشت بە ژنێ لە ناو جۆیەكا

جۆ ئاوەنیا بوو وەختی قەف و گوڵ لەسەحرای بەینی نالان و حاسل

چوار دەوری روانی كەس دیار نییە نەیزانی تەوبە و تەریقەت چییە

وتی بە قوربان خۆت و پەرچەمت ئەبم بە فیدای دوكوڵمو دەمت

یەقین دروستە مرشد مەیلی هەس بەم ئاسانییە تۆم كەوتیتە دەس

وەختی بەدەستی گرتی دەستی ژن وتی تۆ لە عەرش دریاگی وە من

عەساكەی هەڵگۆت كردی وە پشتا دەسی هاورد وەبان عەساى سەرخشتا

تەزبیحی لول كرد نایە باخەڵی یەك سوورە عەساى كوتا ناو گەڵی

وەك سوورە ئەرخود هەرێمی خەرات تاش چڵمی فرێدا وەك لنگە كەلاش

پرچی وەك یاڵی یابودی عەجەمی هاتوچۆی ئەكرد لە دەوری دەمی

وەختێ ئەیهێناو ئەیكێشا و ئەیبرد لاسایی كەری بەچاكی ئەكرد

وتیان تۆبەت كرد وەك كەر ئەتزەران خاس نەتبردە سەر زەریفت دۆران

دەروێش وتی:

تەزبیح و عەسا كەشكۆڵ و بەرماڵ زیكرو ریازەت تەهلیلە و ئەحواڵ

هیچ كامیان لەزەت ئەمیانە نییە لەزەت ئەمە سا تۆ بەم بۆ چییە

پرچم ئەتاشم لای ئەبەم لە بێخ بەرماڵ قەد ئەكەم ئەینێرم بۆ شێخ

ئیتر ناچمە لای ئاموشۆی ناكەم بەڵكو بەدزی چیزی پەیاكەم

شیر باییت بدەم هەر تۆم دەس كەوی ئەم شەرت و قەولە نەدەم لە زەوی

گەر درۆ بكەم برا مردووبم كەوای توولی سەوز لەبەر كردووبم

گەر درۆ بكات برا مردوو بێ حەیتەی لە كوندا نێركە كاردوو بێت

لە كوز هەل پێچی وەك تەزبیحی شێخ هەر سەری سۆر بێت قەت ببێت بە میخ

کابرایەك مانگایەکی هێنابوو بۆ دێیەکیتر تا لەوێ کەڵی بدات لـەماڵێکـدا کـە گایـەکی چاکی هەبوو لەو بەهارەدا، جوانەگاو ملهور بوو هەرچەند هەوڵیان دا لەگەڵ جوانەگاکەدا هـیچ مرخی نەئەجوولا، پیرەژنێك دونیا دیدە لەوێدا بوو لە هەرزەکاریدا لە خێڵەکاتدا ژیا بوو، واتـە خێڵەکاتی پسپۆریان هەیە لە بە خێوکردنی ئاژەڵدا. وتی ئەگەر ڕێگام بدەن من کارەکـەی پـێ ئەکەم. وتیان فەرموو:

ئەمیش چووە لای جوانەگاکەوە دەستی کرد بە خوراندنی دەوروبەری قینگی گایەکە و جـار جار گەڵ و گونی گایەکەی هەڵ ئەگلۆفی هەر کاتێکیان زانـی راسـتەوە بـوو خـۆی کێـشا بـە مانگاکەدا کە بەکەڵ بوو پیاوێك دانیشتبوو کە دوو ژنی هەبوو،وتی میمکە پیرۆز دەخیلـت بم دەستم دامێنت کاری وا مەکە لەبەر چاوی ژنەکانی من و ئەمەیان فێر نەکەی ئـەگینا قیـنگم بەشەو ئەدرن بە هیلاکی رەشم ئەبەن هەر کەس بۆ بەختی خۆی ئەخورێنێ.

* * *

پیاوێکی هەڵەبجەیی کوڕێکی هەبوو رەشەی ساڵحە کوشتی بە ناحەق، لەبەر چاوی باوکیـا دایە بەر دەمانچە ئەمیش هەر ئەگریا و دوعای لێ ئەکرد خوا حەقی لێ بکاتـەوە هـەر ملـی قەوی ئەبوو ئەو ناوچەیەی هێنابووە تەنگ زیانی زۆری دا کەچی هـەر لـە ناکـاو حکوومـەت گرتی و کوشتی بە باوکی کوڕ کوژراویان وت رەشەی سـالحە کـوژرا ئـەوەتا بـا خـەڵك بـچێت تەماشای بکات وبیناسێتەوە ئەمیش هەر بڕوای نەئەکرد جـا کـە رۆیـشتە سـەر جەنازەکـەی راستبوو ناسییەوە، لە خۆشیدا نەیزانی چی بڵێت و چۆن شوکرو سوپاسی خوا بکات لە خۆشیدا دای لە چەپڵە و وتـی خوایـە "الـسلام علـیکم و رحمـة الله و برکاتـە " دوسـێجار وای وت و رۆیشت ئەی وت ئەی لەعنەت لە پیاو کوژو زۆردارو جاشـی خـۆفرۆش ئـای سـەگێکی نهـێن گیربوو ؟!.

جاشی خۆفرۆش بەشی وەهایە سووکە و بێ حورمەت ناگا بە پایە
ئەزەڕێ ئەترێ بە جووتە و لوشکە ناگات بە ئاوات با هەر خۆی فش کا

* * *

## " مامۆستا کزەڵ "

پێشکەشە بە مامۆستای بەڕێز "مەلا محمودی کزەڵ"

مامۆستا کزەڵ هەستیاری رەوان
شیعرت پەسەندی مەجلیس و دیوان
پەند و رووداو... یاداشتەکانت
مایەی ماندوێتی گشت کەشتەکانت
قسەی نەستەق و... چیرۆك و رۆمان
دێرینە ترن... لە مێژووی رۆمان
بۆ خۆ ولاتی و... بۆ دەستەی لاوان
حیکمەتی ژینن... بۆ چاکەی هەمووان
یادگارەکانت... ناسك و پاراوە
لە "کانی ژیری" هەست تا رواوە
بایەخ و بەهای مێژینەی هەیە
بۆ چەشەی خۆشی کەم وێنەی هەیە
هەرچەند لە ئاستی پایەی شاعیریت
من "شاگرد" ئەتۆ "مامۆستا"ی دیاریت
کاتێ خوێندمەوە هەست و سۆزی خۆم
ناخی هەژاندم... هانای هێنا بۆم
لەسەر خواستی خۆت ئەم هەندە خاڵە
دەخەمە پێش چاو نەیکەیت بە گاڵە
بۆ "رەوانبێژی" لە نوێ داڕشتن
بۆ زیاتر تام و... چەشە وەرگرتن
بە چاك دەزانم.. گەر مەیلت هەبێ
دیارە کە "چێژ"ی چەند زیاتر دەبێ
چۆن "گەوهەر فرۆش " نرخی "گەوهەری"

بەرز دائەنێ... وەك "تاجی سەری "
بۆ پاکژ کردن... بژارت بە دڵ
دڕك دەربێنێ .. لە روومەتی گوڵ
با تۆز و گەردی سەر روخسار بسڕێ
بێ مایە "پەردەی نەزاکەت" نەدڕێ
هەرچی دووپاتەو... پێشتر وتراوە
یان لە کەشکۆڵ و دیوان نووسراوە
پێم باشە کەوا... دووریان خەیتەوە
تا ماندوو نەبی و... بحەوێیتەوە
چی بیرەوەری و دیار و یادگارە
بەجیا تۆمارکەری نرخی خۆی دیارە
ئەوەی کە زادەی کەسانی ترە
دوور لە رۆڵەی خۆت بەجیا رایگرە
"وشەی بێگانە" و... تەم و مژاوی
چاکتر وەهایە.. بەزەوقی شیرین
پێنووست تاودە.. بۆ کوردی نووسین
بە کوردی و... کورتی چەشنی دێوانە (+ +)
بە ئەوینەوە پەروانەی شەم بە... (+ + +)
کەمانی "شاعیر" "شیعر و دێوانە"
کز کز بسووتێ و ئێجگار بێ خەم بە
لە یادت نەچێ "بەروار" و "مێژوو"
کە "تۆمار" ێکە بۆ ژینی پێشوو
ئەمانەی وتم... وەك وەفاو ئەمەك
وۆر چاك بیان دە لە "سەنگی مەحەك"
ئەو سا تێدەگەی چەند بە پەرۆشم
بۆ کزی شیعری "کزەڵ " "خامۆشم "

۱۹۹٦/٤/۱۹ / گۆران

- کەشکۆڵ: مەبەست لە "کەشکۆڵی کەلـەپووری ئـەدەبی کـوردی "یـە کـە لەلایـەن ماموستا "محمد علی قەرەداغی"یەوە تاکو ئێستا ئەوەی من بزانم سێ بەرگی لێ لە چاپ داوە کە شیعر و بەسەرهاتی زۆر لە شاعیرانی تیا نووسیوە.
- دێوانە: مەبەست لە شاعیری ناوداری کورد "وەلی دێوانەیە ".
- شەم: دڵدارەکەی وەلی دێوانەیەو... هەردووکیان لە تیرەی "کەماڵەیی" جافی مورادین.

لەتەك ڕێزو هیوای تەمەن درێژی بۆ ماموستای هێژاو ئەدیبی پایە بڵند "ماموستا مەلا محمودی کزەڵ " داواکاریشم لە یەزدانی مەزن یارمەتی دەرت بێت بۆ کۆکردنەوەی سـەرجەم شیعر و نووسینەکانت لە " دیوانێکی قەشەنگ " دا و بە چاپ گەیانـدنی بابەتـە زانسـتی یەکانت چ خۆماڵی و چ ئەوەی وەرتانگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی یاخوا هەر شـادو خۆش حاڵ بن.

١٩٩٦/٤/٢٢ / گۆران

* * *

## بە کێری خۆم دوژمنی خۆم گا

کابرایەك هەبوو پێیان ئەوت فلانە ژن بێنـە ئـەی وت زۆر هـارە پێـی نـاوێرم، برایەکـەی خواستی ئەم کۆستی کەوت، براکەی مرد بێوەژن کەوت وتیان بیهێنە وتـی پێـی نـاوێرم لێـی ئەترسم لە هەقی نایەم، کەچی لە ناکاو مارەی کرد وتیان خـۆ تـۆ وتـت مـارەی ناکـەم قیـنم لێیەتی ئەمەت لەچی بوو، وتی سەرم مەیێشێنن سەرکۆنەم مەکەن خـۆ مـن بـە کێـری خـۆم دوژمنی خۆم گا هەرچی ئەکات با بیکات.، خۆزگە هەموو دوژمنێکی خۆم ئاوا ئەگا.

* * *

جاران یەکێك حوکمی ئیعدام بدرایە مەلایان بانگ ئەکردە سەریٚ و تـەلقینی ئـەدا ئەگـەر گاور بوایە قەشەیان بۆ بانگ ئەکرد، هەروا حەزی لە هەرچی بکردایە لە خواردن بۆیان ئەهێناو پرسیان لێ ئەکرد، کە لێیان پرسی لە یەکێك لە حوکم دراوەکان مەلا پێی ئەوت بڵـێ کـەباب بڵێ کەباب.

* * *

## خەتەنەیەکی زۆر سەیر:

لەم چەند ساڵەی دوایەدا دوو ژنی عەیاری دزی مەکراوی ئەچنە لای پزیشکێکی نشتەرگەر "جراح" پێی ئەڵێن جەنابی دکتۆر ئێمە مەسیحین ئیسلام بووین خاو خێزانمان، برایەکمان هەیە ئەویش ئیسلام بووە ئەبێ خەتەنە بکرێت لە ئایینی ئیسلامدا وایە، ئەم برایەمان زۆر ترسنۆکە و پێی شەرمە جا ئەگەر جەنابت کارێکی وا بکەی پێی نەزانێ و خەتەنەی بکەیت جا هەرچیت ئەوێت بەسەر چاوان و مەمنونیش ئەبین، ئەویش وەڵامیان ئەداتەوە قەیناکات ئێمە دەرمانی بێهۆشی لە گلاسێك ماستاودا ئەدەینێ و بێهۆش ئەبێت و ئێمەش خەتەنەی ئەکەین هەر هیچ ترسی تیا نییە هەڵ ئەسن ئەرۆن لەم لایشەوە ئەچنە لای کابرایەکی زێرەنگگری مەسیحی و پێی ئەڵێن ئێمە لەلایەن فلان ماڵە دەوڵەمەندەوە هاتووین کچ ئەدەین بە شوو ئەندازەیەك خشڵی ژنانەی بە نرخ هەڵبگرە، با بچین بۆ ئەوێ هەڵبژاردەی تیا ئەکەین و زۆریشمان ئەوێ بۆ بووك و خزم و کەسی خۆمان ئەویش بایی نزدیکی (٣٠٠٠٠٠) هەزار دینارێکی بێگانە هەڵئەگرێت و ئەیپێچێتەوە لە جانتایەکی دبلۆماسیدا و لەگەڵیان سواری قەمەرە ئەبێت و ئەیهێنێ تا ئەگاتە لای دکتۆر پێی ئەڵێن فەرموو با بچینە لای دکتۆرە کە بڕوانامەی بووك و زاوای لایە بمان داتێ و وەری ئەگرینەوە. بە کورتی سەری ئەخەن خێرا دکتۆر یەکێ گلاسێك شەربەتیان ئەداتێ و کابرا بێ هۆش ئەکەوێت و ئەیفرێنن بۆ ژووری نەشتەرگەری، ئەمانیش جانتا هەڵ ئەگرن و بۆی دەرئەچن، کاتێ کابرا خەتەنە ئەکەن دێتەوە هۆشی خۆی ئەڵێت ئەمە چییە؟! دکتۆر ئەڵێت ئەلحمەد والله ئیسلام بوویت لێت پیرۆز بێت. هاوار ئەکات کوا جانتاکەم ماڵم وێران کراوە کەی من ئیسلام بووم دکتۆر ئەڵێت سامن حەق دەستی خۆم هەر ئەوێت ئاوا خەتەنەی ئەکەن و خشڵ و ئاڵتونی ئەبەن.

* * *

کابرایەك دێتە لای جامبازێکی چیواری دزی فێڵاوی ئەڵێت گایەکم ئەوێت نە زەرد بێت و نە سوور و نە رەش و نە بۆر و نەسپی، نەکورت و نە پان و نە درێژ، نە قەڵە و و نە زەعیف و لاواز. ئەویش ئەڵێت باشە وەرەوە بۆی بەلام نە جمعە و نەشەممە و نە یەك شەممە و نە دووشەممە و نە سێ شەممە و نە چوار شەممە و نە پێنج شەممە ئیتر هەر کاتێك هاتیت وەرە ماڵی خۆت حازرە مبارەکت بێت بیبە.

پاش هەفتەیەك دێتەوە بۆ گایەك داوای لێ ئەكات ئەڵێت ئەمڕۆ شەممەیە نەم وت ڕۆژی شەممە مەیەرەوە بۆی یەك شەممە ئەچێتەوە بۆی وای پێ ئەڵێت تا هەفتەكە تەواو ئەبێت لێیان ئەبێت بە دەمە قاڵە و ئەچنە بەر دادگاو داوەر، داوەر كاتێ گوێ لە هەردووكیان ئەگرێت تێ ئەگات هەردووكیان دەسبڕو تەشەقەڵەچین ئەمر ئەكات وا بڕیارم دا بیان بەن بیان بەستنەوە بە لوولەی دركو بەیكوڵ و دڕكە زیپەوە بە روتی بەسەر غل ببنەوە، جا بەر كابرای خاوەن پارە بكەوتایە ئەیوت هەر ڕەنگێك بێت ئەمەوێت زەردە سپییە رەشە قەیناكات لاواز بێت یا قەڵەو. كە بەر كابرای جامباز ئەكەوت ئەیوت باوكم هەر ڕۆژێك دێیت وەرە بیبە لە ڕۆژی شەممە تا ڕۆژی جومعە وەرە حازرە.

* * *

**دزی و خەتەنەی سەیر:**

شەوێك كابرایەكی دزی گەنج دەرفەت ئەهێنێ لە ماڵێك ژنێكو منداڵێكی لێ ئەبێت، كە ئەچێت ئەمیش بە خێراتنی ئەكات و پێی ئەڵێت منیش زۆر حەز ئەكەم هاتی، چونكە زۆر قینم لە مێردەكەمە خۆشم ناوێت وەرە منیش یارمەتیت ئەدەم ماڵەكەی بۆ ئەپێچێتەوە هەمووی بۆ حازر ئەكات. ئەمجا تۆ برا برسیت نییە با هێلكە و ڕۆنێكت بۆ بكەم ئەویش ئەڵێت باشە. تێری ئەكات و پێی ئەڵێت ئەی حەزت لە رابواردن نییە چش پیاوەكەم لێرە نییە بەشی تۆیش ئەكات دەی حازر بە ئەڵێت بەڵێ حەزی لێ ئەكەم ئەڵێت دەی دڵنیابە بێ ترس، بەڵام پرسیارت لێ ئەكەم تۆ خەتەنە كراویت ئەڵێت بەڵێ پێی ئەڵێت بۆم بگێرەوە، ئەڵێت كاتێك تەمەنم (٧ — ٨) ساڵان بوو دوو ڕۆژ ئاهەنگ و شاییان بۆ كردم ئەمجا بەربەریان هێناو خەتەنەیان كردم ژنە ئەڵێت پێی ئەی نەت ئێشا وتی بەرێ واللە وەختبوو گیانم دەرچێت تا هەفتەیەك ئەمجا چاكبوومەوە. ژنەكەیش وتی با منیش خەتەنەی خۆمت بۆ بگێرمەوە ئەمجا ئاهەنگ و رابواردنەكە دەست پێ ئەكەین، ئاوا كچۆڵە بووم دوو سێ ڕۆژ مقۆ مقۆ كەوتە ناو خێزانی ئێمەوە كاتێك ژنێكی رەشتاڵە هات بە خۆیو گوێزانێكەوە منیان گرت و دەستی كرد بەناو گەڵماو مێتكەیان بڕیم و هاوارم كرد و گریام: خەڵكینە فریام كەون هاوارە یا شێخ كاك ئەحمد و تەراتەوەن و بەرو دراوسێ هاوارە فریام كەون كە ئەی قیژان بەروو دراوسێ لێ كۆبوونەوە دونیای شڵەژان لەو شەوەداو كابرای دزەیان گرت بەو شەوە خەڵكی كۆڵان بڕیاریان دا ماكەرێك بێنن بەزۆر پێی بگەیێین ناچاریان كرد ژنە چووە بن دەستییەوە پێی وت ئەمەیە خەتەنە كردن، ئابڕوو تكاو خۆت ئەی كاكە كەی دێیتەوە ئەمیش وتی كەی حەزم لە كەرگاین

بوو ببمە گاڵتەجاری ژن و پیاو گەورە و بچووك ئەوا دێمەوە ئەگەر نامووسم هەبێت جارێتر دزی ناکەم و گەوج و حەیاچوو بم.

*　　*　　*

**شێخ عومەری سەید ئەحمد بۆی گێڕامەوە**

جارێك مدیر ناحییەك نەقڵی خورماڵ ئەبێ و دەستی هەتیو بازی ئەبێ پاش چەند رۆژێك فەراشەکەی بانگ ئەکات و ئەڵێ شتێکی وام بۆ پەیدا بکەیت، کابراش ئەڵێ کاری وا ناکرێ و نابێ و ئەم ناحییەیە ئەمجۆرە شتانە بە کفر ئەزانن، بەڵام فائیدەی نابێ و جەنابی مدیر ناحیە هەر لەسەر حسابی خۆی کابرای فەراش تەنگە تاو ئەکات کابرای فەراش چاری نامێنێ و ئەڵێ چاك وایە ئافرەتێکی بۆ بەرم بە جەنابی مدیر ئەڵێ قوربان ئافرەت هەیە با بۆت بهێنم مدیر بەگ ئەڵێ ئاخر من ئارەزووی پاش ئەکەم فەراش ئەڵێ قوربان بە پاش بچۆرە لای ئەڵێ نابێ، چونکە لە کاتی گان کردنا حەز ئەکەم یاری بە گەڵ و گونی بکەم، فەراش جا باشە قوربان من ئافرەتە مەکوڵ دەست بخە گەڵ و گونی من.

*　　*　　*

**هەر شێخ عومەر بۆی گێڕامەوە:**

ژنێك کچەکەی ئەدا بە شوو پاش هەفتەیەك ئەچێتە سەردانی کچە سەیر ئەکات کچەکەی زۆر لاوازو بێ تاقەتە ئەڵێ کچم بۆ وا زەعیف بووی ئەڵێ هیچ نییە ئەڵێ پێم بڵێ لەگەڵت خراپن ئەڵێ نەخێر زۆر لەگەڵم باشن خوا هەڵناگرێ بەم جۆرە سێ چوار جار ئەچێ بۆ لای کچە جار لەگەڵ جار زەعیف ترە ئاخر جار بە کچەکە ئەڵێ کچم پێم بڵێ بۆ وات بەسەر هاتووە راستم پێ نەڵێیت خۆم ئەکوژم ئەڵێ بەخوا لەگەڵم خراپ نین ئەڵێ ئەی بۆ وات لێ هاتووە ئەڵێ بەخوا پیاوەکەم هەر ئەڵێ ژن ئەهێنم دایکی ئەڵێ ئۆی کچم گوێی مەدەرێ بەخوا باوکە گۆڕ بە گۆڕەکەشت هەتا تۆپی هەر ئەو گوەی ئەخوارد.

*　　*　　*

ژنێك کچێکی ئەبێت ئەیدا بە مێرد، هەر بەینێك نا بەینێك ئەچێت بۆ دیدەنی کچەکە لە شەوق و زەوقدایە. تەماشا ئەکات مێردەکەی بانگی دەکاتە ژوورەوە کچەیش خەریك و مشغولی شتێکە پاشان شتێکی دۆزییەوە وەکو پینە وابوو، پەرۆو پاتاڵی تێکرابوو بردییە

ژوورەوە لەگەڵ خۆی چوو بۆ لای پیاوەکە و دەستیان کرد بە نیخە نیخ و مـشەمش دایکیـشی چاوەڕێی ئەکردن پاشان لێ بوونەوە بەرەودوا هاتنە دەرەوە، دایکی لە کچەی پرسی ئـەوە چـی بوو بردتە ژوورەوە پێکەنی و وتی دایکە هیچ نییە نەخێر زۆری لەسەر رۆیـشت و وتـی ئـەبێت پێم بڵێیت، وتی دایکە ئەوە بۆ ئەوە پێی دروستکردووم کە بیخەمە ژێر سمت و کلۆکم لـەکاتی جیماع کردندا تا سمتو گەلم بەرزبێتەوە و پیاوەکەیشم باش ئێرەق ئەبێت و بگـرە سـامتینێکی نامێنێتەوە و هەمووی ئەکاتە ژوورەوە دایکی وتی وەك باوکە تۆپیوەکەت بەلەحنەت بێت واللە تا ئێستا (٢٠) بیست هەزار سانتیم کێر قەرزاری منە وەکە هەمووی نەئەبردو راناوەسـتا کـە منیش بکەومە کوت وەشاندن لە ژێرەوە.

* * *

یەکێك لە خەلیفەکانی عباسی فەرمانیدا کە هەرچی حیز و دوودەکییە ئـەبێ بخەسـێنرێن. بەڵێ زۆریان خەسێنران رۆژی یەکێکیان تەوبەی کردبوو نوێژی ئـەکرد لـە دوای ئیمامـە عـسر بایەکی لێ بەربووەوە، وتی حمد و ثنـا بۆ خوا.. بەسەرو بە خوار هەر شکرانە ئەبژێرمەوە حمدی پێ ئەکەم بۆ ئەکەم.

* * *

چاکێك هەبوو مەزاری یەکێك بوو لە پیاوچاکانی زیارەتگا بوو شـێتو هاریـان بـۆ ئـەبرد خانوویەکی بەسەرەوە کرابوو دەرگاو کلۆمی چاکی پێوە بوو گەنجێکیان هێنـا کردیانـە ژوورەوە بەس زۆر شێت بوو. دەستی ئەوەشان پاش مەغریب کچێکیانیش هێنا کردیانە ژوورەوە، سـەیر ئەوە بوو بەیانی رۆیشتن کە هاتنە دەرەوە هەردووکیان چاك بووبوونەوە بە تەواوی و کردیان بـە ژن و مێرد و لێکیان مارە بڕین.

* * *

### دوو دەکی ئاوا دەبێ

گەوادێك هەبوو ژن و پیاوی رێـك ئەخـست و ئەیدۆزینـەوە بـۆ یـەکتری رۆیـشتە لای بێوەژنێك لەوانەبوو پێی وت پیاوێکت بۆ دێنم ئەم شەو، بەڵام ئەو یەشـتا ژنـی نـەدیوە، تۆیش بەم خرو خرپنە ئەوەندە ئاوت پێ فرێ ئەدات و قێزی لێت دێتەوە چاکوایە نەختێك گەرم و گوریت دامرکێتەوە وا بەباش ئەزانم قولێك هەیە بـا پێـشەکی جارێکـت بگێـت،

بەڵکو کابرا قیزی نەشیوێت زۆری پیٚ وت وای لیٚکرد هاتە سەر ئەو بڕوایە، بەلاّم وتی نابیٚت ئەو قولە رەشە بیٚت وتی باشە ئەگەر رازیت با خۆم لە پیٚشدا سوارت ببم وتی باشەو وای لیٚکرد، ئەمجا رۆیشتە لای کابرا وتی پیٚی تۆ بەم هەموو تیٚك سمراوییەوە کە تا ئیٚستا کەست نەگاوە ئەو ژنە ناسك و نازەنینە خۆی پیٚ راناگیریٚت تۆ ئەم هەموو ئاوی شەهوەتە بکەیتە ئەوەوە. وتی ئەی چی بکەم وتی قولە رەشیٚکت بۆ دیٚنم سواری ببە جاریٚك باش ئەمجا ئەتبەم بۆ لای ژنەکە زۆری لەگەڵ وت پیٚی سەلماند وتی قیٚزم نایە ئەو قوولە رەشە بگیٚم وتی باوکم لەبەر خاتری تۆ باشە لە پیٚشەوە من بگیٚ ئەمجا بچۆ بۆ لای ئەو بەویش خۆی بەگانداو پارەی لە هەردووکیان وەرگرت.

* * *

مەلایەك لە مەلا چاکە ناوبانگدارەکانی ئەم شارە وانەی بە فەقییەك ئەوتەوە، بەلاّم هیچ تیٚ نەئەگەیشت، واتە کەو دەن بوو، رۆژیٚك دەرسی ئەخویٚند مامۆستا هەرچی هەولّی دا بیٚ سوود بوو تیٚ نەگەیشت، مامۆستا وتی پیٚی بیٚ قەزابیت ئەلّیٚت فلاّنە کەسیت کە لە لەکەکان بوو، یەکیٚك پیٚی وت ئەگەر ئەم مەتەلّە بزانیت؟ (کۆمەلّیٚك هیٚلکە لەبەر دەمیاندا دانرابوو) ئەگەر لەم هیٚلکانە دوانزە هیٚلکەی بخەیتە ناو چاکی کەواکەتەوە بۆ خۆتبیٚت هەر یەکیٚك لەمانە نیوەی ناوی سپییە نیوەکەی تری زەردە پیٚشت ئەلّیٚم کەرە هیٚلکەیە. وتی گوایە قوربان هەر نەیزانی؟ وتی نەواللە، نەیزانی وتی ئەوە گوە فەقیٚکە وتی قوربان هەر ئەوەلجار ئەمزانی کە گوە، بەلاّم زەردەکە لیٚی تیٚکدابووم ئەگینا بە واللە ئەم زانی مەلا فەرمووی دەوەرە ئەم گەلحۆیە تیٚبگەینە، وتی بە گەلحویش ئەلّیٚن گوایە کامیان راستە مامۆستا.

* * *

ژنیٚك پیاوەکەی بە زۆر ئەنیٚریٚت بۆ مزگەوت بەمەرجیٚك رۆژانە هەرچی لە مەلا بیست بیگیٚریٚتەوە. رۆژیٚکیان هاتەوە وتی مامۆستا وتوویە هەر کەسیٚك شەو بچیٚتە لای ژنەکەی ئیشی شەرعی لەگەلّدا بکات قەسریٚکی بۆ ئەکەن لە بەهەشتا، ژنەکەی وتی دەیبا خەریکی قەسر کردن بین. یەکیٚك ئەکەن بۆ پیاوەکە ئەبیٚت ئەیکەن بە دوو بۆ ژنەکە ئەبیٚت پیٚی ئەلّیٚت هەلّسە قەسریٚکیش بۆ دایك و باوکت بکە ئەویشی پیٚ ئەکات، پاشی ماوەیەك درەنگانیٚك

ژنه دەست ئەکات بە گریان پێی ئەڵێت ها ژنەکە بۆچی ئەگریت؟ ئەڵێت بۆ باوك و دایکم کەسیان نەبوو خێرێکیان بۆ بکات، ئەویش ئەڵێت ها ئەوە وەستاکەیە خۆت چی پێ ئەکەیت بیکە من هیچ هێز و توانام تێدا نەماوە. دەستی ئەگرێت و ئەیخاتە سەر حەیتەکەی ئەڵێت چی پێ ئەکەیت کەیفی خۆتە.

❊ ❊ ❊

گێرایانەوە کابرایەك ژنێك تاو ئەکات بەهەر حیلە و فڕ و فێڵێك بوو، وەختی ڕۆیشتە ناو گەڵی و لێی بێتە کار هیچ بوو هەرچی هەوڵی دا و هەڵی گلۆفی سەر فڕو دەم پان بێ سوود بوو، ژنەکە وتی هەستە لاچۆ هەی بێ بەخت کەوات ئەزانی بۆچی خۆت روو زەرد کرد؟ ئەویش وتی بێ بەخت و هەناسە سارد ئەوەیە دەمی جەواڵەکەی کردووەتەوە دوو کاتژمێرە هیچی بۆتێ نەکرا بچۆ بەختی خۆت بخوێنەرەوە بزانە بۆچی بەختت بەسراوە جادووی لێکراوە.

❊ ❊ ❊

خوێنەری ڕێزدار چاکە لای گاورەکان مسیحییەکان ئیعتراف هەیە بە سکوکی غفران کە کڕینی بەهەشت بە هەندێك پارەو لێ خۆشبوونی تاوانەکانی بەو پارەیە ئەوەیش ساڵانە قەشە ئەیفرۆشێ کە پاپای گەورە (الحبر الأعظم) دەسەلاتی وەکالەتی بۆ ئەنێرێت.
قەشەیێك لە جێگایەکیترەوە دێت بۆ زیارەتی ئەم لە کەنیسە لای میوان ئەبێت خاوەن بە قەشەی میوان ئەڵێت من بە سەفەر ئەڕۆم ئەبێت کاروباری ئیعتراف ئەنجام بدەیت، ئەویش ئەڵێت باشە کەچی بۆی ڕێك ناکەوێت بڕوات بەیانی کەنیسە ئارایشت ئەکەن و ئەیڕازێننەوە چێشتەنگاو ژووری قەشەی ڕاستی دائەنیشێت بۆ فرۆشتنی سکوکی غفران و ئیعتراف یەکێك دێتە ژوورەوە لەبەر دەم پەردەی إعتراف دائەنیشێت قەشە لەو دیو پەردەکەوە دانیشتووە، وێنەی حەزرەتی عیساو مریم پەردەکەی پیرۆز کردووە.
قەشە ئەپرسێت دەی إعتراف بکە — فلان کەس -... چیت کردووە لە گوناهو لە تاوان ئەڵیت: هەندێك پارەم لە پیاوێك دزیو پاساوم دا کە ئەمیش نەبوو ئەڵێت چیتریش کچێکیشم گا، چی تریش وای ئەزانی قەشەی ڕاستی سەفەری کردووە، ژنی قەشەی خۆیشمانم گا جارێکیان ئەی چیتریش ئەڵێت کچەکەیشم دووجار گا، ئەڵێت دەی دانی پیا بنێ ئەڵێت کوڕێکی قەشە جوان بوو ئەویشم والێکرد ئێستا تۆبە ئەکەم، ئەڵێت جاری تۆبە مەکە.

پەردەکە بەرز ئەکاتەوە سمت و کلۆکی خۆی بۆ ئەخاتە ئەو دیوی پەردەکە و ئەڵێت هەر من ماوم تووخوا منیش بگێ ئەوجا هەردووکمان تۆبە ئەکەین.

* * *

ئەمە دوعای دووپشك پێوەدراوە چاك ئەبێتەوە نازانم چ زوبانێکە: (٧) جار ئەخوێنرێت و بە دارێك مەسح ئەکرێت: جرینی جرینا جبرنا کلتن کپوتر کەر قیب چیالتا. کەچی وا باوە لە ناو خەڵکی لادێدا ئەبێ دووپشك پێوەدراو کۆمی بە رۆن چەور بکات چاك ئەبێتەوە، بەڵام راستە بە میزی منداڵ بشۆرێت ژانی ئەشکێت یا بە ماست گەرم بکرێت یان بە دۆ پێی بشۆرێت ژانی ئەشکێت، ماستەکە پێ چەور ئەکرێت.

* * *

**قەشە مارۆن گاور ئەخاتە جەهەنەمەوە:**

دوو پیاوی مەسیحی هەریەکە مانگایەکیان گوم ئەبێت بۆ مەخسەرە هەردووکیان لەیەك ئەچن، لە وێڵیدا پیاوێك مانگایەکیان ئەگرێت و سەری ئەبڕێت و گۆشتەکەی ئەفرۆشێت، ئەویتریان خۆی ئەکات بە کەنیسەدا هەردوو خاوەنەکە شەرعیان بردە لای قەشە مارۆن قەشە وتی برۆن بەیانی زوو بێنەوە بۆ ئێرە، یەکێکیان بێ لانەو بێ جێگا ئەبێ و دووریش ئەبێت ئەچێت لەلایەکی حەوشەی کەنیسەکە کسکۆڵە ئەکات تا رۆژی لێ ئەبێتەوە شەو کاتی بەری بەیانی قەشە دێتەدەر سەیرێکی ئاسمان ئەکات و ئەچێت دائەنیشێت چاوی بە یەکێك لەوانەی کچن تەرکی دونیایان کردووە دەرو ژوور ئەکات دێت بۆ لای قەشە مارۆن ئەڵێت ئەوە چی ئەکەیت؟ ئەڵێت ئەمەوێت گاورێك بخەمە جەهەنم ئەڵێت گاور کامەیە؟ ئەڵێت بڕوا کۆشی هەڵ ئەداتەوە هینەکەی ڕەپکردووە سوور هەڵگەراوە. ئەمە گاورەکەیە ئەڵێت ئەی جەهەنەمەکە کامەیە؟ ئەڵێت وا لە ناو گەڵی تۆدایە وەرە پێشەوە پێی دائەکەنێت و خۆی پێدا ئەدات کە ئەگاتە خۆشی راهیبەکە ئەڵێت ئەو گاورە هەر دەرمەهێنە با هەر بسوتێت، قەشە ئەڵێت هەموو شەو وەرە هەر گاور ئەسووتێنین بەیانی کابرای تریش دێت گوایە مانگای بدەنەوە هەردووکیان لای قەشە یەك ئەگرنەوە قەشە ئەڵێت بۆ زوو نەهاتی؟ ئەڵێت هەروا پیا گەیشتم بەویتر ئەڵێت تۆ بۆ؟ ئەڵێت قوربان من زوو هاتم تەماشام ئەکرد یەشتا تازە خەریکبوو

گاورەکە بخرێتە دۆزەخەوە من لە پشتەوە تەماشام ئەکرد قەشە ئەڵێت بەراستی تۆ خاوەنی ئەو مانگایەت فەرموو برۆ بیبەرەوە و هی تۆیە بە حەزرەتی مەسیح...

*　　*　　*

پادشایەك ئەبێت لە کۆندا، لەگەڵ ژنەکەی دائەنیشێت ئەمیش گلەیی لێ دەکات کە پادشا هەرگیز بە قسەی ژنەکەی ناکات لە خێر و چاکەشدا لەو کاتەدا پیاوێك دێت ئەڵێت ئەچمە خزمەتی پادشا، پادشایش فەرمان ئەدات با بێتە ژوورەوە کە دێت سلام و رێز پێشکەشی پادشا ئەکات ئەڵێت گەورەم ماسیێکی چاکی باشم بە دیاری بۆ هێناوی ئەویش فەرمان ئەدات لێی وەربگرن. هەزار دیناریش بدەنێ کابرا سوپاسی پادشا ئەکات ژنەکەی پێی ئەڵێت بۆ ئیسرافت کرد بە پێنج دینار ماسیێکی لەمەچاکتر ئەکریت وتی جا چی بکەم،؟ وتی پادشا سەلامەت بێ بانگی بکەرەوە پارەکەی لێ بسێنەوە و پێی بڵێ بۆ بیانوو ئەم ماسییە نێرە یا مێیە؟ ئەگەر وتی نێرە بڵێ من مێم ئەوێ بیخۆم. ئەگەر وتی مێیە بڵێ من نێر ئەخۆم پێم ناوێت، ئەمری کرد بانگی بکەنەوە گەڕایەوە لێی پرسی ئەم ماسییە نێرە یا مێیە؟ وتی قوربان خونسایە هەم نێرە و هەم مێیە. پادشا فەرمانی هەزار دیناری تری بدەنێ، کە وەریگرت دینارێکی لێ بەرەوە بوو دانەوییەوە هەڵی گرتوو ماچی کرد، نایە سەر چاویەوە وتی الحمدلله رۆیی شاژن وتی قوربان تۆ هەزار دیناری ترت زیانکرد، بانگی بکەرەوە لێی بپرسە بۆچی نەفسی نزم بوو با وازی لێ بهێنایە هەژارێك هەڵیبگرتایە، بۆ ئەوەندە چنۆکبوو. پادشا بانگی کردەوە پێی وت تۆ بۆچی بۆ دینارێك دانەویتەوە نفس نزم بوویت؟ ئەو دینارەت هەڵگرتەوە با بەجێت بهێشتایە هەژارێ هەڵی بگرتایەتەوە؟ وتی گەورەم لەبەر پارەکە نەبوو، لەبەر ئەوەی ناوی بەرێزتان توورە بوو هەڵکەندرابوو لە رووی دینارەکە پێم ناخۆش بوو خەڵکی پێی پیا بنێ و بەسووکی بزانرێت، هەڵم گرتەوە ماچم کردوو نامە سەر چاوم پادشا ئەمری کرد هەزار دیناری تریشی پێ کەرەم کەن و فەرمانی دا بە شاردا جار بدرێت بگرە مەلاکان لە مزگەوتیشدا بلاوی بکەنەوە:

هەر کەسێ بە قسەی ژن بکات سێ جار زەرەر ئەکات، تەجروبە کراوە!!!.

*　　*　　*

کابرایەك ئەبێ زۆر هەژار و بێ دەرامەت ئەبێ دێت بە خەیاڵیدا (١٠) شەوێك بچێتە مزگەوت و زیکر و دوعا بکات، بەڵکو لەو هەژارییە رزگاری ئەبێ، کەچی هیچی دەس

ناکەوێت. سەری خۆی هەڵئەگرێت ئەڕوات تا ئەگاتە ناو دۆڵ و شاخێك لە لایەکەوە گیڤە گیڤی باو لوورەی گورگ و دوڕندە و شەوێکی سامناك لە ترسا خەریك ئەبێت خۆی پیس بکات، ئەچێتە لێوارێك دەس بە ئاو بگەیەنێت، دارێکی بە دەستەوە ئەبێت لەگەڵ خەلکدا ئەڕوات و دەس ئەکات بە هەڵکەندنی بەردەمی خۆی زەوییەکە هەڵئەکەنێ، کەچی تەماشای شتێکی زەرد دەرکەوت نەك یەکێکو دوان و سیان هەمووی ئاڵتون ئەبێ سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێت یارەب تا گوت پێ نەکردم و نەم فێراند بە خۆمدا نەتدامێ.

* * *

شێخ لطیفی حەفید وتویە ئەم شیعرە گوایە لای شێخێك هەبوو زۆر توڕە بووە. قسەی لەکەس نەخواردووەتەوە جنێویشی ئەدا کە زۆر سەریان بخستایەتە سەر بە تایبەتی شێخ لطیف ـ ی حفید.

ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| شێخی ئێسك قورس چلکنی لچ شۆڕ، | گوێ دێڵ ناپەسند تسکنی قن قۆر |
| دائیم ئەگەڤی وەك سەگی ناو خێڵ | جار جاری ئەکەی مەکرو حیلە و فێڵ |
| زۆر عەیبە بۆ تۆ ناوی من دێنی | وەعد و پەیمانی خۆت ئەشکێنی |
| یا شێخ هەر ئەڵێی کەری ناو هۆزی | ماشاالله سەرو قەپۆزی بۆزی |
| بالاّ وەك داهۆڵ چەوتوو ناقۆلاّ | پاڵتۆی شەپوو شۆر دائیم لە قۆلاّ |
| کۆپانی لووری بکەرە کۆڵت | زاخ و بنێشتیش بخەرە دۆڵت |
| ئالۆشت ئەمرێ خالۆی موحتەرەم | بێ ئەدەب نەبم لەبن گونت بەم |
| خەلیفە شێخ عیسی لەقەب بەرزنجی | ئەبا بە قنگتا کێری هەشت ئینجی |

* * *

پیاوێك هەبوو رۆیشت بۆ سەفەر و پانزە شەوی پێ چوو کە هاتەوە هەندێك خورمای هێنایەوە بۆ منالەکانی و زۆریشی پەلە بوو منداڵەکان بنوون زوو، بە ژمارە هەریەکی هەندێك خورمای داپێیان وتی سەرتان داپۆشن یەك یەك بیخۆن دوودوو مەیخۆن، ها چاوتان دەردێنم خۆتان مات بکەن، وتی ژنەکە حازر بە کاری خێر بکەین و دەستیان پێکرد، یەکێك لە

منداڵەکان دوو دوو بەشی خوارد لە ژێرەوە روانی وا باوکی خەریکی دایکێتی، بە براکـەی وت کورە یەك یەك بیخۆ تا بروانە دایکم دوو دوو خواردوویەتی بزانم باوکم چی لێ ئەکات بـاوایش لە تۆ نەکات.

* * *

پیاوێك هەیە مەخسەرەیە لەگەڵ ژنەکەی، ئیشی بۆ ئەکات و بە قوربانی ئـەبێت لەگـەڵیا زۆر رێکوپێکە بەیانییەك هەندێك ئارد دێنێ و ئەیکا بە هەویر و ئەیدا بە کورەکـەی بیبـا بـۆ نانەوا بۆیان بکات بە نان، تومەز چاکی نەشێلاوە بە کورەکەی ئەڵێت بانگی دایکـت بکـە بـا پانی بکاتەوە کورە دێتەوە وای پێ ئەڵێت.: باوکی ئەڵێ بڕۆرەوە بڵـێ دایکـم بـۆ بـاوکم پـانی ناکاتەوە ئێستا بۆ تۆ چۆن پانی ئەکاتەوە؟..

* * *

**ئەم دادوەرییە لات سەیر نەبێت:**

کابرایەکی شوفێری سەیارەی گەورە چاوی بە دوو ئافرەت ئەکەوێت هەڵیان ئـەگرێت لـەلای بنکەی مرور تایەکی کون ئەبێت. دائەبەزێت تایەکەی بگۆرێت زۆر خـەریك ئـەبێت و مانـدوو ئەبێت، لە یادی ئەچێت ئەو دوو ژنەی لایە و هەڵیگرتوون، تەنگاو ئەبێت بایەکی گـەورەی لێ ئەبێتەوە تومەز یەکێ لە ژنەکان دڵی نەخۆشە، دەس ئەکـەن بـە پێکـەنین و ئـەیانگرێت ژنـە نەخۆشەکە بەرگە ناگرێت و ئەمرێت ئەمیتریان دەس ئەکات بـە قـژ رنینـەوە و هـاوارو رۆ رۆ کابرای سائیق ئەگرن بەندی ئەکەن لە گیراوخانە و ئەیدەن بە داداگـا، دادگـا خـوێنی ژنەکـەی بەسەردا ئەدات، چونکە سائیق نابێت بترێت ئای لەم دادگاییی کردنە..

**سەری شکابوو پێ ئەکەنی:**

لە دێیەکی دزەیی ناوچـەی شـەمامك فـەقێو مەدرەسـەی لێبـو سـوختەیەك هـەبوو ئەرۆیشتە ناو دێ بۆ نان و دۆ و پێویست لە نیوەڕۆیەکدا بێ پرسینەوە و لە دەرگادان خۆی ئەکات بە ماڵێکدا ئەبینێ وا خاوەن ماڵ خەریکی کاری خێرە روتـو قـوت ئەمـەیش لـە شـەرمەزاریدا ئەپەشـۆکێ و ئەگەرێتـە دواوە رێگـای دەرگاکـەی لێ ون ئـەبێت، سـەری ئەکێشێت بە دیوارێکدا زۆر بە قایم و سەری ئەشکێت و خوێن چاوی دائەپۆشێت و هـیچ

نابینێ دەس ئەکا بە پەلە کوتی، کابرا ئەکشێتە دواوە دەستی ئەگرێت بـە گـەڵ و گـونی رووتەوە، ئەڵێت لێرەوە برۆ ماڵ خەراب گووت کردە ئیشەکەی ئێمە، تۆیش سەر شـکانت پیرۆز بێت جا لەبەر پێکەنین نەی توانی وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە، تا چەند رۆژێك لە ژێر تەداویدا بوو و روویشی نەئەهات بچێت بۆ ئەو جێگەیـەی رووداوەکـە. هـای سـەیرە لـە هەمزە کۆری. هەرچی دەبینی دڵت دەتۆری!!!

* * *

## ژنێك مێردەکەی ئەدات بە دادگا

ژنێك هەبوو ناوی باجی خەندە بوو، چوو بۆ لای دادگا داوای لەسەر مێردەکەی تۆمار کـرد چونکە هەموو شەوێ میزی بەخۆیدا ئەکات ئەمیش ناتوانێ بۆی بـشوات داوای جیابوونـەوەی لێکرد. دادوەر کابرایان هێنا بۆ لای حاکم. دادوەر لێی پرسی تۆ عـەیب و شـوورەیی ناکـەیت میز بە خۆتا ئەکەیت؟ وەڵامم بدەرەوە.

کابرا هاتە وەڵام: جەنابی دادوەر من بەدەس خۆم نییە کە ئەنووم سواری حوشترێکم ئەکـەن ئەمبەنە ماڵێك لەو دیو گومبەزێکی گەورەی بەرزی لەسەر دروستکراوە، حوشـترەکە ئەچـێتە سەر گومبەزەکە منیش وام بەسەرییە لە نزیك ماڵەکەوە نیمـچە رووبارێـك هەیـە حوشـترەکە تینوویەتی لەسەر ئەو کومبەزە سەر شۆرئەکاتەوە ئاو بخواتەوە منیش زەنـدەقم ئەچـێت و لـە ترسا میز ئەکەم بە خۆما دادوەر وتی کابرا برۆ دەرەوە وا من خەریکم لە ترسا گوو ئەکـەم بـە خۆما. باجی خەندە وتی یاخوا ئێوە ئەوە بەشتان بێت چش لە من.

## بەرێز:

ئەگەر ئێمە بە چاوی رێز و بایەخ بڕوانین بە گەلەکەماندا ئەبینین زۆر دەوڵەمەندە لە فۆلکلۆرو نەختینەی کەلەپووری باو باپیرانمان کە جێیان هێشتووە بۆمان، بەلاّم بەداخەوە کۆنەکراوەتەوە و گشتیان خەریکە ئاسەواری گوم ئەبێت و نەمێنیٚ.

ئەم گەلی کوردە وەکو گەلانی تر هیچی کەمتر نییە لە زەکاو توانا و لێهاتوی. مەگەر کەمتەرخەمی و بیٚ قەوارەیی و خود دەسەلاّتی رامیاری، کە ئەمەیشە بەردی نەگبەتی کێشاوە بە ئەژنۆیا، لەنگ و شەلی کردووە بەرەو مەرگی کەساسی ئەبات.

ئێمە ئەگەر خوێنەوارمان هەر یەکە لەلایەن خۆیەوە شتێکی بنووسایە بە زوبانی کوردی لە گشت جۆرەکانی زانیاری و ژیان ئەمە حاڵی گەلەکەمان نەئەبوو وەکو ئێستا نەیبینین، دەستی بێگانە ماچ ئەکات رۆشنبیری هەندەران ئەکا بە پێشرەوی خۆی، بەلاّم رۆشنبیری زادەی نەژادی کوردەواری لەلانکی ولاّتا گۆشی ناکات و بیخەملێنیٚ و لە نەمان رزگاری بکات و ئەگەر وابکرایە ئێستا ئێمە لە خەڵکی سەرمایەدارتر ئەبووین هەر هیچ نەبوایە وەکو خەڵکی ئەبووین.

جاران پێش ئەوەی هۆیەکانی عیلم و زانیاری و تەکنیك بگۆڕێت و پێش بکەوێت بەم جۆرە سەرسووڕهێنەرەی ئێستا، ولاّتی کوردەواری ئێمە توانیویانە چاری نەخۆشی و ئازارەکانی خۆیان بکەن بە دەرمان و شتی سادەی پرو پیرەژن و هەندیٚ لێزان و پسپۆڕی دێهاتییەکان، ساڵی وا هەبووە بە هەزاران دەست و پیٚ ئەشکاو لە خرتەك ئەچوو، بەلاّم نەمان ئەبینی یەکێکیان پارچەیەکی لەشیان ببڕێتەوە و لە کاربکەوێت هەر خۆشی ئەکرایەوە بەهەر جۆرێك بوایە هەروایش گشت جۆرە نەخۆشییەکانی تریش بیٚ چارەسەر نەئەمایەوە ئەمەیش مانای وانییە زانیاری ئێستا بیٚ بایەخ و گرینگ نییە نەخێر مەبەستم ئەوەیە کەلەپووری گەلەکەمان نابیٚ پشتگویٚ بخرێت و بیٚ کەڵك تەماشا بکریٚ من لەو بڕوایەدام هەر دەردێك دەرمانێکی هەیە دەردی بیٚ دەرمان نییە، هەرشتیٚ لەم بوونەوەرەدا هەیە کەڵك و سوودی خۆی هەیە، ئەگەر دەستی زانیاری بگاتیٚ و پیاوی خۆی هەبیٚ بەکاری بێنیٚ وەکو پێشووەکان بەکاریان هێناوە.

منیش بە ناوی خواو پشت بە یەزدانی بێچوون دەستم کرد بە کۆکردنەوەی کەلەپووری دەرمانسازی کوردەواری بە پێی توانا هەوڵم داوە تۆماریان بکەم لە نەمان رزگاریان بکەم.

ولاتەکەمان زۆر دەوڵەمەندە لە درەخت و رووەکی خۆرسك شـاخەکانی رەنگـین و رازاندۆتـەوە کە سەرچاوەی دەرمانسازییە و هیچی لە ولاتانی تر کەمتر نییە ئەگەر دەستی مەرجی کارامـەی بگاتێ. بەداخەوە ئەڵێم ئێستا خەریکـە نـاوی درەخـت و گیـاو گـوڵ وەختـە لـەبیر بـچێتەوە و نەناسرێنەوە، هەروایش بارودۆخی رامیاری وایکرد لە کوردستانی رەنگین ببـێ بـە چـڵ و چـێوی پاشماوەی سەرە بزوتکی سوتاو و دێهاتە نیشەنەکانیش لە چێواری و ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵ کردن کەوتن وایان لێهاتووە ئەم گوڵ و درەختانە بەرەسەنی نەناسـنەوە چ جـاری ئـەوەیش گـەڕان بەسەر ملە و شاخ و دۆلا بەیەکجاری قەدەغەیە و گوندەکان وێران و خاپوورە. ئەوانەی پسپۆربوون لە دەرمانکردن و چارەسازی نەخۆش زانیارییەکەیان لەگەڵ خۆیان بردە ناو گۆرەوە کەمیان ماون.

* * *

## رێویش دوو شاخی هەیە:

لە پاش کۆی رۆژنامەی جمهوری ژمارە (٩٩) رۆژی (١٩٧٩/١٠/١٦)دا بلاوکرایەوە منیش بە دەستکارییەوە وەرمگێراوە و وەرمگرتووە. گایەك سەری بەرزکردەوە خۆی دییەوە وا لە نـاو کێڵگەیەکدایە پـان و بـەرین و فـراوان تـا چـاو بـڕ ئـەکات لەبـەردەمیا سـەوزی ئەشـنێتەوە لەوەرگایەکە پڕ لە شەورو گیا بەندی خاو میرگی بەرین لەوەڕو ئاو. بەخۆی وت:

ئەم لە وەڕگاو کێلگەیە تەنها هی خۆمە بەس من گیان لەبەرم لێرەدا بۆ خـۆم ئـەژیم لـەم میرگە پژۆنگەدا. رێوی پێی وت:

کەوابوو پێویست ناکات کەس بانگ کەیت بۆ سەر داواتی گژ و گیاو پووش ئەی گای رژدو رەزیل و بەرچاوتەنگ؟

گا سەری سوڕما کە رێوی ئەتوانێ و توانای ئەوەی هەیـە لـە خۆیـەوە ئەندێـشە و بیرۆکـە و خەیاڵ ئەخوێنێتەوە، رێوی ویستی ژەمەکانی خواردنی لێ تێك بدات و رایبکێشێت بۆ جەنگـەڵی گفتوگۆ کردن تا لە بیری بچێتەوە، مام رێوی رۆیشتە پێـشەوە لـە گـا و چـفانی (چـرپاندی) بـە گوێیدا وتی: ئەڵێن کۆمەڵی گایەل دەبەنگن و دەماخ پووچن، بەلام من بڕوام وانییە کە جـەنابتان لەوانە بن. گا لەم پیاهەڵدانەدا کە کتوپڕ بوو پێکەنی. وازی لەوە هێنا کە سڵی لێ بکات.

رێوی هەستی کرد کە وتەکەی وەکو ئەفسوون کاری کردووە و سەرپێچی و سەرکێشی پێـوە دیار نییە، وتی: من مریشك و ترێ بە دانم ئەخۆم تۆیش گیاو پووش بەددان ئەهاریت ئیتر ئـەم شاخانەت چ کەلکێکیان هەیە؟.

گایە: هەستی کرد وا لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی زۆر گرینگدایە، ویستی ڕێوی تێبگەیەنێت کە زیرەك و وریایە وتی: ئەگەر دوژمن پەلامارم بدات بۆ ئەو کاتەم زۆر بەکەڵکە: هەروایش نیشانەی جوان خاسی و تواناو هێزە. ڕێوی وتی پێم ناڵێیت چەند جار تووشی هێرش و پەلاماری دوژمن هاتوویت لەم دارستانەدا؟؟

گایەکە وتی: ڕاستە من لێرەدا ئەژیم بە تاقی تەنیا لە ناو ئەم پووش و گیاو بەندەنەدا، و ئێوە هەموتان گۆشت ئەخۆن و منیش کەس بەرگریم ناکا لەم کێڵگەیەدا.

ڕێوی پێکەنی و وتی: کەوابوو بۆچی شاخەکانت داناکەنی؟! گایەکە هەستی بە ترسێکی قووڵ کرد لەم پرسیارەی بەپەلە وەڵامی دایەوە: بەڵام بەڵگەو نیشانەی هێز و تواناﻣە ڕێوی وتی: ئەگەر شاخەکانت تووشی خۆرە کرمۆڵی هاتن کەڵك و هێزیان تیا نامێنێت!! بەلایەوە سەیر بوو ئەم وشەیە کە شاخەکانی تووشی خۆرەبن سەرباری ئەوەیش گایەکی زیرەکە شتێك شارەزایی هەیە لە بارەی کرمۆڵی ددان و ئازاری جومگەکان، بەڵام پێش ئێستا هیچی نەبیستووە لەبارەی ئەم نەخۆشییە خۆرەو هەڵوەرینی شاخ: ڕێوی وتی ئایا نازانی تۆ چەند قەشەنگ و جوانی بێ شاخەکانت؟! گاکە سەری داخست و ماوەیەك دەنگی نەکرد و وەڵامی نەدایەوە...

ڕێوی وتی: هیچ قەیناکات چارێکی ئەم تەنگ و چەڵەمەیەت لای من هەیە کاکی برادەر.

گاکە وتی: هەرچی داوا بکەیت ئەتدەمێ ئەگەر ئەم هەموو کێڵگەیەش بێت!

ڕێوی وتی: بەرانبەر چاکە کردن هیچم ناوێت..

گاکە وتی: تۆ ڕێویکی چاکی یەکەم جارە لە ژیانمدا تووشی ڕێوێکی دڵ و دەروون پاك بم وەکو تۆ!!

ڕێوی وتی: هاوڕێ بڕوانە.... دیاردی کرد بۆلای زنجێکی بچووك لە کۆتایی تەپۆلکەیێکەوە گاکە وتی خۆئەوە زنجی دارکەرێکە ڕێوی وتی: ئائەو دارکەرە چارت ئەکات گاکە وتی: ئەو ئاخر دارکەرە پزیشك نییە وتی ئەم کارە هیچ پێویستی بە پسپۆڕو لێ زانی پزیشکی نییە، وەرە بەدواما ئەبینی... بێ چەندو چوون گایەکە کەوتە شوێن ڕێوییەکە.

ڕێوی دای لە دەرگای دارکەر ئەویش سەری کێشایە دەرەوە و تەورەکەی نایەسەر شانی ڕێوی وتی ئەی هاوڕێی چاك ڕەفتار ئەم برادەرە شاخەکانی تووشی کرمۆڵی و خۆرە بووە هەرلای جەنابتان چاری هەیە تکا ئەکەم چاری بکە هەرچۆنێ ئەبێ.

پیرەمێردی دارکەر سەری سوورما لەم جۆرە نەخۆشییە کـە لەمەوبـەر نـەی بیـستووە!! دارکەر بەخۆی وت: من کارم چییە خالۆی گا وەرە پێشەوە هـەر ئێـستا لـە چاوتروکانێکا شاخەکانت بە ئاسماندا ئەفڕن بەیەك تەوری قورسی تیژو بوروندە. کە تەوری برد بە ئاسمانداو پیا کێشا ڕێوی هاواری کرد بژی دەسـتت خـۆش کـەزانی جێگـای کاریگـەری گـرت وتـی: ئەویتریشت بێنە پێشەوە، دان بە خۆتا بگرە ئەمیشیان چـووە پـاڵ ئـەویتریان گـا سوپاسـی دارکەری کرد هەروایش مام ڕێوی لە ڕێگا پێویست بوو ڕێوی دوعا خوازی بکـا لـە گاکـە، بەڵام گا پرسی ئەی هاوڕێ چی ئەکەی لەم دوو شـاخانە؟! ڕێـوی بـە کـوڵ پێکـەنی و وتـی وائەزانی تۆ لە گاکانی تر جیاوازیت، زیرەك تـری ئـەم دوو شـاخە ئەکەمـە سـەری خـۆم و پێیانەوە ئەچم بۆ ئاهەنگی لە دایکبوونی پادشای دارستان خـۆمی پێـوە ئـەنوێنم. چـونکە پاداشتێکی بەنرخی داناوە بۆ بێوینەترین کالای بەرگی خۆگۆڕین و ئارایـشت ئـەی دۆسـتی خۆشەویست ئەمجا گایەکە هەستی کرد بە خەمبارێکی زۆر بە تین و ئەیویست پەلاماری ڕێوی بدات، بەڵام بەداخەوە خۆ شاخەکانی لە دەست چوو.

* * *

**چیرۆکی مجید عبدالله**

**هەر هەمان سەرچاوە لە هەمان ڕۆژدا**

**ئەنگوستیلەی مار**

کوڕە شوانە پچکۆلەکە زانی کە مارێکی گەورە ئەژی لەو جێگایەی کە بەرخـەکانی تیـادا ئەنوێت، چونکە هەندێك ڕۆژ ئەبینێ بەرخێکی مرداربووەتەوە و مۆرکی پێـوەدانی و گـەزتنی ماری پێوە دیارە. شوانە خۆی بۆ لە پەسۆدا بینی ئـەوا مارەکـە ئەکـشێت و ئەخـشێ بـەرەو قەڵەوترین مەڕ کە بۆ خۆی ڕێگا ئەکات و ئەڕوات لەسەرخۆ، خێرا کوڕە شوانە بۆی دەرپەڕی و بە گالۆکە ئەستوورەکەی کە بەدەستییەوە بوو، بەرزی کردەوە و ویستی بیکێشێ بەسەریاو ورد و خاشی بکات کە مارەکە تێگەیشت و زانی دەربازبوونی نییە و لە دەستی ڕزگاری نابێ ملـی بەرزکردەوە و وتی: بۆچی ئەمکوژی؟! هیچ کەڵکێکم لێ وەرناگریت؟! وازم لێ بێنـە بـچمەوە جێگاکەی خۆم ئەنگوستیلەیەکت ئەدەمێ لە ئەڵماس بەنرخ تر بێت هەروایش تۆبە بێ ئـازارت نادەم بەڵێنت ئەدەمێ کە دۆستی ڕاستەقینەت ئەبم!!

منداڵەکە بەقسەی مارەکە بڕوای کرد هەڵخەڵەتا و دوای کەوت بە تـەمای ئەنگوسـتیلەی ئەڵماس بوو کە مارەکە ڕۆیـشتە نـاو کونەکـەی خـۆی منداڵەکـە وتـی کـوانێ ئەنگوسـتیلە ئەڵماسەکەی بەڵێنت پێدا بووم؟! مارکە وتی ئەوەتا لەلام ئـەتوانی دەسـت درێـژ بکـەی وەری بگریت، لە ناو ئەم کونەدایە و خۆم بیکەمە پەنجەت تا بێت بە نیشانەی دۆستایەتی نێوانمـان و بە کەیف و خۆشی بچیتەوە کوڕە شوانە بچکۆلەکە دانەوییەوە لەسەر چیـچکان دانیـشت لـەو نزیك کونەکەوە ئەیویست پەنجە درێژ بکات بۆ ناو کونەکە لەو کاتەدا باوکی ئەیروانی و بانگی لێ کرد نەکەی ڕۆڵە بۆ وا ئەکەی!! وتی ئەمەوێت ئەنگوستیلەی ئەڵماسم دەست بکەوێت بابە؟ باوکی وتی کێ ئەتداتێ؟! وتی بابە مار ئەم داتێ، پێش نەختێ پێی وتم و بـەڵێنی دامـێ کـە خۆی ئەیکاتە دەستم باوکی وتی هەڵسە ڕۆڵە دەی! ئەو فێڵی لێ کردوویت ئایا تۆ بڕوا ئەکەیت دوژمنت ئەنگویستیلەی ئەڵماس بکاتە پەنجەت؟!

ئەوە ئەیەوێت بدات بە پەنجەتەوە وبتگەزێت و بمریت هەر دەسبەجێ وەکو بەرخەکانت. ڕۆڵە عـاقڵ بە وشیار بە، هەمیشە گاڵۆکەکەت بابەنەرەی شانەوەت بێت. تـا سـەری پـان کەیتـەوە ئەگەر جارێکیتر دیتتەوە هەلت بۆ هەڵکەوت وا ئەجارە فێڵی لێ کردیت و هەلی لـە دەسـتتدا ئەگەر توانیت بیکوژیت و ئێمە ڕزگار بکـەیت دیـارییێکی زۆر نایابـت پێـشکەش دەکـەم کـە نیشانەی ئازایەتی و نەبەردی بێت.

* * *

لەوبەری هەورامانە مەلایێك هەبوو، مەلای چاك بوو زۆر لـە خـوا ئەترسـا لـە شـەوا هـەر ئەگریا وبە دەنگی بەرز هاواری لێ هەڵ ئەسا، خەڵکیشی بێکـار کردبـوو بێزاربـووبن. یـەکێکی دۆست ئاسای ڕۆیشتەلایەوە پێی وت ئەرێ برا: خۆ تۆ هیچ کچ و کوڕی خوات نەکـشتووە (نعـوذ بالله) ئیتر بۆچـی ناخۆشـت کـردووە، ئەوەنـدە ئەترسیت؟! جارێکیـان هـەر دووعـای ئـەکرد و ئەپارایەوە لە خوا ئەیوت بە عەملی خۆمم لەگەڵ نەکەی خوایا، بەیانی فەقێیەکی لە خزمەتا بوو کۆڵی پێچایەوە، مامۆستا پێی وت ئەوە چی ئەکەیت برا؟! وتی قوربان ئەڕۆم وتی بۆچی وتی لای شەخسێکی جهەنەمی وەکو جەنابت ناخوێنم وتی بە چیدا ئەزانی؟ وتی هەرچەند تێبینـی ئەکـەم هەموو کردارو ڕەفتاری تۆ شەرعی و بەجێیـە شایـستەی بەهەشـتی و تـۆیش ئەفـەرموویت بـە کرداری خۆتت لەگەڵ نەکا، واتە بتبا بۆ جەهەنم و داوای دۆزەخی لێ ئەکەیت،

* * *

ئەگێڕنەوە جارێك مێش و مێشوولە و پەپوولە ئەچنە خزمەتی حەزرەتی سلێمان پێغەمبەر (د.خ) داد و هاوار ئەکەن لە دەست گڤو هوڕی رەشەبا و پەرێشان حاڵی خۆیان بەدەستییەوە کە ناهێڵێ لە جێگایێك ئارام بگرن ئەویش ئەفەرمووێت راوەستن ئێستا دێت پێی ئەڵێم واتان لێ نەکات ئەمانیش ئەڵێن قوربان کە ئەو هات خوا ئەزانێ ئێمە جێگامان لە کوێ ئەبێت و ئەکەوینە کام وڵات؟! شکاتمان هەر لە جێگای خۆی دیموکراتیسی بەخۆیەوە نابینێت هەمیشە ئەمە باریەتی مرۆڤی لاوازو بێ تین، گازندەی پشیلە لای رێوی! هەر چەندێکیان ئەکرد نەیان ئەزانی چۆن چاریان بکەن و لە حەقیان بێن، چەرمەسەرو ئازار و هەڵواسین قەلاچۆکردن و راوەدوونان، گرتووخانە، هەرپەرەیان پێ ئەسێنێ و زۆر ئەبن. رژێم لە دوای رژێم گۆڕان لە دوای گۆڕان ئەم هۆز و گرۆیە هەر زاوزێ ئەکەن، ئەڵێی سیسرکەن بەرۆژ خۆیان حەشار ئەدەن و بەشەو دێنە دەرەوە بانگەواز لە یەکتر دەکەن و دەس بە زیڕە زیڕ ئەکەن ژیانیان بە خەڵکی تاڵ کردوە هەرچی دەرمان و دیدیتی هەیە پاکۆیان پێ نادات. گەرا هەر ئەکەن و ئەتروکێن و ئەبن بە سیسرکی تەواو.

ئەم بەوی ئەوت و ئەویتریش بۆی ئەسەندەوە چار چییە چار چییە؟! هەر کوێ ئەچیت ئەمانەی لێیە و ئەتەنێتەوە یەکی دنیا دیدە و لێهاتوو وتی: چاری ئەمانە لای منە ئەگەر بە قسەم ئەکەن؟! گوێ شل کەن بۆ ئەم رازەم ئەبێ ئێمەش بە پێی ئەم پرۆگرامە بڕۆین بەرێوە:

جارێکیان پشیلە چاوی کەوت بە مام رێوی و پێی وت من لە ژوورێکدا ئەژیم پڕی لە مشکە و حەیشیان پێ تاڵ کردووم هەرچەندیان لێ ئەگرم و ئەیخۆم بێ کەڵکە کەم نابنەوە تا دێ هەر زۆر ئەبن لە هەمەوولایەکەوە کونیان کردووەتە ژوورەکە هەر چاویان بە من کەوت خۆیان ئەکەنەوە بە کونەکانیاندا زاوزێ ئەکەن و زۆر ئەبن!

مام رێوی وتی: زۆر سووك و سانایە خۆت بکە بە مرۆڤێکی لە خواترس قەڵەویان بکە ئیتر ناتوانن بچنەوە کونەکانی خۆیان، بەوجۆرە وردە وردە قەلاچۆیان تێ بخە ئەویش وتی: زۆر باشە سوپاست ئەکەم مام رێوی، فێڵەکەم پێ زانی پشیلە عەسایەکی پەیاکردو گرتییە دەستییەوە مێزەرێکی سپی و ریشێکی پان و درێژ و پشتێنێکی کەشیدەی کردە کاڵاو پیاوچاکانە پۆشی، دەستی کرد بە دوعا خوێندن و مرەو هەیوو هوو... سەرو ریش لەرزان جار جار چاوی لێك ئەناو بەرزی ئەکردەوە ئەیوت یاالله یا پیرە مەدەدێ.

ئەنجام ئەم ئەوانی هەراسان کرد بە دەنگە دەنگ بەسۆزو لاوانەوە بە یاهوو یاهوو ئەبێ ئیتر پیاو رووبکاتە خوا، کەس ئازار نەدا دونیا مردنە!! مشکەکان کە گوێیان گرت! ئاهوو نزولەی

پشیلە گریان و کروزانەوەی پیاوی ئەکرد بە کەباب!! مشکان وتیان مام پشیلە ئەوە چییە چی قەوماوە؟! بۆچی وا ئەکەیت؟ وەلاّمی دایەوە وتی ئەی ئێوە نازانن من تۆبەم کردووە؟ لەمەودوا لەگەلّ ئێوەیش مەسلەحەت ئەکەم دەستم شۆریوە لە پیاو خەراپی بە تایبەتی لەگەلّ هۆزی ئێوە خەجەلّەتبارو روو زەردی لای ئێوەم لەمەودوا گۆشتی ئێوە لەمن حەرامە و پزیشك لێی قەدەغە کردووم تۆبەکار ئەبێ وابێ وەکو من!! فەرموون بە ئارەزووی خۆتان تەڕاتێن بکەن بێنە دەرەوە سەربەست و ئازاد بن کار و فرمانی خۆتان بە ئارەزووی خۆتان بە ئەنجام بگەیەنن دونیاییێکی وا پڕ لە ئاژاوە و تەنگوچەڵەمە بێ ئێوە و هاورێکانتان هەرگیز دانامەزرێت!! منیش لە دۆست و برادەرانمەوە زۆر دیاری و دەسەندەم بۆ هاتووە کەس لە ئێوە لە پێشترو شیاوتر شك نابەم ئێوەش دەس بەخێری خۆتانەوە مەنێن فەرموون بیخۆن بۆ خۆتان بەشی منیش و ئێوەیش ئەکات و زۆرە کێ هەیە لە پیاو خەراپی کەلّکی وەرگرتووە؟!

چەند رۆژێك بەم جۆرە خۆی مەلاّس داو دلّنەوایی کردن. خۆی هەلّئەسا ئەچوو بە کوّلێ ریشەوە بەو دیمەنە سەنگی نییە و گەنم و جۆی ئەهێنا بۆی دائەکردن، لەبەردەم کونەکانیان رۆووی ئەکرد هیچ نیشانەی توندوتیژی و شلّەژانی کینەو قینی لێ نەئەبینرا رەوشت و رەفتاری زۆر ئاسایی بوو.. ئەوانیش وردە وردە رێگایان کرایەوە ئەهاتن و ئەچوون بێ سلّەمینەوە بەلّێ زۆری نەخایاند دونیا ئارام بوو ئاو کرا بە ئاگردا ترس و بیم و ناکۆکی بنبڕ کرا لە مێشك و دەماغی مشکەکاندا گشتیان خەریك بوون بە ئارەزووی خۆیان ئەیانخوارد و ئەیانخواردەوە و بووژانەوە رۆژ بە رۆژ باریان بەرەو چاکتر ئەچوو حەسانەوە ماوەیەکی باش ئیتر کاریان بە کونەکانی خۆیان نەماو نەئەچوونەوە، جارجار مام پشی داوای لێ ئەکردن کە بچن ژوورەکانیان پاك بکەنەوە وە لە ژێرەوە هەستی لێ ئەگرتن بە تێبینی وردەوە، ئەیبینی هەموویان چاك قەلّەو بوون، بووژانەتەوە ناتوانن بچن بە کونەکانیانداو نایان کێشێت و فێری ئەوە بوون کە جارێکیتر نەتوانن بژین لە ناو کونی تەنگ و تەسك و ناخۆشدا ئیتر کەم کەم ئەو راپەڕین و چالاکییەیان هاتە کزی و شل و خاوبوونەوە ژیانە کۆنەکەیان لەبەر چاو بێزار بوو بە ژیانی لەزەت و خۆشی و هۆگرو رام بوون.

جا مام پشی دەستی کرد بە بیانووگرتن پێیان هەر کامێکیان پوخت و قەلّەو بوایە بە لەپێ مەلاّسی ئەداو ئەیکرد بە تیکەیەك بە بیانووی لاساری و ئاژاوەچی و داد گوستەری کە ئەمانیش تەنگاو ئەبوون رایان ئەکرد بۆ کونەکانیان پیادا نەئەچوون تا بە تەواوی قەلاّچۆی کردن تاکوتەرا نەبێ ئەوەی بەختی بووبێ لە چنگی مەرگ رزگاری بووبێ یان بەلایەکدا دەرباز بووبێ تەفر و توونا و

پەراگندەی ولاٚتان بوون ئیتر بەمجۆرە پشیلە بە ئاواتی دێرینەی خۆی گەیشت جا کالاٚی پاك و خاوێن و تەسبیحی درێژی ئایینی پیرۆزی واکی هەیە بڕوای پێ بکات؟! ئەم پیاوی خوایە لە ژێرەوە چی کرد؟ مالّی مشکانی بەهەزاران وێران کردووە، کەوابوو هەر ئافەرین و سوپاس بۆ ڕێ بۆ کێشەری بۆ مام ڕێوی نەخەلّەتاو گشت گەوجێك بەشی ئەوەیە کە بڕوا بە دوژمنی خوێنە خوێی خۆی بکات.

* * *

## مەکری ژنان:

وا ئەگێرنەوە ئۆبالّی بە مل چیرۆك خوانی کوڕی شەوانی زستان (٣) سێ خوشك ئەبن یەکێکیان ژنی وەزیرو ئەوی تریان ژنی قازی و بچووکەکەیشیان ژنی باش وەزیر ئەبێ لە یەکگرتنێکی دیدەوانی دا لە مالّ یەکێکیان هەر کەسێ خۆی هەلّ ئەنێ و خۆی هەلّ ئەکێشێت ئەم ئەلّێ من نەبەردم، مێردەکەم لێم ئەترسێت بچووکەکەیان ئەلّێت عەیبە مرۆڤ ناوی خۆی ببات لام وایە هیچتان بە پەرێزی مندا ناتوانن بڕۆن و هێشوو بکەن ئەگەر بمەوێ لە نرخی مێردەکەم کەم بکەمەوە هەر نەختێ لە پلەی خۆشەویستی بێمە خوارەوە ئەتوانم زۆر شتی سەرسوورهێنەر ئەنجام بدەم مەخلەس هەرکەسێ باراشی خۆی لێکرد ئەنجام خوشکی گەورەیان کە ژنی وەزیر بوو وتی سبەینێ تەماشام بکەن چی بە مێردەکەم بکەم خوشکی گەورە کە لە خەوی بەیانی هەلّسا وتی پیاوەکە تۆ خوات لەگەلّ ئەچیت بۆ خزمەتی پادشاو کاری هەژاران جێ بەجێ ئەکەیت منیش ئەم شەو سەرێکی مالّی باوکم ئەدەم خۆم و مندالّەکان ونەختێ بێ تاقەتی خۆمان بەسەر ئەبەین بە ڕووێکی خۆش و دەم بە پێکەنین وەزیری بە ڕێ کرد ئەمجا ناردی چاکترین میوانخانەی بۆ ماوەی دوو شەو بەکرێ گرت واتە چەند ڕۆژێ ئوتێلێکی نرخ گران کە شایانی پیاوی دیاری و بەرز بێت خۆیشی زۆر کارامانە ئارایشتی خۆی کرد سەد سوێندت بخواردایە هیچ شتێکی لە ژنەکەی جاران نەئەچوو خۆی کردەوە بە کچ و تاوە خەت و خالّی ڕشتبێ مالّی دەرمان و عەتر و بۆن وێرانکرد!!

مرۆڤ بە یەکجاری ئەگۆڕێت سەرتاپای بالاٚی گۆڕی، بوو بە کچێکی تازە مەمك بکات هەر چاو بوو گازی لێ ئەگرت دەمبوو ماچی بۆ روومەتە ناسکەکانی ئەنارد ئاوات و حەز دەوری دابوو، هەرزەکار بە دلّە فرتێ ئەکەوتنە دوای کارمامزی تەریوی سلّ کردو نێچیرە ڕایکردووە ملە و کۆست و بانی بڕیوە لە دەست ڕاوچی یا لە گەلە دابڕاوە ئەمجا هات نامەیەکی بۆ وەزیر

نووسی رازاندییەوە کە پڕ بوو لە ئاوات و خواستی دڵداری دەمارەکانی هەست و دەزوولەی ئارەزووی ئەبزواند هەر نامەکە خۆی پڕ بوو لەچاو برکێ و مەشقی دڵداری و گرفتاری ئەوین و ئەوین بازی تیا نووسیبووی کە ئەم ئافرەتە لە ولاتێکی دوورەوە رێگای بڕیوە زۆری لامەبەستە کە بەدیداری شاد بێت و لە فلانە جێگەدایە، واتە میوانخانەی بەکرێگیراو جەنابی وەزیر ئەگەر بڕیار بدات واخۆیو کەنیزەك و کارەکەروان لە خزمەتیا ئەم شەو چاوەڕوانی ئەکەن.

وەزیر کە نامەی پێ گەیشت فرە دڵخۆش بوو وتی ئەم شەو بە کامی دڵی خۆم رائەبوێرم هەرچیش داوابکات و تێی بچێت گرینگ نییە بەتایبەتی کە ئەو شەو دایکی منداڵەکانیش لە ماڵەوە نییە و پێی نازانێت خێرا بڕیاری داوە وەلامی دایەوە: زۆر باشە بەسەر چاوان شەو میوانی ئەبێت وەزیر دەستێکی بەخۆی داهێنا و خۆی بۆ شتاغ کرد لەم لایشەوە ژنەی مەکرباز خاوەن ئوتێلی ئامۆژگاری کرد بە پارە لە خشتەی برد کە هەر میوانێ پاش مەغریب هاتە ئێرە گەڕانەوەی نییە تا بەیانی رۆژ ئەبێتەوە. جا وەزیر هەر ئەوەندە لە فەرمانگە دەستی بەربوو پاش نوێژی عیشا کەوتە رێگا بۆلای میهرەبان خان ئەمانیش چوون بە پیریەوە پێشوازیان لێ کرد بە خۆیو کارەکەرەوە چو پاڵی دا بە وەزیرەوە دووجار خۆی بەناز هێناو برد وەزیری خستە فرتە فرت و سیکە سیك وەختبوو شێت بێت پێی وت: لەسەر خۆت بە هەرچۆنێ بێ ئەم شەو دونیا بەکامی تۆ ئەبێت!!

فەرمانی دا خواردن و خواردنەوەیان هێنا بۆ وەزیر ئەمیش خۆی روت کردەوە بە ئارام چاوەروانی لتفی ئەم ژنە پەری روویەی ئەکرد کە بە ئارامی دڵ پەردەی نازو ترس و عیفەت دابدڕن وەکو لاولاو لەیەك بئاڵێن ژنە رووی کردە وەزیر وتی هەتا دەرەوە ئەچم هەر ئێستا دێمەوە باوەشت کە رۆیشت خزمەتکارو کەنیزەکی مورەخەس کردن پارەو بەخشیشی دانێ و خاوەن میوانخانەی تەواو بەزیادەوە رازی کرد وتی بە هیچ جۆرێ نایەڵێ ئەو پیاوە ئەم شەو بڕواتە دەرەوە تا بەیانی چێشتەنگاو، چونکە تاوانبارە خۆیشی لێیدا رۆیشت، بەلام وەزیر بە هیچ جۆرێ ئەم ژنەی نەناسییەوە هەر بەلایشیا نەچوو. وەزیر سەعاتێك چاوەڕوانی کرد دوان، سیان هیچ دیار نەبوو نەهاتەوە بانگی خاوەن ئوتێلی کرد و پرسی و وتی: رۆیشتووە ئیتر نایێتەوە خۆی حازر کرد ئەمیش بڕوات هەرچی کۆشاو خەریك بوو نەیهێشت تا بەیانی وەخت بوو گیانی دەرچێت سبەینێ کە رۆژهەلات کاتێکی زانی ژووری فەرمانگە گرتییە خۆی بە کۆڵێ پەژارە و ئەندێشەوە، چونکە ئەو شەوەی بەسەر برد دژوارو بێ هاودەم بوو لەم لایشەوە خانمی ژنی هەرچی ئارایشت و خشڵی رازانەوەی و جوان کردن هەبوو هەمووی داکەندو گۆری و

شاردییەوە خۆی هێنایەوە سەرباری ئاسایی جارانی خۆی ئێوارە کە وەزیر رۆیشتەوە هەر لە دوورەوە ژنەکەی رۆیشت بەپیرییەوە بە شاتە شات و قەبازی هەی وهاو وەهای داوێن پیسوو بێ شێوازو رەفتار ناپاك لە خوانەترس بۆچی نازانم ئەم شەو لە کوێ بوویت لە فلاّن خان لای فلاّنە سۆزانی جادووگەری خۆفرۆش هەر ئەوەت ماوە بکەویتە دوای ئافرەتی داوێن پیس و بێ رێز و ناونیشانی شتەکانی بۆ هەڵدا بە بەڵگەی تەواو ئەمیش نەیتوانی لات و جم بکات و بلێ لەل دەمی درێژ کرد بەسەریا ئەوەی ئەیوت نەی ئەوتەوە لەولایشەوە خوشکەکانی هێنابوو گوێیان لێ گرتبوو: کەچی پێ ئەکرد مەگەر خوا بزانێ خوشکی گەورە بانگی کردن و وتی:

ها چۆن بوو ئەم مەکریازییەم!!! راتان لێی بوو؟ وتیان باش بوو، بەلاّم وەزنێکی ئەوتۆی نەبوو

خوشکی ناوەنجی: وتی: نۆرە گورزی منە بزانن چی بەباش نائیب وەزیر ئەکەم و چۆنی ئەکەم بە پەند؟! ئێوارە کە مێردەکەی هاتەوە تا نیوە شەو بە قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ بردیانە سەر تا کاتی نووستن ئەمجا ئاوی شەربەتی مێوژی بۆ هێناو نەختێ دەرمانی بێهۆشی تێکرد لە پاش چەند چرکەیەك دەستی کردە گەردنی بێ هۆشی و ئارامی نووستن و بێ ئاگاە بوو لە جیهانی کرد و کۆش و پەژارە.

پێشەکی هەواڵی ماڵە گەورەیەکی زانی بوو کە ژن دێنن ئاهەنگ و دەهۆڵ ئەگێڕن بە زۆڕنا و زەماوەند ژن ئەگوێزنەوە هێنای سەر و سمێڵ و ریشی مێردەکەی بە کافرمان تاشی و بەرگێکی لۆتیانەی کردە بەرو پشتێنێکی کردە پشتی ئەمجا دوو دار لێدەری دەهۆڵ کوتان و زۆرنایەك و بلولێك کیسە سەبیلێکی کرد بە بەریا بانگی دوو نۆکەری کرد پێچایانەوە، دایان بە کۆڵیانا بردیان لە گەرەکی شایی کەرێك فڕێیان داو بەجێیان هێشت.

بەیانی شەبەقی رۆژ بووەوە هۆشی هاتەوە سەرخۆی تەماشاییکی خۆی کرد کلاّوێکی رەنگا و رەنگ رازاوە بە چوار ئاوێنەدا دووراو و ناوی خۆی لە گیرفاندا نووسرابوو هینەی کوڕی میرزای دەهۆڵ ژەن لەو کاتەدا ئەسووڕایەوە نەی ئەزانی روو لە کوێ بکات؟! جا چاوەش و شایەرەکان هاتنە دەرەوە هاورێیکی خۆیان دۆزییەوە کەیل و ئاوارەیە بردیانەوە لێیان پرسی؟ هیچ چاری نەبوو وتی چاوشم کاتێ تاقیکراوە هیچی نەئەزانی لە ئاهەنگ و چریکە و ساز و گۆرانی و دەهۆڵ ژەندن وتیان ئەی ئەتوانی بانگی شاباش بکەیت وتی بەڵێ زۆر باش دەنگیشم لەبارە ئیتر لەگەڵ چێشتەنگاودا بردیان لەگەڵ خۆیان بۆ زەماوەند گێڕان و شاباش کردن، بەلاّم باشی ئەشیران لە شاباشدا تا ماوەی (٣) سێ رۆژ لەم لایشەوە بانگی خوشکەکانی کرد وتی تەماشا بکەن لەم سەربانەوە بزانن مێردە هەژارەکەم چۆن کرد بە چاوش و هاورێی لۆتی!! خوشکەکانی سەریان

سورِما لەم ژنە شەیتانە کە ئەمەی چۆن ڕێکخست؟! کە ئاهەنگ گێڕان کۆتایی هات ناردی بە دوای سەر لۆتیدا لەگەڵیا کەوتە وتوویژ وتی پیاوێکت لایە پێم بفرۆشە بە مەرجێ نابێ خۆی بزانێ فرۆشراوە و من کڕیومە لە تۆ بە کورتی ئەندازەیەك دراو و پوولی پێدا کە شەو نووست دووبارە دەرمانی بێهۆشی کاری خۆی نواند و دەرخواردی درا و پێچرایەوە بە کۆڵی دوو نۆکەردا ڕەوانەکرایەوە دەس بەجێ کالاو پۆشاکی شاباش چی لەبەر داکەندرا و جل و پێخەفی ئاسایی خۆی بۆ هێنرا وەکو جاران کە بەیانی بەخەبەر هات خۆی لە ناو جێگادا بینی دەنگی سەلاوات الحمدلله بەرز بووەوە لە ماڵی وەزیر گوایە وەزیر بە هۆشی خۆی هاتۆتەوە، ڕووی کردە ژنەکەی وتی ئافرەت خەوم دیوە لە خەومدا بووبووم بە چاوەش لەگەڵ لۆتیدا بانگی شاباشم ئەچریکاند وتی: ئەنجامی هەر خێرە الحمدلله چاك بوویتەوە، دەخیلت بم ئەم قسەیە نەدرکێنی لای کەس وکات پێت ئەڵێن شێت بووە گشت شتێکی بۆ ئەنجام دابوو کار گوزارانەوە بە بلیمەتی ناردییەوە فەرمانگا لە پاش وەی هەواڵ پرسی لێکرا کە گوایە نەخۆش بووە....

سەرە گەیشتە سەر سێهەم خوشکی بچووك ژنی قازی شار ئەمیش لەبەر دەرکی ماڵەوە تا هۆدەکەی خۆی چوار کەنیزەکو نۆکەری دانا تا هۆدەکەی خۆی و ئامۆژگاری کران کە نابێ هیچ هەڵە بکەن بە هیچ جۆر، لەگەڵ قازی پێی نایە بەردەرگا نۆکەرێك و کەنیزەیەك وتیان یاخوا بەخێر هاتیتەوە جەنابی قازی هەی ڕۆ ئەوە خێرە بۆچی ڕەنگت تێك چووە؟! لە دووهەمدا لە دیوی ژوورەوە بە هەمان جۆر دوانی تر لەبەردەم پلیکانەکان دووانی تر دەسیان کرد بە خۆکوتان هەی ڕۆ هەی ڕۆ جەنابی قازی چەند ڕەنگی تێکچووە ڕەنگی لە روو نەماوە هەموویان لە بەردەم ژوورەکەی قازی دەستیان کرد بە خۆکوتان و قژ ڕنینەوە قازی ڕۆ قازی ڕۆ جا ئیتر ئەم کارە دەوری خۆی بینی لە نەخۆشخستنی دەروونی قازی کەوت و لەرزی بێهۆش کەوت: ژنی قازی نووسراوێکی نووسی و ناردی بۆ دادگای شەرعی کە قازی نەختێ نەخۆش و بێ هێزە کەم توانایە بۆ هەفتەیەك ئەحەسێتەوە لە ماڵەوە.

لەملایشەوە ڕیش و سمێڵی تاشی و زەردەچەوەی لە دەم و چاوی هەڵسوو بێ هۆشی کرد و بەزۆر دەرمانی ڕەوانی بە شلەوە دەرخواردی قازی ئەدا، هەرچێکی خواردبوو لە منداڵیشا داینا یان هەڵی هێنایەوە بە ڕشانەوە قازی وای لێ هات لە هێڵخ و ڕشانەوە و پیسیدا ئەوەندە خۆی پیس کردبوو وەختبوو گیانیشی دەرچێت پزیشکی ئەو ڕۆژەیان هێنایە سەری و ڕایسپارد ئاگاداری بکەن کۆمەڵە دەرمانێکی بۆ نواند کە بیخوات لە کاتی خۆیدا، لە پاش هەفتەیەك قازی نەختێ تووکی هێنایەوە هۆشیار بوو ئەمجا خێزان و نۆکەر و کەنیزەك دەوریان لێدا وتیان: الحمدلله قازی چاك بووەوە سەد شوکر و سوپاس بۆ یەزدان.

ئەمجا خوشکەکانی هێناو ئەمیش بە مەکری ژنانی خۆی خۆی نواند و هەڵشەنگان کە ئەتوانێ کاری لە رادەبەدەر لە عەقڵ بکات...

* * *

پیاوێك دڵی بە ژنێکەوە ئەبێ گشت جارێ ئەچووە ژوانی ئەویش بە بیانوویەك خۆی ئەگەیاندە کابرا و کاری خۆیان ئەکرد جارێکیان زۆر سارد ئەبێ و بەڵێنی ئەداتێ کە بچێتە لای دیار نابێت، چونکە میوان دەستی ئەگرن کە دێتە دەرەوە کابرا ئەڵێ:

فیدای بالآت بم موور و لە گەردن
سەرما کوشتمی بێ بۆ گوو کردن

وەلآمی ئەداتەوە

سەرما کوشتیتی چاوت دەربایە
برۆ ماڵی خۆت ئێستا گوم نایە

* * *

شێخ رەزای تاڵەبانی هەجوی کێری خۆی ئەکات گوایە ژنی هێناوە یەکەم شەو نەبووە بە زاوا، دوای دوو ژن ئەڵێت:

عمرت نەمێنێ سەر زلی بێ خێر
لەعنەت نامەم بێ قەت پێت نەڵێم کیر
سەرت داهێشتووە بە ملی گوندا
گەوادیت هێنا وەشانی مندا
هەر کوس کوست بوو ئەوە تۆ و کوس
لە لات گەوتگە وەك خەرمان مس
گەزافت نەدا ساجەمە سم
تەرِت نەسمی دەست وە گونم
لە تۆ باشترە گونی رەش تاڵە
کاری خۆی ئەکا نایکا بە گاڵە

* * *

## خاوەن دوو ژنە گشتیان بۆ گیراوخانە!!

کابرایەك نوێژو تاعەت دروست دوکانێکی بچکۆلەی خنجیلانەی هەبوو زۆر باش پێی ئەژیا هەموو رۆژێ بەیانی زوو دوکانی ئەکردەوە تا ئێـوارە زەردەپـەڕ لەسـەری دائەنیـشت دراوسـێ دوکانێکی هەبوو هەرگیز نەیئەتوانی لێی پێش بکەوێ، هەر ئەو بەر ئەم ئەکەوت.

رۆژێك لێی پرسی ئەرێ برا فلانکەس ئەوە چۆنە تۆ هەموو کـاتێ پـێش مـن ئەکـەوی، وا گورج و گوڵیت؟ هۆی چییە؟ با منیش چاو لە تۆ بکەم وتی برا تۆ هەرگیز وەکـو منـت پێـت ناکرێ من دوو ژنم هەیە کە هەڵئەسم ئەمیان عەبا ئەدا بە شانمدا ئەویان پـێلاوم بـۆ دائـەنێ، هەر داوای ئاو بکەم هەردووکیان ملی خۆیان ئەشکێنن پەلامار ئەدەن لەگەڵ هـەر کامێکیـان بنووم ئەویتریان ئاوم بۆ گەرم ئەکات لەگەڵ هەردووکیانـدا بخـەوم دەسـتیان وا لـە گەردنمدایـە هەرچی بڵێم حازرو ئامادەیە هیچ کاتێك دڵم گەرد ناگرێت چاوت لێیە؟ بەیانیان زوو شـەبەقی وام لە مزگەوت تا زوویش ئەچم بۆ بازاڕو دووکان ئەکەمەوە هاوڕێ دوکاندارەکەی تریش بڕوای کردو لە دڵی خۆیدا وتی منیش وا بکەم باشە، داوای ژنێکی کردو بوو بە خاوەن چوار چاو بەلاّم هیچ کاتێك نەبوو تروسکێك ئارام رووبکاتە ماڵەکەی هەر ئاژاوە بوو شەو و رۆژ شەڕ و جنێـو ماڵەوەیان کردبوو بە مەزاتخانەو حەمامی ژنان، پیاوی تێگەیشتوو ئـەزانێ مـاڵی دوو ژنـە چ ئاژاوەیەکی تێدایە هەمیشە هەر لە حەوشەکەدا ماڵی بۆ جیاکردنەوە ئیتر وای لێهات بەیانیان زوو پێش مەلابانگدان ئەڕۆیشتە دەرەوە بۆ مزگەوت خێرا نانیشی نەئەخوارد خـۆی نەگەیانـدە دوکانەکەی لە هاوڕێکەی پێشتر ئەکەوت و ئەچوو، چووەلایەوە وتـی خـوا بتگـرێ وەکـو وات لێکردم نان و ئاوت کردم بە زەهری مار. شەوێکیان لەبەر شـەڕ و ئـاژاوە هەراسـان ئـەبێ بـە سێچوار سەعات پێش مەلا بانگدان دەرئەپەرێت و ئەچێت بۆ مزگەوت، هەرچـەند لـە دەرگـا ئەدات لێی ناکەنەوە ناچار ئەگەڕێتەوە لە رێگە پاسەوان و یاسـاوڵ تێـی ئـەخوڕن و ئـەیگرن، تومەز لە بەختی رەشی ئەم لەو ناوەدا دزییێك کرابوو ماڵێك بڕابوو بە سۆنگەی ئەوە کردیان بە دزو گرتیان پێشەکی هەندێکیان بێزار کرد ئەمیش ئینکـاری ئـەکرد کـە مـاڵی نـەبڕیوە، لـە زۆربەی رووداوەکانی دژی گەل و یاسای ناو شار دەستی ئەمی تیا بووە، کاتێ لێیان کۆڵییـەوە دانی پیا نا کە هەرچییێك رووی داوە دەستی ئەمی تیایە. داوایان لێ کرد هاورێکـانی پێنـاس بکات وتی بەڵێ باشە: هەرچی ئەناسی لە شارەکەدا کـە دوو ژنـی ببوایـە گـشتیانی پێـوەدا، هەرچی دزی کردبوو لە شانی ئەوانی توند کرد، لەو کاتەیشا باری رامیـاری کـز و شـل بـوو، ماڵبڕین روتکردنەوە پەرەی سەندبوو، هەموویانی تاوان بارکرد... جا سەیرت ئەکرد حـەماڵ و حاجی و پینەچی کاربەدەستانی میری، گەورەپیاوان و ئاییندار لە گشت چین و توێـژەکانی گـەل

هەموویانی راپێچ کرد کە تەحقیقیان لێ ئەکرا حاشایان لێ کرد، هەندێکیش دارکاری ئەکران گاز و ئاوی گەرمیان بەسەر ئەکرا جا هەموویان روویان تێکرد و وتیان حاجی فلاّن کەی ئێمە دزین و پیاوی ئەوین؟! و شایەنی سزاین، وتی: گشتان هاورێی منن ئەی دوو ژنتان نییە!! ئەمەیش بەسە بۆ تاوانبارکردنتان بەخوا هەم دزن، هەم درۆزنن کاتێ میری بیری لێ کردەوە لەم پیاوە گەورانەی، چۆن عەقڵ ئەیگرێ ئەمانە هاوبەشی دزییان کردبێ؟! بانگی گومان لێکراوی یەکەم کرا پێیان وت: راستیمان بۆ روون بکەرەوە بۆچی ئەمانەت بۆ گیراو خانە کێش کردووە؟! وتی ئەم پیاو ماقوولانە موستەحەقن با بیچە ژن، ئەی من چۆن عەقڵ ئەیگرێ دزبم؟ لە راستیدا من ئەم چەند رۆژە لێرە حەساومەتەوە، دوورم لە ژنەکانم و ئەمانیش پێویستیان بە حەسانەوە و پشوودان هەیە، ئەم هەژارانە لە من پەڕپوت ترن، ئەگینا نە من و نە ئەوانیش دزن، تەنها گوناهو تاوانمان ئەوەیە دوو ژنەین، خوا غەزەبی لە دونیا لێگرتووین کاشکی هەموو کەس وەکو من دانی پیا ئەنا؟!!

* * *

## چۆن ئەسپی حکوومەت بارگیرە:

لە کاتی سەردەمی پاشایەتی گۆڕ کراودا، ئەو بارودۆخەی نوری سەعید هێنابوویە کایەوە تا باشتر رژێمی شایەتی جێگیر تر بێت هاتن مخفرێکیان کردەوە لە ئاوەکلە لە بناری داوێنی قەرەداغ، ئامیر مەخفەرێکی لێ بوو، واتە باش چاوش، بابە ئەم پیاوە زۆر بە گێچەڵ و بخۆری بەرتیل و مفتەخۆر بوو لە نەبوو ئەیتاشی و دروستی ئەکرد بۆ خۆیو ژوورتر لە خۆی پیاوێك ئەبێ لەو شارەزوورە، مەرەزەیەکی باشی کردبوو، کە وەختی سەروبەری بەست هەڵی گرت هیچ بە خەیاڵیا نەهات بەشی باش چاوش بنێرێت تەنها بیری لە خاوەن زەوی و ئاو کردەوە — دەرەبەگ — کە باش چاوش بەمەی زانی ناردی بە دوایدا هێنای دەستی کرد بە دارکاری کردنی هاواری ئەگەیشتە عەرشی عەزیم هەرچەند لێی ئەدا ئەی وت حیزباب جارێکیتر بە ئەسپی حکوومەت ئەڵێت بارگیر؟!! کابرا هاواری ئەکرد بەخوا نەم وتووە بە گۆڕی شێخی سۆڵە و چرچە قەڵاو پیرانی تەریقەت نەخێر بێ کەڵك بوو دۆستێکی چووە بن دەستی باش چاوش وتی من ئەبم بە کەفیلی. بەیانی هۆرێك چەڵتوکی بۆ نارد جا مەئموور (مخفر) رووناکی کەوتە ناو چاوی داینابوو لەسەر کورسی ئەی وت خاڵە فەرەج خوا ئاگادارە لە کورەکانم لە پێشتری ماڵی پیاوی گەوج وێران بێت وا منی شەرمەزار کرد لای جەنابتان خۆم ئەزانم ئێوە فامیدەن (أصول) ئەزانن

ئەگینا عەرەب ئەڵێ (وشر أيام الديك يوم تغسل وجلاه،) واتــە ڕەشــترین ڕۆژی کەڵەشــێر ئــەو ڕۆژەیە کە هەردوو قاچەکانی بشۆن و پاکی بکەن.

* * *

## (٣) سێ مامۆستا:

لە ناوچەی گەرمیان سێ مامۆستا پێکەوە ئەژیان و قوتابخانەکەیان بەرێکی ئەبرد بەڕێوە و تا رادەیەکی باشیش چووبوونە دڵی خەڵکەکەوە، ڕۆژێك کوێخـای دێکـە بانگیـان ئـەکات بـۆ ماڵەوە بۆ نان خواردن پاشی چەند ڕۆژێك مامۆستاکان ئەچنە دەرەوەی ئاوایی بـۆ گـەردوش و سەیران، بۆ ئەوەی بایێکی باڵی خۆیان بدەن و بێ تاقەتی بەسەر بەرن کاتێ مام کوێخا لـە ڕاو دێتەوە و سەلامیان لێ ئەکات و ئەڕوات، هەریەکە لە مامۆستاکان ئەڵێت سـەلامی لـە مـن کردووە لێیان ئەبێتە دەمەقاڵە نزیك ئەبن لەوەی کە یەکتر زیز و زویر بکەن ئەمجا بڕیـار ئـەدەن بچنە لای کوێخاو لێی بپرسن؟! ئەویش تێ ئەگات ئەمانە گـەوجن کـەم فـامن بیرئەکاتـەوە و ئەڵێ با پێیان رابوێرم ئەڵێت فەرموون جارێ ئێوە دانیـشن بـەزۆر دایـان ئـەنێت تفەنگەکـەی دێنێت و ئەیخاتە سەر پێ و سێ تەلاقەی پیا ئەکێشێت ئەڵێت پەڵپە و گرتوومە هەر یەکـەتان پێویستە بەسەر هاتی خۆتانم بۆ بگێڕنەوە ئەگینا سەرو فیشەکتان لێ ئاراستە ئەکەم و ئەبم بـە دژتان هەڵیان ئەپێچێت و دووچاریان ئەکات.

**أ/ یەکەمیان ئەڵێت:** ساڵێك من مامۆستا بووم لە دێیـەك منداڵـەکانم فێرکردبـوو کـە بپشمیمایە منداڵەکان سێ جار دەستیان بەرز ئەکردەوە، لە چـەپڵەیان ئـەداو ئـەیان وت: بـژی مامۆستا (رحمك الله — بالفرح والهنا).

جارێکیان چوبووینە سەیران بیرێك لەوێدا هەبوو چوار باڵ قووڵ بوو دۆلکەیان تێ خست و شۆڕیان کردەوە ویستیان بیهێننە دەرەوە، ڕایانکێشا لە ڕێگەدا بچڕاو کەوتە ناو بیرەکەوە ناچار منیش خـۆم ئامادە کرد و چوومە ناو بیرەکە دۆلکەکە دەربێنم کە قوتابییەکان رایـان کێـشام گەیـشتمە لێـواری بیرەکە و پژمیم قوتابییەکان لەسەر رەوشتی خۆیان دایان لە چەپڵە و بژی مامۆسـتا: (رحمـك الله — بالصحه والهنأ) گوریسەکەیان لە دەست بـەربوو، کەوتمـە نـاو بیرەکـەوە دووبـارە ئەوەنـدەی دابـووم بەمبەرو ئەو بەری بیرەکەدا سێـچوار پەراسـووم شـکا لەگـەڵ دەسـت و سـەرمدا سـێ مـانگ لـە خەستەخانە و ماڵەوەدا چارەکرام تا چاك بوومەوە لەلای پزیشك ئەمە بەسەرهاتم بوو.

**ب/ مامۆستای دووەم:** وتی منیش سەرتان نەئێشێنم لەو گەرمیانە مامۆسـتا بـووم پاشی دەوامی قوتابخانە خۆم ئەگۆڕی دیشداشەیەکم ئەکردە بەر لەگەڵ دەرپێیکی زۆر کوڵ

و جارجاریش ئەم پێویست نەبوو جارێکیان پیاو ماقولێکی دێیەکە خەڵکێکی زۆری بانگ کردبوو بۆ نان خواردن، منیش وەك ئەوان بـانگ کرابـووم لەسـەر کورسـی دانیـشتن لـەو ناوچەیە باو بوو نیشانەی رێزگرتن بوو لە دوای نان خـواردن هـەموو چـووین دانیـشتین و پاڵمان دابوو بە دیـوارەوە هـەر یـەکێ لـە ئێمـە خـۆی هەریـەك کردبـوو بـە تەسـبیح و سەرگوزەشتەیەکەوە منیش تەسبیحم پێ نەبوو چۆن خۆم خەریك بکـەم؟! ئاگـام لـە خـۆم نەبوو دەستم بردبوو یاریم بە گونی خۆم ئەکرد.

بۆچی لە تۆی بۆشایی و کونی کورسییەکە گونم ناچـێتە خـوارەوە و لـە درزی تەختـە گـیر ئەخوات منیش نەم ئەزانی چۆنی بیهێنمە دەرەوە ئـەم ئـەهات و ئـەو ئەڕۆیـشت وایـش رێـك ئەکەوت ئەبوایە لەبەر خەڵکی هەڵسم بەکورتی خەڵکەکە هەڵسان منیش لـەبیرم نـەبوو گـیرم خواردووە بەپەلە وەکو ئەوان هەڵسام و راست بوومەوە بەخێرا تەکانم بە خۆمدا یەك ئازارم پـێ گەیشت و هاوارم کردو زریکاندم: برا رۆ مردم خەڵکەکە بەسەرم دا خرۆشان بـە هـەزار بگـرەو بەردە رزگاریان کردم لەبەر خەجاڵەت و ئازار مردنم بە چاوی خۆم دیـت و شـەرمەزاربووم ئـیتر بوو بە پێکەنین و مقۆمقۆی ژن و پیاو و منداڵ بەسەرمدا چران حەیای بەرو دوام چوو.

ج / مامۆستای سێیەم وتی:

منیش مام کوێخا راستیت بۆ ئەگێڕمەوە: مامۆسـتا بـووم دایـان نـام لەلادێیـەکی نـەختێ پێشکەوتوو هەروا لەوێدا برین پێچێکی لێهاتووی لێ دامەزرابوو، زۆر بە گورج و گۆڵی و چالاکی کاری خۆی بە ئەنجام ئەگەیاند، خوا هەڵناگرێ زۆر دڵسۆز بوو بۆ کارو فەرمانی خۆی، دۆستایەتی کەوتە نێوانمانەوە، هاتوچۆی یەکترمان ئەکرد جارێکیان لەسەر چەند کەم بایـەخ دڵمـان لـە یـەك ئێشاو زیز بووین ئیتر نە ئەو نەمن یەکترمان نەدوان و دەنگمان لە یەکتر دابڕی رۆژێك لە ناو ماڵ و منداڵی خۆمدا دانیشتبووم نان و خۆراکی چـاکمان دروسـتکردبوو چـەند تیکەیـەکم خـوارد لـە خۆمەوە سکم دەستی کرد بە ژان و ئازار منداڵەکان رایانکرد بە دوای دکتـۆری بـرین پێـچدا بـە پەلە هێنایانە سەرم منیش قسەم لەگەڵیدا نەبوو، هاتە پێـشەوە وتـی: کوێـت دێـشێ و چـیتە؟! چونکە من قسەم لەگەڵیان نەبوو {و پارووێکی گەورەی شفتەم لە دەمدا بوو} ئیشارەم بـۆ کـرد پەنجەم دا لە گوێم ویستم تێبگات پارووم لە دەمدایە، با قوتی بـدەم و نەیـشم ئەیویـست قـسەی لەگەڵدا بکەم ئەویش دڵنیا بوو کە مەبەستم گوێمەو ئاوساوە و تیکە لە گەرووم گیراوە ئەویش بـێ یەك و دوو نیشتەرێکی تیژی کرد بە گوێماو شفتەکەی دەرهێنا ئەمـەیش جێگـەی برینەکەیـە کـە سیمای گۆڕیوم، ناشرینی کردووم.

ئەمجا کوێخا وتی کەوابوو سەلاوم لە هیچتان نەکردووە کە ئێوە عەقڵتان وا بێ!!!

* * *

لەوبەر کێوەدا لە ناوچەی سیوەیل دوو پیاو هەبوون هەردووکیان ناویان خدر بوو و زۆر بـرادەر بوون یەکیان خۆش ئەویست جارجار کە ئەکەوتنە ناو گەرمەی گفتوگـۆوە یـەکێکیان بـەویتریانی ئەوت دەبێ دەنگ بە خلە خلە ئەویش وەلامی ئەدایەوە: خوا هەڵ ناگرێ تۆ (محمدت) ناوە و لـەو (محمد) ناوانەیش نیت سەلاواتت لێ بدرێت.

* * *

## چیرۆکی گەڕان بە دوای حەزرەتی خدرا!

پیاوێکی ساویلکە هەبوو نوێژ و تـاعەت دروست خواپەرستی زۆر بەجێ بوو هەمیشە خـەریکی زیکر و فیکر و چاکە بوو ناوی سۆفی مراد بوو لە مەلای دێی بیستبوو کـە حـەزرەتی خـدر هەیـەو هەمیشە زیندووە، یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی خوا ئارەزووی ببێ لە هەر جێگایـێک ئـەتوانێ حـازر بێت هەموو مرۆڤێکی راستی پەروەر داوا بکات ئەی بینێت کە داوا بکـات و بگـەرێت بـە دوایانـا ئەیدۆزێتەوە جارێکیان بە خێزانەکەی وت من نیازی گەرانێکم هەیە ئەڕۆم خەزرەتی خدر ئەدۆزمەوە هەندێك نان و پێ خۆرم بۆ بکە تێ شووێکەوە کە بەشی پێنج شەش رۆژێك بکات هەرچەند ژنەکـەی ویستی پاشگەز بێتەوە لە نیازەکەی بێ کەڵك بووە بەڵێ بەیانی رێگای گرتە بەر پشت بەخوا جیهان بمگرە هاتم خدر گیان تۆ لە کوێیت؟! رۆیشت بۆ ماوەی چوار رۆژ هەر دوعای ئەخوێند و ئەپارایـەوە بە سوورەی: قول هو الله أحد، وە ألم نشرح... تاد راگوزاری لەگەڵ خۆیا خستبووە جووڵە بە: یا حیـی یا قیوم یا باقی أنت الباقی.. لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا ئەرۆیشت و بیری لە مام خدر ئـەکردەوە کاتێ پیاوێکی لێ پەیدا بوو پاش ماندوو بوون و هەواڵ پرسین وتی: خالۆ لەچی ئەگـەرێیت؟! بۆچـی وێڵیت؟ وەلامی دایەوە لە خدری زیندە ئەگەڕێم وتی چییە پێی؟! وتی ئەمەوێت پێی بڵێم ئەم دونیایە تاکەی وا بە چەوتی و خواری ئەڕوات؟! تاکەی ئەم ناحەقیانە چاو پۆشی لێ ئـەکرێت؟! تاکـەی ئـەم خەڵکە بە ناوی ئەوەی پیاوی خوان دەستی هەژارو ساویلکە ئەبرن؟ ئێمە تا کەی پشت ریـشی بـاری گرانی زوڵم و زۆری کاربەدەستانی بێ داد بین؟ ئەم خەڵکە وان کە خۆیان نیشان ئەدەن بە دیمەن چاك؟! وتی کاکە من خدری زیندەم دانیشە با وەلامت بدەمەوە، وتی نەخێر تۆ ئەو نیت کێ ئـەڵێت تـۆیش راست ئەکەیت؟؟ ئایا تۆش تەفرەم نادەیت؟ زۆری لەگەڵ وت نەیبیست وتی نیشانەو بەڵگەت چـییە؟ کە تۆ ئەوی وتی لێرەوە رووەو قیبلە ماوەی چوار یەکە سەعاتێك برۆ دانیشە سێ سـەلاوات لێ بـدە

چاوت بنووقێنە هاورێك بكە چاوت هەڵێنە شارێكت لێ دەرئەكەوێ برۆ لەوێ دوو پیاو بێنــە ئــەوان شاهیدیم بۆ ئەدەن من خدرم هەر كەسێك بێت تۆ حەقت نــەبێ، وتــی باشــە و چــاكی لێ هــەڵكردو رۆیشت وای كرد و چووە ناو شارەكەوە. شار چ شار!! گەورە و ئاوەدان و خۆش، شەقام و شۆستە رێك و پێك و دروست هەموو شت جوان و گونجاو چەشەدار، بەلاّم سەیر لەوەدابوو مرۆڤی لە قەوارە دیمەنی خەڵكی ئاسایی بەرچاو نەئەكەوت جارجارو بە دەگمەن ئەبوونەوە بە ئادەمیزاد ئەگینا گیان لەبــەری درِوند و ناشرینی ئەبینی گشت قیزەون و بۆگەن مرۆڤی ئەخستە هێڵنج دان و رشانەوە گورگ چەقەڵ رێوی بەراز سەگ پشیلە جرج مشك پڵینگ ئەسپێ گەنە.. تاد بە گەورەیی ئەمانە بی سڵەمینەوە لە هیچ بە كورتی ئەمانە بۆ خۆیان ئەسوورانەوە بە كام و ئــارەزوو نــەختێ رۆیــشت چــاوی كــەوت بــە مرۆڤێكی ئاسایی جل دروو — خیاط — ویستی پرسیاری لێ بكات مەقەستێكی دوو گاردی ئاراستە كرد وتی بێیتە پێشەوە چاوت بەم مقەستە دەردێنم لاچۆ تاقەتی شایەتی تۆم نییە كــە خــدر بــە تــۆ بناسم سێ چوارێكی وای بینی گوێیان ئاو دا بەم جۆرە وشانە و بابەتی وا كە تێینەئەگەیشت پاشــان رێگای كەوتەلای یەكێ تر تكای لێكرد وتی: لە گەڵمدا نایەیت حەزرەتی خدر بە من بناسێنی، بەلاّم تكا ئەكەم وەلاّمی پرسیارەكانم بدەرەوە وتی فەرموو وتی بۆچــی ئــەم شــاری ئێــوە بــە ئــەم گــشت جانەوەرو درِوندانەی تێدا ئەسووریێتەوە بەزۆری؟ جارجار نەبێ شكڵ و شێوەیان بەسەرا ئەكشێ وەكــو مرۆڤ وان ئەگینا بەسەگ و بەراز و پشیلە و رێوی دێنە بەرچــاوم گیــان لەبــەری زۆر دیمــەن پــیس و ناشرین و ترسناك؟! ئەویش وتی: برا گیان ئەمانە یەشتا نەبوون بــە ئینــسان ئەمــە دیمــەنی كــردارو نەفسیانە خۆی وا نابێت كە تۆ ئەی بینێ دیمەنی سروشتیان بێ كرداریان جوانە یان كرداریان بە پاكی بێتە دیوانی نووسینگەوە هەیانە خۆی وا ئەبینێ و دانی پیا نانێت یەكێ لەم وێنەیانە بۆ خــۆی هــەڵ ئەبژێرێت بۆ وێنە و تێگەیشتنی تۆ رێوی پیاوی فێڵباز و ساختە چییە لە هەموو بارێكیــدا ئــەتوانێ بژیت و هەر خۆی مەبەستە مەیموون چاولێكەرە، هەروا ئــەوانی تــریش بــەو پێوانەیەیــە تــازە ئــیتر بینینەوەی مامۆستا خدر لە دەستی تۆ چوو بچۆرەوە بۆ ناو ماڵ و خێزانی خۆت لەم رێگەوە وەلاّمی پرسیارەكانی ترت لە خدر لای خەڵكی خۆیەتی بە گۆرانی رەوشت و رەفتاری خۆیان. خوات لەگەڵ...

## چاوێكی كوێرە بە نۆبە:

كابرایەك بانگ ئەكرێت بۆ دائیرەی نفووس و تەجنید بۆ ئەوەی بیكەن بە سەرباز، ئەچێتە پێشەوە ئەیانەوێ نیشانە زەقەكانی بە جیاوازی بنووسن بــۆ وێنــە بــالاّی (١٧٠) سم گــەنم رِەنگە، خاڵێك لە روویدایە كابرای بنووس كە پیا ئەرِوانی چاوێك لێك ئەنێ و قیچی ئەكات ئەنووسێت چاوی راستی كوێرە كە سەر هەڵ ئەبرێت تەماشا ئەكات چاوی چەپی لێك ناوە و

قوچاندوویەتی ئەوی پێشوو رەش ئەکاتەوە ئەنووسێت چاوی چەپی کوێرە سەر هەڵئەبرێتەوە ئەبینێ راستی قوچاندووە ئەمیش رەش ئەکاتەوە بەم جۆرە یەك لە دوای یەك لە پاشان بۆی ئەنووسێت چاوێکی کوێرە بەنۆبە کە ئارەزووی بێت .

* * *

## خۆم بە خۆمم کرد بەرد بارانم کەن.

ئەمە بنچینەی چیرۆکێکە ئەیگێڕینەوە وەکو خۆی:!

لە شارێك لە وڵاتە ئیسلامییەکان وتیان پیاوێك وەکو شێت ئەروات و هاوار ئەکات و بەسەری خۆیدا ئەدات و ئەکێشێ بە خۆیداو ئەڵێت خۆم بە خۆمم کرد بەردبارانم کەن، توخوا خەڵکینە شار بەدەرم کەن هەر ئەرۆیشت و ئەمەی دووپات ئەکردەوە پیاوێك توند سەر شانی گرت و رایکێشا وتی مەسئلە چییە!!

چی روویداوە بۆ وا ئەکەیت و وا ئەڵێت؟ وتی بچۆ بۆ فلاّنە مزگەوت لەوێ منارەیەك هەیە دوو سێ پێ پیلکە سەرکەوە پەنجەرێك هەیە پیاوێك ئەکێشێت تەماشا بکە ئەمجا تێ ئەگەی کابرا لە دڵی خۆیدا وتی با تاقی بکەمەوە بزانم چییە و چی نییە؟!

هەڵساو رۆیشت تا گەیشتە مزگەوتەکە و منارەکەی بەدی کرد رۆیشتە پێشەوە چی بۆ دیاریکرابوو لەگەڵ وێردو دوعا خوێندن بە ئەنجامی گەیاند کاتێ تەماشای کرد چووە ئەو دیوەوە شارێکی گەورەی رازاوەی لێ دەرکەوت هەر وێنەی نەبوو هیچ ئاگای لێ نەبوو گەیشتە ناو شارەکەو دەستی کرد بە گەڕان بە کۆلاّن و شەقامەکانیدا رووانی گشت شت بەجێیە و رێکو پێکە رەفتار و کرداری خەڵك لە خەڵکی ئاسایی ناچێت، هەموو کەسێك فەرمانی خۆی بەجێ دینێ بەو پەڕی دڵسۆزییەوە هیچ کەسێك بێ کار نییە کەمێك سووڕایەوە تەماشای کرد خەڵکی ئەچنە بەر دووکانی گۆشتفرۆش سەلامێك ئەکەن و ئەڵێن: (لاإلـه الا الله محمد رسول الله) ئەوەندە گۆشتی فلاّنە حەیوانم بدەرێ، دەسبەجێ بۆی ئەکێشن و ئەیدەنێ لە پاداشتا ئەمیش ئەڵێت: (الحمد لله والشکر لـه) سوپاسی ئەکات و ئەڕوات بێ ئەوەی پارە بدات. کە هەستی لێگرتن گشت دوکاندارەکان ئەمە کاریان بوو لە کڕین و فرۆشتنا، گەیشتە نیوەڕۆ برسیبوو رۆیشتە لای نانەواخانەیەك بینی خەڵکی بەسەرە راوەستاون هەموو لەسەرەی خۆیدا وا ئەڵێن و نانی خۆیان بەقەد پێویست وەرئەگرن و ئەڕۆن ئەمیش وەك ئەوانی کرد، نانێکی گەورەی برژاوی جوانی وەرگرت بیری کردەوە بەچییەوە بیخوات ئارەزووی چووە سەر هەنگوین رۆیشتە لای بەقاڵێك ئەندازەی گوندکێکی بۆ خستەسەر کولێرەکەی لە پەنایەکدا پاڵی دایەوە

تێری خوارد ئەمجا دەستی کرد بە گەڕان تینووی بوو ویستی کەمێك ئاو بخواتــەوە لــەو کاتــەدا هەندێك ئافرەت و کچۆڵە هاتن گۆزەی ئاو بەسەر شانیانەوە بوو لە خۆیەوە داوای لە یەکێکیان کرد جامێك ئاوی بداتێ هەموو ژنەکان دەستیان کرد بە قاقای پێکەنین و ڕۆیــشتن تــەنها ئــەو ئافرەتە نەبێ جامێك ئاوی بۆ ڕۆ کرد و دای پێی نۆشی کرد ئافرەتەکە ڕووی تێکــرد وتــی وەرە لەگەڵما با بڕۆین وتی بۆ کوێ بێم وتی بۆ ماڵی خۆمان و لای دایکم و باوکم وتی، چــونکە تــۆ لەم شارەدا ئاوارەی و یەکەمجار داوای ئاوت لە من کرد من ئەبمە خێزان و هاوسەری تــۆ تــەنها بڕیاری دایکم و باوکم و قازی وەخت ماوەتەوە وەرە لەگەڵما دوام کەوە حــەقت نــەبێ ئــەمیش سەری سووڕما کەوتە تەکی بۆ ماڵەوە کاتێك لەبــەردەم قەسرێکی ڕازاوەی قەشــەنگا خۆیــان گرتەوە پێکەوە چوونە ژوورەوە دایك و باوکی خۆش هاتنیان و پیرۆزباییــان لێکــرد بــۆ بــەیانی وتیان هەڵسە بابچین بۆ لای قازی هەر ئەو ڕۆژە هەموو شتێك بــە ئــەنجام گەیــشت و ژمــارەی خانوویەکیان پێدا کە هەرچی پێویست هەبوو تیابوو پێکرا ئێــوارە بووکــو زاوا بــە کامــەرانی ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی خۆیان. جوانی و ناسکی میهرەبانی و هۆشیاری، خۆرەوشتی بەرز هی ئــەم ئافرەتە هەر باس ناکرێت و بێ وێنە بوو لەخوا ناسی و دڵنوازی دا وەکو ئەڵێن: حور مقصورات في الخيــام نەك هەر ئەم ئافرەتە لەم شارە ناوازەیە وابوو بەڵکو گــشت دانیــشتوانی لــەم بابەتــە بوون. لە پاش هەفتەیەك ژنەکە پێی وت پیاوەکە پێویستە تــۆیش، وەکــو خــەڵکی ئــەم شــارە کارێك بکەیت و فەرمانێ بدۆزیتەوە، چونکە لێرەدا مرۆڤی بێ فرمان و کار نییــە وتــی نــازانم چی بکەم شتی وا نــازانم؟ پێــی وت هەرچــی بتــوانی و بیزانــی و لێــت بوەشــێتەوە گــرینگ و بایەخدارە تەمەڵی و تــەوەزەلی و خۆدزینــەوە نییــە مووچــە و مانگانــە نادرێــت بەکــەس بــۆ هەڵگرتن و شاردنەوە هەرچیت پێویست بێت ڕۆژانە وەری ئەگریت و ئەچیتەوە ناو خێزانی خۆت شەڕو ئاژاوە و تاوان نییە.

ئەمیش هەڵسا چووە لای بەڕێوەبەری شارەوانی و دابەش و دابینی کردنی فەرمان کارگوزار ناردیانە سەر ئیشێکی سووك تا وردە وردە ڕا بێت ڕۆژێــك ڕۆیــشتە بــازاڕ دوو کیلــۆ گۆشــتی هێنایەوە لەگەڵ هەندێ سەوزە و شتی تر ژنەکەی لێی پرســی بۆچــی دوو کیلــۆت هێناوەتــەوە وەڵامی داوە قەی چی ئەکات با بمێنێتەوە هەڵی بگرە بۆ سبەینێ ئەیخۆین، وتی ئاخ چیت کرد، تازە تەڵاقت کەوت من لە تۆ حەرام بووم، وتی بۆ ژنەکە بۆ خاتری خوا چیم کردووە چیم وتووە؟ وتی مەعنای وایە تۆ توکلت نییە بە خوا بۆیە زەخیرە ئەخەیت و هەڵی ئەگریت خــوا حــافیزت بێت ڕێگای خۆت بگرە و بڕۆ لێرە مەمێنە هاتــە دەرەوە بــە خــەم و خەفــەتێکی زۆرەوە ڕووی کردە دەری شار و بیری ئەکردەوە کاتێکی زانی وا لە لێواری شارەکەی خۆیا وا نەوز ئەیباتــەوە

لەلاپاسارێکدا هەر چەند رۆیشتەوە بۆ پاڵ منارەکە ئیتر هەرچی کرد بێ سوود بوو ئەو خۆشی و شادییەی نەبینییەوە جارێکی تر. بۆیە حەق وایە هەر بڵێ ئەمیش

خۆم بە خۆمم کرد بەرد بارانم کەن

توخوا خەڵکینە لە شار دەرم کەن

* * *

باجێ حەیران ژنێکی قۆشمە و گاڵتەچی بوو بۆی گێڕامەوە وتی شێتێك هەبوو ئەم ویست پێی رابوێرم گوایە شێتەکان پاکو خاوێنن؟ دووسێ ژنم هێنا خستمە ژێر قەرەوێڵەکەمەوە خۆیان مەلاسدا لە ژێریدا و چووم شێتەکەم هێناو تێرم کرد وتم فلان گیان با پێکەوە بنوین حەز ئەکەم لەگەڵتا بخەوم وتی چۆن؟ وتم وەرە سەر ئەم قەرەوێڵەیە پێکەوە رائەکشێین وتی کەریلە باشە کە راکشاین وتی من فێرنیم سەر لەسەر سەرینی کەس بێ، چونکە خەوم لێ ناکەوێت، وتم ئەی چۆن باشە؟! وتی تۆ سەر بکەرە خوارەوە منیش سەر ئەکەمە سەرەوە جا لە خۆیەوە پێ ئەکەنی و ئەیوت: سەرم سوڕ ئەمێنێ!! ئەم نووستنە لە خۆش ئەچێ، بەلام راستییەکەی ناخۆشە ئەنجامی بەکورتی راکشاین قاچم ئەبرد بۆلای ئەی وت کەریلە وا نابێ منیش ئەم وت بۆچی تێدایە؟! ئەی وت قەت وا نەنوستووم وەکو تۆ ئەڵێیت بەدەنم پێی تێك ئەچێ و کێریشم بەقسەم ناکات وەرە کەریلە یەکێك پەیدا بکە وەکو من نەبێ {ژنەکانیش لە ژێر قەرەوێڵەکەدا لە پێکەنیندا پچڕابوون} وتی ئەوانەی پێ ئەکەنن لە ژێرمانەوە چین بۆ سەریان سوڕماوە؟! بەخوا من عەقڵم ئەمە ناگرێت!! ئەی مێردەکەت ئاوا لەگەڵتا نانوێت ئەی چۆن ئەنوێت؟! ئا تێگەیشتم ئەو کێری بە قسەی ئەکات.

* * *

## مەلا شێخ ئەلییە پەڕۆ:

مەلا شێخ ئەلیە پەڕۆ هەبوو پێشەوای نوێژ خوێن بوو لە مزگەوتێکی سلێمانی لەم دوایەشدا چاوی کوێر بووبوو چوو بۆوە سەر ئەو باوەڕو عەقڵەوە عیلمانییەکان هەرچی هەیە ئەیزانێ هەرچیت لێ بپرسییایە وەلامی ئەدایەوە هەرگیز دانەئەما، بەلام هیچیشی نەئەزانی بگرە هیچ فێر نەبوو بوو و کەمێك عەقڵیشی دابەزی بوو پاش نوێژی عیشا فاتحەی رەوانە ئەکرد بۆ خۆشەویست و ناسیاوەکانی بۆ وێنە ئەی وت: خوایە نیازم وایە ئەم فاتیحایە کە ئێستا ئەیخوێنم بۆ رەوانی پاکی پێغەمبەر و ئال و هاورێکانی و بۆ گشت پیاوکان و موسڵمانان بە تایبەتی بۆ

فلاّن پیاو و فیساره ژن و حاجی وه بۆ فاتمه خان و رەعنا خان و ئامینه خان بەلاّم بۆ سەلمه خـان، نەء چونکی داوای ماچێکم لێکرد نەی دامیٚ وه بۆ بەهێی کچی فلاّن حاجیش نـا، چـونکه هـەر داوای یەکێکم لێکرد نەیدامیٚ، بەلاّم بۆ فلاّن و فلاّن رەحمەتی خوایان لیٚ بـیٚ دەسـتیان نـەنا بـه رومەوه هەرچیم بوویستایه، بەلاّم فلاّن قەیناکه گەلٚ و کەفلێکی باشی پێوه بوو..

لێیان ئەپرسی فەقێکان؟! معنای چییه {قل هو الله احد} ئەیوت یـەعنی {الله الـصمد} هەروا... تاد (مەلا عبدالرحمن)ی گۆج شەرعی لا ئەخوێند له باسی زەکاتدا ئـەم ئەیخوێنـدەوه ئەویش مەعنای ئەکرد ئەیوت: واته کورِم گا زەکاتی لیٚ ناکەویٚ تا عمری نەگاته چـلٚ ئـەویش ئەیوت مامۆستا کوا گا چلٚ سالٚ ئەژیت؟ ئەی وت ئاخر بۆیه زەکـاتی لیٚ ناکـەوێت کـوا کـیٚ زەکاتی گا ئەدات؟ ئەم مەلایه بە هەزاران شتی سەیری هەیه.

❊ ❊ ❊

کابرایەکی شێت هەبوو خەلٚکی ئەو گەرمیانه بوو گـل و داوودە، زۆر حـەزی لـه خزمـەتی شێخ محمودی گەورەی کورد پەروەر ئەکرد ناویشی له خۆی نابوو بولبولی کوردستان. جارێکیان له خزمەتی شێخ دا ئەبێت فەرد فەرد شیعر و هۆنراوەیشی ئەوت خەلٚکیش به شێتیان ئـەزانی قسەی حەلەق و مەلەقی ئەکرد جارێکیان شێخ داوای لێکرد که فەردەیەك لـه شـیعرەکانی بـۆ بخوێنێتەوه ئەویش وتی قوربان کویٚ بگره لەم فەردەم:

سەگ له بەهاران چاوی له هاری نێرەکەر شاخی کرد ریشەی دەرباری

شێخ وتی بولبولی کوردستان تێی ناگەم وتی قوربان زۆر ئاشکرایه تـیٚ بگەیـشتیتایه خۆت بەلاّم چونکه قافیەم سواره ئەتوانم بلێم دابرِاوی ملی کێره ، یان کەشـتی حـەززەتی نووحه شێخیش کەمێك بیری کـردەوه دای لـه قاقـای پێکـەنین وتـی: ئافـەرین بولبـولی کوردستان بۆ خۆت و فەردەت. واته پیاوی گەوج دەولّەمەند بوو خۆی به تاشێکدا ئەدات، دەمار ئەکات و سەری گەرم ئەبیٚ.

❊ ❊ ❊

شێخێکی ناسراوی ئەم دەورە وەفاتی کرد عالـەمێکی زۆریش رۆیشتن بۆ سەرخۆشی کردن له جیٚ نیشینی که کورەکەی بوو ، دەروێشێکی ساویلکەی هەژار و ساده ئەگریا و سـۆزی ئـەکرد به کولٚ کورەکەی شێخ بانگی کرده لای خۆیەوه وتی دەروێـش ئـەوەی پـیٚ نـاویٚ خـوا جـەزای

خێرمان بداتەوە، ناوی خوا بێنە گشتمان ئەمرین. وتی یا شێخ بۆ ئەو ناگریم بۆ تۆ ئەگریم وتی بۆچی؟ وتی چونکە تۆ کەری ئەو بارە نیت.

❊ ❊ ❊

قالە شێت هەبوو لە سلێمانی شێتێکی زۆر خۆش بوو، زۆر حەزی لە سواری ئوتۆمبێلی (مصلحە) ئەکرد ئەوانیش سواریان ئەکرد و پارەیان لێ ئەسەند جارێکیان سوار بوو بۆ گەڕەکی عقاری (شۆڕش) زۆری پێ نەچوو کچێك و دایکێك سەرکەوتن، بەڵام کچە پۆشاکێکی پۆشیبوو مرخ بزوێنی پیری ئیفتادەی هەشتا ساڵەبوو قالەش لە خۆیەوە وتی هەی کێرم بە قو.... کابرای جابی توند دەستی نا بە دەمییەوە و گرتی سەری راپسکاند و رووی تێ کرد و وتی: ئەی کێرم بەچی؟! ئەمجا هەڵسا چووە بەردەمیان وتی (١٠) فلسم بدەنێ هیچتان لێ ناکەم ئەوانیش وتیان: بە پێکەنینەوە هەیرۆ چیمان لێ ئەکات؟ قالە مەبەستی وابوو دەسیان لێ ناوەشێنێ نەك ئەویتریان.

❊ ❊ ❊

ئافرەتێکی بێوە ژن ئەبێ جوان و هەرزەکار ئەبێ و دیانەتیشی دروست ئەبێ (دائیم الأستعاضة ئەبێ)، واتە هەمیشە خوێنی حەیزی بێ نوێژی هەیە ئەچێتە خزمەت شێخی ماویلیان پرسی پێ ئەکاو ئەیەوێ دوعای بۆ بنووسێت بە مەعناوە پێی ئەڵێت: قوربان زەوییێکم هەیە هەمیشە زۆنگە و ئاو دەڵێنێ چارەی چییە؟ ئەویش تێئەگات ئەڵێت ئەو زەوییە بیدە بە من ئەمەندەی مێخ پیا ئەکوتم لە هەر کوێوە بیدەڵێنێ مێخێکی پیا ئەچەقێنم تا وشك ئەکات، ئەمجا بە مارە بڕین کۆتایی دێت وشکی ئەکات و ئاوی تێ بەرئەدات.

❊ ❊ ❊

کابرایەك ئەچێتە خزمەت مامۆستا شێخ مستەفا نەجیب لە مەجلیسدا دائەنیشێت جگەرەیەکی ئەداتێ کە مامۆستا دای ئەگیرسێنێ ئەپەڕێتە قورگی زۆری ئەکۆکێنێ و ئاو بە چاویدا دێتە خوارێ ئەڵێ فلان کەس ئەمە چی بوو؟ دیارە زۆر توند و گەرمە ئەڵێت بەڵێ قوربان وایە نێرەکەر پژێنە نێرەکەر تڕێنە زۆر چاکە.

❊ ❊ ❊

ساله شێت هەبوو لە سلێمانی شێتێکی سەیر بوو رەفتار و کردارو بەسەر هاتی زۆر بوو باوکی پیاوێکی هەژار بوو لەگەڵ خۆیا ئەیگێڕا تا منداڵان ئازاری نەدەن و سەمونیشی ئەفرۆشت بانگی ئەکرد سمونی جوان و گەرم و هەرزان خەڵکینە وەرن بیکڕن نامێنێ، ئەمیش دوا بەدوای باوکی ئەیوت والله درۆ ئەکات سارد و سڕە، ناشرینە لە دوێنێوە ماوەتەوە سەگ نایخوات و قوت ناچێت مەیکڕن و درۆ ئەکات.

* * *

ئافرەتێکی کردار و رەفتار جوان، نوێژ و رۆژ و دروست. بڕوای بە ساله شێت بوو خۆشی ئەویست لای وابوو پیاوی خوایە وەلییێکی نەزانە رۆژێکی منداڵان بەر پەلیان دابوو ئەمیش رای ئەکرد ژنەکەیش دەرگای حەوشەی لێ کردەوە نان و چاو خواردنی بۆ دانا دەستی کرد بە خواردن لەبەر خۆیەوە ئەی وت پووریێ گشتی بخۆم ئەویش ئەی وت ئا ساڵە گیان ژنێکی جوان خاسیش منداڵێکی بە بەرەوە بوو هاتە ژوورەوە ژنە خاوەنماڵەکە وتی ساڵە گیان دوعایەکی خێرم بۆ بکە وتی بڵێم چی؟! وتی بڵێ خوا لێت خۆش بێت عەفوت بکا، وتی یارەبی خوا لێت خۆشبێت عەفوت بکات، ژنەکەی کە منداڵی بە بەرەوە بوو وتی دوعایەکیش بۆ من بکە وتی بڵێم چی؟ وتی بڵێ یارەبی خوا ئەم کوڕەت لێ نەسێنێ هەر بۆت بمێنێ وتی هەی کێرم بە ( ) خوا بە گوێی من چۆن ئەکات هەر وای وت هەڵساو رۆیشت.

* * *

لە هەولێر مەلایەك هەبوو هەمیشە مارە بە جاشی ئەکرد کوێرێکی هەڵبژاردبوو تەرخان بوو بۆ ئەوەی بیکات بە جاش ژنانی تەلاق کەوتووی لێ مارە ئەبڕی تا پاش زاوابوونی بە پارە تەلاقی بداتەوە بۆ شووە کۆنەکەی جاش پێ کردنی لە ژمارە تێپەری و کوێرە بۆ خۆی خەنی بوو بوو بە پارە گانی ئەکرد و بە کرێ ئەگێرا ژنەکانیان بگێت.

رۆژێ کوێرە دێت بۆ مزگەوت مامۆستا چاك و چۆنی لەگەڵدا کرد، وتی فلان چۆنی؟! وتی قوربان زۆر چاکم، بەڵام هەرچەند چاوم بە جەنابتان ئەکەوێ کێرم رەپ ئەبێ....

* * *

پیاوێك هەبوو لە ئالی بەیان کە دێیەکە لە بناری شێخ بزانی سەر بە ناوچەی رێدار - ناحیەی شوان — ژنێکی زۆر جوانیش هەبوو، ئەو پیاوە زۆر حەزی ئەکرد لەم ژنە بە دەوریا ئەهات و ئەچوو بۆی بخەڵەتێ رۆژێك لەو شیوو دۆڵانە یەك ئەگرن پێی ئەسەلمێنێ لەگەڵیا جوت

و دروست بێت، كە ئەچێتە مەسافی جەنگەوە نەبەرد ئەدۆڕێنیٚ دەعباكەی هەڵناستیٚ و سەر شۆڕ ئەكات كابرا ئەڵیٚ: هەڵسە دایكم تۆ پیاوەتی خۆتت كرد، بەڵام ئێمە سەگ و سەگباب بووین ناپیاو دەرچووین گوو بە ریشی خۆم و باب و باپیرم بۆ دڵدارییێك كردم!!!!!

* * *

پیاوێك هەبوو مام ئەحمەدی ناوبوو وەكو كوفرە ئەحمەد وابوو هەمیشە لەگەڵ خۆی و خوایا لە كێشەدا بوو، كە هەژارێكی ئەبینی بیٚ هێز و تینێكی بەرچاو ئەكەوت، سەری بەرز ئەكردەوە روو لە خوا ئەیوت: دە ئەوەندە بەندەو عەبدی خۆت دروست بكە كە پێت بەخێو بكرێت یام دروستی مەكە یان بارێك و جوان و كەساس نەبێت، جارێكیان ئەیویست شاخێك ببڕێت و بەسەریا سەر بكەویٚ دوعای كرد خوایە یەكێك بنێریت ولاخێكی زیادی پیٚ بێت هەڵم بگرێت تا سەر بكەوم كەچی لەو كاتەدا دەرەبەگێك دێت بە ماینێكی ئاوسەوە دەسبەجیٚ لەوێدا ئەزێت و جوانوێكی ئەبیٚ پاش نیو سەعات كابرای ئاغا بانگی ئەكات ئەڵیٚ ئادەی سەگباب ئەم جوانووە هەڵ بگرە بیدە بە كۆڵتا ئەمیش هەڵی ئەگرێت تا سەر ئەگەوێت روو ئەكاتە خواو ئەڵیٚ: - نعوذ باللە — كە تۆ دوعای خەڵكی تیٚ ناگەیت بۆ قبووڵی ئەكەیت؟

* * *

## لە كەركوك پیاوێكی دوو ژنە:

پیاوێك ئەبیٚ لە كەركوك دوو ژنی ئەبیٚ هەرگیز رێك نەئەكەوتن هەمیشە لە شەڕ و جەنگا ئەبن، ئەمیش بە راستی لە هیچیان ئارەزووی ناشكێت و تێر نابیٚ بۆ لای هەركامیان ئەڕوات ئەویتریان لێی تێكی ئەدات، جا دێتە سەر ئەو باوەڕە فێڵێك دروستبكات ئەچێتە لای ژنە گەورەكەی پێی ئەڵێت ئەمەوێت هەوێكەت بخنكێنم، بەڵام تۆ خۆت بكە بە تۆراو و برۆ ماڵی باوكت، ئەم شەو مەیەرەوە تا سبەینیٚ منیش ئەیخنكێنم لە كۆڵمان ئەبێتەوە ئەمیش ئەڵێت باشە شەو بیر ئەكاتەوە لە دڵی خۆیدا ئەڵێت ئەگەر فێڵ بێت با ئاگام لیٚ بێت و ئەگەر راستیش بێت تووخوا باچاوم لیٚ بێت چۆنی ئەخنكێنی، دڵم پێی خۆش بێت. ئەیكات بە بیانوو شەڕ لەگەڵ ژنە بچكۆلەكەدا عەبا ئەدات بەسەریا گوایە ئەڕوات!! دێت خۆی ئەئاخنێتە ناو پووش و سوتەمەنی كە گزریان خستووە لەبەر تەنوورخانەكەدا خۆی لەویٚ مەڵاس ئەدات، كاتیٚ پیاوەكەی دێتەوە لە ژنەكەی ئەپرسێت: ئەڵێت تۆڕاو رۆیشتەوە بۆ ماڵی باوكی جا ئەمانیش

دوو به دوو دەس ئەکەن به کاری خێر نه جارێك و نه دوان و نه سیان، ئـەمیش لێـرەوە چـاوی لێیەتی وەخته دیق بکات، ئالۆش ئەمیشی بزواندووە ناچار دڵی شـەق ئـەبات و دێتـه دەرەوە ئەڵێت: حیزبابی سەگباب جارێکیش من وا بخنکێنه وا سوێم بووەوە ئەمـه چـەند جـار ئـەوت لەسەر یەك خنکاند؟!!

ئاخ له دەس مەکری ژنی حیلەباز

هەزار مەلا و شێخ دەرئەکا له راز

* * *

## مام مەتران و مامۆستا مەلا محمد امینی شێت:

پیاوێك هەبوو لای خۆی عاقڵ و دونیا گەڕیدە بوو به نـاوە پینـه چـی بـوو کۆنـه و شـتی ئەفرۆشت نوێژی ئەکرد و رۆژوویشی ئەگرت، بەرگ و کاڵایـەکی سـەیری ئەپۆشـی لەخانـەقای مەولەوی ژوورێکی بچووکی پیێ درابوو تیا ئەژیاو خێریان پیێ ئەکرد کڵاش و قۆندەرەی پێکەوە لەپیێ ئەکرد کەوێك و کورتەکێکی به سەرا ئەپۆشی پشتێنێکی دووسیێ رەنگی ئەبەسته پـشتی له باتی دەرپیێ پانتۆڵێکی باریکی ئەکردە پێی سوخمەیەکی قەدەیفەی له ژێرەوە ئـەکردە بـەر، مێزەرێکی سپی مەلایانەی ئەکردە سەر، ریشێکی درێژی دوو فاقی ئەهێشتەوە، چاوەکانی بـه کلی سورمه خەست خەست ئەڕشت، ریشی له خەنه ئەگرت ناو بەناو سمێڵی له کۆتـەرە ئـەداو ئەیتاشی دانەکانی وەری بوون تەنها دوو دانی پێشەوەی نەبیێ، درێـژ سـەریان دەرهێنـابوو لـه شفرە ئەچوو، لوتیشی هەمیشه دڵۆپەی ئەکرد، پاڵتاوەکەی هاوین و زستان به بەریا دوورابوو، له جوببەی مەترانی ئەکرد چاوێکی پووك بوو، مەگەر هەر دەستی کردگار بتوانیێ وای دروست بکات، بەخۆیو رەفتار و بیێ وێنەیی، گشت پیشەییێکی کاڵایی بەخۆیەوە گرتبوو.

مامۆستا مەلا محمد امین: شێت بوو پیاویەکی پاك و خاوێن، نوێژ و رۆژوو دروست بوو، هـەر له هەمان خانەقای ناوبراو ئەژیا، شێتیش بوو، تەواو لەسەر خۆی نەبوو، یەخەی ئەم و ئـەوی زۆر ئەگرت، شەڕانی بوو هەر کەسـێکی بگرتایـه ئـەیوت: قوربـان جـەنابتان کـێن و چـین؟! بـەخوا ئەحمەقیت، زۆر کەری رەنگت پـیێ ئەچـیێ زۆر خـوا ناسـی ناکـەیت کـه شەڕێکیـشی بکردایـەو بگەیشتایه تینی ئەی وت بەخوا کەر و سەگبابی قوربان خۆ کفرم نەکرد دەواز بێنه که پتر ئـەبوو شەڕەکەی هاواری ئەکرد گەوادیێ نییه له یەکمان بکاتـەوە؟! قوربـان بـا خۆمـان ئـەم شـەڕەمان دوابخەین!! پەلەمان چییه؟ دانیشه باوکم من شەڕ ناکەم ئەم پیاوە لای خەڵکی خۆشەویـست بـوو

ڕێزیان لێ ئەنا، چونکە هەمیشە بەراستی عیبادەتی ئەکرد دونیای بەهەند نەگرتبوو، بەرگو پۆشاکێکی مەلایانەی جوانی ئەپۆشی ئەم مامۆستا مەلا محمد ئەمینە و مام مەتران ڕۆژی پتر لە پێنج جار ئەکەوتنە دەمەتەقێ لەگەڵ یەکتر و یەکتریان ئەخستە گریان گریانێکی زۆر بە کوڵ لەگەڵ خۆرهەلاتا مامۆستا ئەچووە تەنیشت مام مەتران ئەی وت: تووخوا تۆ بەچی مەشهوری و ناوت چییە؟ خەلکی چیت پێ ئەلێن؟ ئەوە بۆچی منداڵ دوات ئەکەون و ڕاوت ئەنێن؟! ئەویش ئەی وت: توخوا وازم لێ بێنە مەلا محمد امین هەرچیم پێ ئەلێن بلێم چی؟! ئەی وت ئاخر حەز ئەکەم بزانم تێبگەم وەلامی ئەدایەوە پێم ئەلێن مەتران ئەی وت جا مەتران مەعنای چییە؟ ئەی وت یەعنی گاور ئەمیش ئەیوت جا توخوا تۆ گاوری چۆن دێیتە ناو مزگەوتی موسڵمانەوە؟! هەر هەردووکیان پەرستگایە وەلامی ئەدایەوە کوڕە خۆ گاور نیم هەر وام پێ ئەلێن ئەی وت ئەی گاور نابێ لە خوا بترسێت؟! ئەی ئێمە بۆ ناچینە کەنیسەی گاور؟ ئەی وت: کوڕە گاور نیم هەر پێم ئەلێن مەتران تۆ لات وایە لای خوا لە من گەورەتری کێ ئەزانێ وەکو خۆت ئەلێیت وابێ؟!! مەلا محمد امین دەستی ئەکرد بە گریان ئەی وت واللە ڕاست ئەفەرموویت توخوا عەفوم بکە چۆن ئەبێ موسڵمان دڵی یەکتری ئازار بدەن و زیزی بکەن؟! جا هەڵ ئەستا دەستی ئەکردە ملی هەر دووکیان پێکرا ئەگریان جا کە ژێر ئەبوونەوە هەر دەسبەجێ ئەی وت: ئەوە منداڵەکان پێت ئەگەن چۆن ڕزگارت ئەبێ لە دەستیان واللە مەگەر تانجی ئەوەندە ئازابێ؟! بەخوا سەیرە لام وایە وەکو گۆڵە بەراز وابیت مالۆس بە دواتەوە بێ کە کاتێ ڕائەکەی!! پشوویەکیان ئەدا دیسان ئەرۆیشتنەوە بن دەستی و ئەی وت ئەی هیچ کەس و کارت نییە؟! جا توخوا عەیب و شوورەیی ناکەی سواڵ ئەکەی؟ کردەوەکانت ڕەفتارت وەکو مەتران وایە ڕەنگە خۆت نەزانی هەر مەترانی؟ جا توخوا لە قیامەت تا تۆ مەتران بی چی ئەکەی؟! ئەی هاوار لەو ڕۆژە سەختە!! ئیتر هەردووکیان بە کوڵ ئەگریانەوە ئەمە پیشەیان بوو ڕۆژی چەند جارێك.

* * *

## حەز لەو کەر بازارە ئەکات:

لەو سەردەمەی جەنابی مەلا مستەفای بارزانی، پێش ئەوەی بڕوات بۆ وڵاتی شۆرەوی، وەکە کۆماری مهاباد دروست ئەبێ پیاوێکی هەژاری عەقڵ سووك ئەبێ بە ئاشنای ئەمیش لە ترسی خواونێك نەفسی خۆی گرژی لە ڕوودا نانوێنێ ئەو پیاوەش بە عەقڵی خۆی هەر تەنها ئەمی خۆش ویستووە جا کە گەڕایەوە عێراق و شۆڕشی دووبارە هەڵ گیرساندەوە ئەوەبوو

سەرکەوتنی باشی بە دەسهێنا ناوچەکانی کوردستان زۆربەیان رزگاریان بە خۆیانەوە بینی ناو بەناو وتوویژێك ئەکەوتە نێوان میری و مەلا مستەفاوە و مێژوو بەسەر هات رۆژنامەکانی عالەمی ئەم گەواهییە ئەدەن، واتە هیچ کەس وێنەی ئەم نەبووە سەرکردە بێ و ئەوەندە فەرمان بەرداری ئەبوون، گوێ رایەڵی لە ناو پردان و حاجی ئۆمەراندا بنکە و بارەگای ئەمی گرتبووە خۆی و مەلا مستەفا زوو زوو سەری ئەو ناوەی ئەدا.

کابرای ناوبراوی کۆنە ئاشنای بارزانی کە زانی مەلا مستەفا وا دەسەلاتی پەیدا کردووە و سەرۆکی حیزب و شۆڕشێکی وا گەورەیە هەر لە ئێرانەوە قەلەندەر ئاسا ئەکەوێتە رێگاو دێت بۆلای و بە خزمەتی دۆستی ئازیزی شاد ئەبێ ئەمیش زۆر رێزی ئەگرێ و رووی پێ ئەدات بۆ خۆی مایەوە لەوێ؟ هەرچەند مەلا مستەفا بەخشش و دڵسۆزی و میهرەبانی بۆ نواند، پارەو شتی پێدا نەیویست داوای لێکرد کە بچێتەوە نیشتیمانی خۆی نەی بیست. دوکانێکی بۆ خۆی دانا، شەکر و چاو شتی بەقاڵی لێ دانا سەربەستانا بۆ خۆی ئەژیا خەڵکیش بە گومانەوە تەماشایان ئەکرد گوایە جاسووسی شای ئێرانە گوێی لێ نەبوو هەروا باری ژیری تەواو نەبوو هەرچی بەدەمدا بهاتایە ئەی وت جنێوی بە حکوومەتی عێراق و ئێران و پێشمەرگە وەکو یەك ئەدا. مەلا مستەفا هەرچەند رێگای بکەوتایەتە ئەوێ کەمێك لای ئەم ئاشنایەی پشووی ئەدا و پرسیار و ئەهواڵی ئەپرسێ ئەمی بە هاورێیکی بچووکی خۆی ئەزانی و شەرمی لێ نەئەکرد.

رۆژێ بارزانی داوای لێ ئەکات کە بچێتەوە بۆ ئێران ئەم گشت گیر و گرفتێکی بۆ تەخت ئەکات و یارمەتیشی ئەدات وتی نایکەم وتی ببە بە تەتەر وتی نایکەم: وتی بچۆ بۆ بەغداد لەوێ دات ئەمەزرێنم بۆ خۆت دانیشە و بحەسێرەوە وتی نایکەم وتی ئەی چیت ئەوێ و لات باشە؟! وتی بارزانی وازم لێ بێنە با چاوێکم لێتان بێت، چونکە حەز لەم کەر بازارە ئەکەم ئەویش زۆر پێئەکەنێ و ئەڵێ بە خودای ئەتوو راست ئەکەی ئەمەی ئێمە دەیکەین کەر بازارییە ئەگینا....؟! ئێمە لامان وایە ئەم باری عەقڵی لارە سەنگە.

* * *

### ئەو کونە کونی خۆی نەبوو:

خانمی وەسمان پاشا جارێکیان لە دیوەخان دائەنیشێت لەگەڵ سەرەك هۆز و عەشیرەتی جافەکان دەست و پێوەند و نۆکەر لە خزمەتیا ئەبێ وا زانراوە ئافرەتێکی زۆر لێهاتوو بووە لە گشت مەیدانێکا سوار چاك بووە، بەپێی جێگا و شکۆی خۆی جلوبەرگی چاکی پۆشیوە

ئەوەڵکراسێکی پان و پۆری لە پێدا ئەبێ هیچ ئاگای لە خۆی نابێ کاتێك ئەزانێ مارێکی درێژ خۆی ئەکات بە ناو دەرپێکەیدا دیواخانیش جمەی دێت لە پیاو، ئەمیش هیچ خۆی تێك نادات دەس ئەبات توند سەری ئەگرێت هەرچەند گینگڵ ئەدات و پێچ ئەخوات رزگاری نابێ و دەس شل ناکات تا شل ئەبێ بە تەواوی پاشان داوا ئەکات دیوەخان چۆڵ ئەکەن، چونکە مەسئەلەکە ئاوایە، ئیتر ئەبێ بە مقۆمقۆ و لەغوە پیاوێکی هەژاری جووتیار ئەپرسێت و ئەڵێت قوربان ئەوە نیازی چی بووبێ؟! ئەویش هیچ شەرمەزاری ناکات و ئەڵێت رۆڵە بۆ کون ئەگەڕا خۆی بۆ ئەوێ ئەکوتا، نەمان هێشت بگاتە ئەو کونەی، چونکە کونی ئەو نەبوو.

* * *

## ئەمەیش جۆرێکە لە گەوادی:

پیاوێ هەبوو لە مۆریاس ناوی سەعدوون بوو ئەم پیاوە زۆر ژیر و دونیا گەڕیدە بوو، چاك و خەراپی هەڵسەنگاندبوو هیچ دانە ئەما بۆ وەڵام و پرسیار چیرۆکی خۆش و سەیری لابوو قسەی قوت پەندو بەسەرهاتی زۆر لەبەر بوو چاوپۆشی لەکەس نەئەکرد.

جارێکیان ئەحمەد موختار (ئەحمەد موختار بەگ) بە خۆی و چەند خزمەتکارێکەوە دێتە دێی مۆریاس و ئەبێ بە میوان، دوو دۆشەکی بۆ راخرابوو لەسەر یەك جەنابی بەگی لەسەر دانیشت خەڵکی مۆریاسیش تێکرا لە خزمەتیا دەسە و کەمەر وەستابوون چاوەڕێی فەرمانی ئەو بوون چوار پێنج ملی خۆیان ئەشکاند ئەمیش دانیشتبوو قسەی بەرز و کەڵەکەڵەی ئەکرد.

جا کاتێ هەڵسا ئۆغر بکات و دوعا بخوازێت چوون ئەسپەکانیان بۆ زین کرد هەر ئەسپێك سێ و چوار پیاوی دارسکابوو رایان ئەکێشا یەکێك پێڵاوی دائەنا یەکێترپاکی ئەکردەوە مام سەعدونیش لە خۆیەوە کە میر هەڵسا، واتە ئەحمەد بەگ رۆیشتە پێشەوە سێ چوار پەلاپیتکەی لە شان و بە رۆکیدا بەگ وتی مام سەعدون ئەوە چییە؟! وتی ئەمەیش جۆرێکە لە گەوادی، هیچ بۆ من نەمایەوە هەر ئەمەیان نەبێ جەنابتانیش ئەبێ لێم قەبووڵ کات، دڵگیر نەبن هەر کەسێك جۆرێك سووڕ و پێچی پیا ئەدات باریکان و قەویان ئەڕێسن. ئەم خەڵکە لێی رازی نابن تا منیش وەکو خۆیان لێ نەکەن منیش بەم منداڵی خۆمەوە هەر ئەوەندە عەقڵم پیا ئەشکێت برۆمە پەنای ئەو شاخ و پاڵە ئەمکەن بە رایەڵ چیخ و هەرزاڵە شێخ و بەگ خۆش بن هەر من ئەمساڵە ئەبم بە کوێخای درۆی گۆپاڵە...

* * *

من له خزمەت مامۆستا مەلا شێخ محمدی بالیساندا بووم پێکەوە ئەچووین بۆ شـەقلاوە لە رێگا تووشی مامۆستا مەلا محی الدین شێت بووین زۆر ئەدوا، هەمەجۆر، مامۆستا لێی پرسی: مامۆستا ئەوە مەعنای چییە؟ خوا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموویت: (لا یسئل عمل یفعل وهم یسئلون)؟! وتی بەسەری ئێوە تەفسیرێکی لێ ئەکەم بیضاوی نەیزانی و پەی پـێ نەبردبێ، یەعنی خوا ئەوەندە ئیشی قۆڕ و فەرمانی هیچ و بێ کـەڵك ئـەکات پێـت نـاکرێ بپرسیت: ئەمەت بۆ وا کرد؟ ئەوەت بۆ والێکرد؟ چـونکە بـە هـەزاران پرسـیار هەیـە وەڵام ناداتەوە هەمووی غەڵەتە، بەڵام ئێمە لە ماوەی ژیاندا هەر یەکێ یان دووان کاری بـێ جـێ ئەکەین لێمان ئەپرسێتەوە بگرە و بکوژە لەسەر ئەم ئیشانەی کەسێك نییە چاوێکی لێ زیت بکاتەوە چاوێکی لێ سـوور بکاتـەوە، رێگـای نیـشانبدات، چـاکە هـەر وایـش ئەویـستێ {أستغفرالله نعوذ بالله}.

❋ ❋ ❋

ئەحەی جاو هەبوو لە سلێمانی شێت بوو بەڵام شێتێکی سەیر بوو قسەکانی نەستەق و پەند و جێگیر بوو، خەڵکیش حەزیان لە قسەی ئەکرد بۆیە سەریان ئەخستە سەری ئەم شێتە هـەژار و لەسەرخۆ بوو، تا تەواو گیانە سارت نەکردایە هەڵ نەئەچوو، رۆژێکیان منداڵێکی جوانکیلـە زۆری ئازاری ئەدات و جنێوی پێ ئەدات ئەویش ئەیگرێت و ئەیدات بە زەویدا ئەیخولۆفێنێتەوە زۆر چاك، پۆلیس ئەیگرن و ئەیبەن بۆ بەندیخانە و بەندی ئەکەن، گوایـە ویـستوویەتی لـە نـاو خەڵکا سواری ببێت.

پاش چەند رۆژێك ئەیبـەن بـۆ دادگـا و بـە ئـارەزووی خۆیـان لەسـەری ئەنووسـن و بـۆی ئەهۆننەوە، پتریش مەبەستیان ئەوە ئەبێ، بەڵکو حاکم حوکمی بدات و بینێرن بۆ شێتخانە کە ئەیکەن بە ژووری دادگادا حاکم هەڵ ئەچـێت و تـوورە ئـەبێ پێـی ئـەڵێت: سـەگباب بۆچـی ویستوتە ئەم منداڵە فەساد بکەی؟! هیچ وەڵامی ناداتەوە و تا سـێ چـوار جـار پاشـان ئـەڵێ سەگباب بۆ وەڵام نادەیتەوە؟! ئەویش لەسەر خۆ ئەڵێ: قوربان بـۆ تـوورە ئـەبی!! ئـەو گـەڵ و قنگوکەفەڵە بەوەوە هەیە بە تۆیشەوە بوایە تۆیشم هەر ئەگا رزگارم نەئەکردی بێ قەزابی.

❋ ❋ ❋

### ئەو خەڵووز بە مێوژ تێ ئەگات:

جارێتر ئەحەی جاو قیر تەبەقێکی دانابوو هەندێك نوقڵ و چکلێت و مێوژ و خەڵوزی پیس و تۆز لێ نیشتووی دانابوو لەسەری بەیەکەوە ریزی کردبوو، گوایە پیاوەکە کەسابەت ئەکات و شت ئەفرۆشێت، جا یەکێ لە کورِ و کاڵ و قۆشمەچییەکانی سلێمانی دەوری لێ ئەدەن و مامەڵەی لێ ئەکەن ئەمە بە چەند و ئەوە دانەی بە چەندە؟! ئەویش هەر یەکێکی بە (١٠) قران یان یەك روپیە ئەفرۆشت یەکێك (١٠) فلسی ئەداتێ و لە باتی ئەوەی مێوژ هەڵبگرێ و بیخوات، ئەچوو خەڵوزەکەی دانە دانە هەڵئەگرت و ئەینایە ژێر ددانی و ئەیکرمان هاورێیەکی پێی ئەڵێت: ئەرێ کابرا ئەوە چی ئەکەیت؟! تۆ نازانی خەڵووز ئەکرمێنێ ئەحەی جاویش ئەڵێت: باوکم بۆچی نایەڵێ ئەم خەڵکە کەسابەت بۆ خۆی بکات؟ پیاوەکە واتێ ئەگات و وای لاخۆشە مێوژ بە خەڵووز تێ ئەگات!! دەبڕۆن خواتان لەگەڵ.

❊ ❊ ❊

لە شێخ بزێنی دێیەك هەیە ناوی تولکییە منیش رێم کەوتە ئەوێ پیاوێکی زۆر پیری سەد ساڵ تەمەنی لێ بوو کەمێك لەسەر خۆ نەبوو بە هۆی پیربوونەوە خوێندەواریشی هەبوو، بەقسەی خۆی زۆر برادەری شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیر بووە ئێمەش دوواندمان شیعری ئەوی زۆر لەبەر بوو، بەلاّم شیعرێکی بۆ وتین، منیش خێرا دەسبەجێ نووسیمەوە، بەداخەوە بەرێکوپێکی زەبت نەئەکرا ئەمەیش شیعرەکەی شێخ رەزایە کە لە دیوانەکەیدا نییە:

لاف بەرلاف ئەلف راستەی دەرخانەی کاف

دوو شاخی ئەرخەوانی دەرهەوا کەرد

گوڵی سورخ و سفید لێکدی جودا کەرد

قەرەبینای پێوە ناو خۆی بەکونا کەرد

لە خۆشیی پڕ کۆشی ئەشرەسی رەواکەرد

هەرواگێرایەوە جارێك شێخ رەزا ئەچێتە ئێران و لەوێوە رێگای ئەکەوێتە لای شێخەکانی بالاّگیر کە جێگایەکە لەو ئێرانە لە ناکاو خۆی ئەکات بە ماڵی شێخدا ئەبینێ شێخ وابەسەر دەروێش ژنێکەوە پێچاڵی جۆلاّیی ئەنێتەوە شێخ رەزایش ئەم شیعرە ئەڵێ:

بەهبەه لە سایەی قطبی بالاّ گیرەوە

گون ئەکا تاقمانە جوتو کوس بە کەللەی کیرەوە

ئەم چوار خشتەکیەی بۆ خوێندمەوە منیش نووسیمەوە کە لە تورکیا وتوویە:

بۆ نیشانەی کوز بچووکی دەم ئەگەر نیشانە بێ

خەڵکی ئەم شارە کوزی ژنیان ئەبێ زەنگیانە بێ

چاوی مەزوم کزە لەم سیڕە ناگا عاجیزە

بێت و گەر وابێ نەسیبی ئەم خڕەی سەر پانە بێ

* * *

جارێك شێخ رەزا ئەیەوێت مەلای جەباری تاقی بکاتەوە و تا چ رادەیەك ئەتوانێ شـان لـە شانی بدات، دێت کاغەزێ ئەنێرێت بۆ مەلای جەباری و تیایدا ئەنووسێت: دێم بۆ میوانداریتان بە هەموو شتێکەوە حازر بن بۆمان: بە نان و گانەوە ئەویش خێرا وەڵامی ئەداتەوە ئەچێت ئەم شیعرەی خوارەوە ئەنێرێت:

وەك قەومی لوطن هۆزی جەباری

هەردەم حازرن بۆ میوانداری

* * *

ئەگێڕنەوە جارێك تەیموری لەنگ بانگی مەلای مشهوور ئـەکات ئـەڵێت: جـەنابی مامۆستا ئەگەر من لە نەژاد و نەوەی عباس بوومایە بەرای تـۆ ئەبوایـە مـن لەقـەبم چی بوایە؟

چونکە ئەوان هەموویان ناویان وابووە؟

الناصر لدین الله، المعتصم بالله، الواثق بالله....... تاد ئەویش خێرا وەڵام ئەداتەوە ئەڵێت: قوربان زۆر ئاسانە تۆ ئەبوایە لەقەبت: نعوذ بالله بوایە.

* * *

جەنابی مەولەوی جارێك رێی ئەکەوێتە سلێمانی و لە مزگەوتی گەورە میوان ئـەبێت دەسنوێژ ئەشوات و ئەچێتە پـاڵ سـۆپاکەوە خـۆی گـەرم بکاتـەوە، پـاڵی لێ ئەداتـەوەو ڕائەکشێ، یەکێك لەوێدا ئەبێ بڕوای وا نابێ کە مەولەوی ئەو پیاوە گرینگە مەزنەیە ئەم شیعرە تاقی ئەکاتەوە کابرا ریشێکی دوو فاقی ئەبێ و سۆفی ئەبێ:

خەراپ کەفتگی عەجەب بێ خۆفی

باییك بەر ئەدەی بۆ كێری سۆفی

ئەویش خێرا وەلاّم ئەداتەوە:

ئەندازەم گرتووە رحیمم مرێ

دوو فاقەی ریشی مام سۆفی ئەگرێ

*　　*　　*

پیاوێك ناوی حەمەی زاڵە ئەبێ خەڵكی ئەو شارەزوورە سوێند بە تەلاّق ئـەخوات، ئەچـێتە لای مەلا كاكە حەمەی بیلۆ (مەولەوی) بزانێت تەلاّقی كەوتووە یان نا ؟! ئەپرسێت چیت وتووە. ئـەڵێت: وتوویە دوو ترِو نیو لە كێری بدات ئەگینا تەلاّقی بكەوێ مەولەویش ئەم فەرموودەیە ئەڵێت:

دوو ترِ و بەهەر حاڵ نیو ترِ مەحاڵە

دوو ترِ و نیو ترِ بە گۆڕی زاڵە

*　　*　　*

كابرایەك لە لادێدا دڵی بە كچێكەوە ئەبێ، ئاگری ئەوین و دڵداری ئەیـسووتێنێ كـچەیش ئەمی زۆر خۆش ئەوێ، كاتێ هەواڵ ئەگات بە كوڕەكە دڵدارەكەی زۆر نەخۆشە پیا بگات یـان نا ؟! خێرا رێگا ئەگرێتەبەر ئەبینێ پەرێشانە ئەم فەرموودەیەی بۆ ئەڵێت:

سەر جەزانووی خەم بكێشۆ وەدەر

هەر پەی دووری یار بكەرۆ سەفەر

ئەویش چاو هەڵ ئەبرێت و ئەڵێت.

مقدمەی خەم تاڵیش مەراقەن

وە خێر نەیامای وادەی فیراقەن

ئیتر گیانی بە یەزدان ئەسپێرێت..

*　　*　　*

## چیرۆكی شێخولكە و فەقێیكی لەخۆبردوو سەربوردێكی بە نرخ:

كات چێشتەنگاوە، ئاخرو ئۆخری پایزە، ساردی تەواو بـزواوە زەخـیرە بـەرەو قـات و قـڕی ئەڕوات، بێ دەرامەتی و هەژرای خۆی كێشاوەتە ناو ماڵ و دێهـاتی ناوچـەكە گـەلێك خێـزان

دابەش کرابوو بەسەر هاومالّەکاندا، تاوەکو لە برسا نەمرن و بگەنە وەرزی تازە، چونکە جەنگی دووەمی گشتی جیهانی بە جێنەهێشتبوو بە تەواوی، گەلی عێراق دەروونی کەیلی خەم بوو لە کلّپە و گڕی قین و توورەیی قولّپە ئەدا، لەو لایشەوە تاوانی جوولەکەکان لە فەلەستینا دلّی موسوڵمانانی خاوەن هەستی هێنابووە جوولّە و هەژان.

شتێکی سروشتیە هەژاری و بێ دادی بلاّوبێتەوە ئاسایش لە خەلکی هەلّ ئەگیرێت چلکاو خۆرو بێگانە تەشەنە ئەکات گیاکەلّەی دەربەگایەتی ئەڕوێت و بە خۆی و مەرامە پیسە چەپەلّەکانیانەوە سەر هەلّئەدەن هەر یەك بەڕەنگ و جۆرێك چڕۆ ئەکەن، زەهر و بەدرەوشتی چڕۆ ئەکات و کوشندە ئەبێت جا ولاّت ئەبێت بە مۆلّگای جڕو جانەوەری بێگانە وردە وردە سەر هەلّئەدەن و کنە ئەکەن ئەتەننەوە رێگا خۆش ئەکەن بۆ دروستکردنی کۆڕ و کۆمەلّەیان، پەردە لەسەر رووی خۆیان لائەدەن، مرۆڤی زیرەك تێ ئەگات و هەستی پێ ئەکات هەندێك لەمانە بە ناوی ئاینەوە دەس ئەکەن بە راو روت، سواری گای شێت ئەبن خۆیان لە زۆنك و مێرگی تاوان هەلّئەکێشن کار و فەرمانی وا ئەکەن لە ژێر پەردەی دینا لە راستیدا شەیتان خەجالّەت و روو زەرد ئەبێ دەست و پێوەند بە جۆرەها خورافات ریزەکانی گەل ئەتەنن، ولاّت ژەهراوی ئەکەن تۆوی نەزانین و گەوجی ئەچێنن رووی پاکی مرۆڤایەتی گلاّوو چەپەلّ ئەکەن بەو جۆرە بەرهەمێکی بێ ئارەق و رەنج ئەچننەوە، لە سایەی ولاّتێکی دواکەوتووی تاریکدا ئەژین بۆ خۆیان وەك بەرزەکی بانان لە بە هەشتێکی بەریندا وەچش لەو خەلکەی هەمیشە تاس بردو و ماندوو نەزیندوو نەمردوو.

❊ ❊ ❊

لە گەرمکدا کە دێیەکە لە خۆرئاوای ناحیەی تەقتەق سەر بە قەسەبچەی کۆی سنجاق نزیکی (٣٠) مالّێکی تێدا نیشتەجێیە جووتیارن بە کشتوکالّەوە خەریکن ئەژین رێگای شارو بەریان بە زۆری تەقتەق بوو یان کۆیە.

دەنگوباسی هەندەران وای ئەگەیاند لە شاری کۆییدا خۆپیشاندان هاتۆتە مەیدان جم و جۆلّ و بزووتنەوە دەستی پێ کردووە زۆر بووە لە ناو قوتابیان و رۆشنبیران وەك ئاگر و پووش ئەی سوتان و ئەی هەژان دەنگی وا خۆش و رەوان بە گەرمییەوە ئەچووە ناو گوێی جووتیاران، ئەم گەلە لە بەدبەخت و سەر سەختە گیرۆدەی پیلانی بەگوو شێخی جادوو گەرە، هەر بەوان ئەخەلّەتێن و لە تەوەر ئەبرێ لەبەر خودی سوودی تایبەتی ئەو کاتە، و

جەنگی گشتی جیهانی، واتە بۆ بەرژەوەندی مەبەستی ئیمپریالیست شێخێکی دروست کردبوو بەرەڵای ناو خەڵکی کردبوو، گەلی بە قاو هێنابوو زۆر کەس ریشی تێنابوو، گەلی چاوبەست کردبوو چاکەی لە بیر بردبوو ناوی لێنابوو شێخ محەمەد سالحی کەس نەزان دەنگی وەها زڕابوو جاسووسێکی کارامەی لێهاتووی کارگوزار بوو، لە ناو گەلدا خۆی وا نیشان ئەدا شێخی تەریقەتی قادرییە لە بنەماڵەی بوزورگەواری ئەوانە خزمەتکاری تەریقەت و دینە هەمیشە دەستی بەچاکە و زوبانی بە زیکری خوا رەنگینە ئەمیش توانیبووی چەند هەزاری ساویلکە بگرێتە خۆی و بیکات بە کەرەسەی پڕوپاگەندە بەناوچەکەدا بلاوبکاتەوە بسووڕێتەوە و ئەم و ئەو لە خشتە بەرێت ئەنجام گوایە ئەتوانێت مەڵبەندە دێرینەکەی حاجی قادری بۆگەن و بیگەن بکات گەر خوا دەستی بدات شکور خوا نەیکرد رێی بەمەبەست نەبرد، ئەمجارەش وەکو جاری جاران دەنگوباس گەیشتە ئەو پەڕی دێهات و کۆنە هەواران دەوارنیشنی نەزان کە شێخێك پەیدا بووە کەشف و کەراماتی زۆرو زیندووە لە دەس دەرچووە بگرە مردوو زیندوو ئەکاتەوە دەرگای خێر ئەکاتەوە بەرەکەت و فەر ئەخاتە دەغلٚ و دان لە وڵات ئەتارێنێ شەیتان کچ ئەباتە سەر باری نیازی شووکردن، نەخۆش ئەکا بە پۆلا وەکو کوێزی ساغ ژنی نەزۆك ئەخاتە بەر. لەکوڕ بەولاوە هەر نایبێ، دوژمن و ناحەز قڕ ئەکات ژن و مێرد لای یەك خۆشەویست ئەکات، لە چاوی پیس بە دووریان ئەکات، جنۆکە و دێو بنبڕ ئەکات خێوو شەیتان لە ناو دەرئەکات باوك و دایك، خزم و خوێش لەو دونیا لە جهەنم رزگار ئەکات مسۆگەر ئەبێت بەهەشت بۆیان، واتە کوێخایەکی تەواوە لەلایەن خواوە ئەم گشت باس و خواسە ئەگەیشت هەروایش مەلا چاکەکانی وڵات لە وتو وێژ بەزیوون سەریان دانواندووە بۆ حەزرەتی شێخ و بوون بە دەروێش بۆری داون سنك کراون دەس بۆ هەر نهێنییێك ببا لە خۆرا دەکرێتەوە مافی خۆیەتی بسووڕێتەوە زاناو مووچە خۆرانی میری دووی دەکەون گشت پێشوازی لیٚ دەکەن بە حەدیث و شەرع ئەدوێ، إبن حجر وەکو قورئان راڤە دەکات رێزی لە دێهات گرتووە گەلی بۆ تەریقەت بردووە بۆ جەنگی فەلەستین رایان دێنێ حەقی ئیسلام ئەستێنێ، هەر ئەمەیە پیاوی خوا نوور لە نێو چاوی بریسکە دەدا ئەم دەنگوباسە وایکرد بڕوای پێ بکرێ باو بە مەکرو تەزویری بدرێ شێخی سەر ژنانی خەڵکی فریودا، بەڵام یەزدان پشتیوان بوو بەو شێخە نەبووم بەدخوو..

* * *

فێرخوازێك و مەلایەك دانیشتبوون لەمزگەوت وانەی شەرعیان رافە و شی ئەکردەوە ئەیان خوێند جا با خوێنەر لێی روون بێت کە فێرخوازەکـە وریـاو بزێـو بـوو، لـەوبارەوە زۆری وانـە کردبوو سرنجی وردی لێ دابوو لە خزمەت زانادا پێ گەیشتبوو تێگەیشتبوو تا رادەیێك رۆژنامە و پەرتووکی تازە بابەتی ئەم دیو دیو کردبوو راستی و هەڵەی لە یەك جیا کردبووەوە پـەروەردە بوو بوو بە جوانترین سەرچاوە هۆگربوو توانیبووی بچێتە ناو جوتیارەکان و ئاشنایان بکات بـە خۆشەویستی و رێزگرتن لە رۆشنبیران وتا رادەیەك شێخ و مرەو حایو لای پەشم بـوو لـە خـواو پێغەمبەر و قورئان بەولاوە هیچ شتێك نییە بە کەڵك و کاریگەر نییە بۆ ئادەمیزاد هەر خـۆی بۆ خۆی گشت شتێکە واتە شێخی درۆ دین ئەدۆرێنێ.

لە دێکەدا دوو لاوی فاصیدە هەبوو برابوون پتر لە خەڵکی برِوایان پێی بوو لـە ناکـاو هاتنـە ژوورەوە، ئەو شێخەی ناوی دەرکردووە ئەم شەوی لە تەقتەق بەسـەر بـردووە جـوابی بـۆ ئێـرەش ناردووە کە خۆی و دەروێشەکانی بۆ ئێرە دێن، ئەوا بۆ ناو گوند هـاتن و بـەرێن زەرگـو خەنجـەر ئەوەشێنن کورەی ئاگر ساز ئەکەن خەڵکی سەر کێش بەزۆر ملکـەچ ئەکـەن دوعـا لەبـەرد بکـا ئەتوێتەوە ناحەزی بە دەوری خۆیدا ئەخولێتەوە ماڵ و پارە کۆئەکاتەوە بۆ تەکییە ئەیباتەوە، جـا نەك لەبەر خۆشەویستی شێخ، بەڵام بۆ پاراستنی ناو و شۆرەتی خەڵکی دێیەکە با شتێك خۆمـان ئامادە بکەین پێشوازییان لێ بکەین، مامۆستای دێ بانگی دانیشتوانی دێی کرد رایەخ راخـەن، میوان بەرێکەن خۆیشی رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە تا تەدبیری پێشوازی حـەزرەتی شـێخ بکـات کـاتێ دەنگی تەپڵ و دەف گوێی گەردوونی کەڕ ئەکرد، هانای بۆ ماوەی دوور ئـەبرد کاکـەی فێرخـواز وەکو خەڵك تەماشای حەشاماتی دەکرد سەر و سەکوتی شێخی هەڵ ئەسەنگان بە هێسترە شێخی ئەچوان، واتە دەس برێکە رەسەنترین جاسووسی چاکی ئینگلیزەکان.

ئەم قوتابییە دینییە کالاّو بەرگی جوانی نەئەلوان سەر پێچی شڕ و شیتاڵ بوو بوخچەی جلەکانی ماڵ بوو دیواژو بەرگی پۆشاکی پۆشی بوو لە خوێندن بـەولاوە دونیـای مەبەسـت نـەبوو، بـە هـیچ دەربەست نەبوو کە شێخ گەیشتە ناو دێ لەگەڵ خەڵکی تاوان کەوتەرێ وەکـو ئـەوان دەسـتی مـاچ نەکرد تەوقەیەکی لەگەڵ کرد رۆیشتن تا گەیشتنە مزگەوت شێخ پـێش دەروێـشەکان کـەوت چـوونە سەریان کردیان زیکری سبحان، بە هەڵپەرین و خۆیـادان شـێخ مـەددەدی ئـەباران بەهیمـەتی پـیران سەرپەرشتی ئەکردن نووری بۆ ئەناردن ئەی پاراستن لە شەیتان لە خوا گرتووی وەك خۆیان.

حەمە رسوڵ و حمەئەمین: هاتنە خزمەتی وتیان فـەرموو قوربـان پـشوو بـدە بخـە سـیرەوە دەروێشەکان با زیکری خۆیان بکەن هەروایش مامۆستا تەشریفی هێناوە لە خزمـەتا وێـستاوە

شێخ وەڵامی داوە هەروا بە پاوە من مەلا نابینم با مەلایش من نەبینێ ئێمەومانان ئیشمان بەوان نییە مامۆستا بۆچییە؟ کاك محمد امین هاتە ئەملاوە وتی بەخوا ئەم شێخە فاسقەو کەرە ماکی شەڕو دەس بڕە بۆیە وا بەگیانی خەڵکی خڕە، فێرخواز وتی: ئەترسم لەگەڵیا بکەومە کێشەوە کەسم لە پشتەوە نییە ناوێرم وتی مەترسە هەر کەسێك دەستت بۆ بێنێ دەستی ئەشکێنم بەخەنجەر جەرگی دەردێنم پشتت بەمن ئەستووربێ وەك فەرموودەی مووربێ وا گوێ هەڵ ئەخەین بزانن ئەگات بەچی؟!!

ذیکر بەتاڵ بوو چوونە بەرهەیوانی مزگەوت رایەخ و دۆشەك بۆ شێخ و مەلا فەراهەم کرابوو، بەڵام شێخ نەچووە لای سەرەوە بۆ دانیشتن لە خوارەوە دانیشت منداڵ و مەزمی ناردە لای مەلا صدیق خۆی بە پێڵاوەوە سەر رایەخ کەوت، بە مۆنیوە کەڵفیش بوو، نوقمی بیری خەم کێش بوو کەفی ئەچاند لە روو شێخ چۆن بوو:

پیاوێکی باڵا بەرزی رەش تاڵە دەم و چاوێکی درێژی پووچەڵ قژێکی بەپرچ کردوو سمێڵێکی تاشراو هەزار قورئانی بخوێندایە رووناکی نەئەکەوتە ناوچەوانی چاوی هەڵنەئەهات حەشیشە و بەنگ گێژی کردبوو، ئەمە جەنابی شێخ بوو هەر کەسێکی بەرچاو ئەکەوت بە قەستی و بە وردی پیا ئەڕوانی وەك بۆ مەبەستێك بگەڕێت بەدوایدا وێڵ بێت لە گشت کەس و لە خۆی گومانی هەبوو جامانێکی لەسەر بوو یەکێکی کردبووە ملی شەدەیەکی لە پشت کردبوو، کەوایەکی بە سەڵتەوە پۆشیبوو شووشەیەك عەتری بەخۆدا کردبوو، ئەنگوچکێکی زلی بەردابووەوە.

کە دونیا ئارام بوو پڕەوحایوحوو نیشتەوە مامۆستا ویستی رێزی بگرێت، پاکەتێکی دەرهاورد جگەرەیەکی بۆ شێخ رەوانەکرد شێخ وەری نەگرت و نەیویست، خۆی تووڕە کرد وتی: نازانم ئەم مەلایانە چییان ئەوێ لە شێخ و دەروێش و پیرانی تەریقەت و غەوسی گەیلانی، بۆچی هەر کۆلکە مەلایەك دێت پڕوپاگەندەمان لە دژ ئەکات؟!! ئێمەومانان هەر ئەبێ ئەمە بەشمان بێت، شەریعەت و تەریقەت لەیەك جیایە ئەمانە چییان لە خەڵك ئەوێت؟! خووری لە دەروێش حەوێز کوا بێنە ئەو إبن الحجرە، بزانم درۆو دەلەسەی مەلاکان چی تێدایە؟! با بۆ ئەم خەڵکە روون بێتەوە تاکەی رێگا لە پیرانی تەریقەت ئەگرن؟! قینەبەری ئەکەن ئەمجا قیژاندی و تووڕەبوو مستەکۆڵەێکی کێشا بە زەویدا چاوی پەڕییە پشتی سەری.

مەلای بەستەزمان وڕ بوو، دەستێکی برد بۆ فەقیانەکەی وەکو بیەوێت دەستنوێژ بشوات هەڵسا و پێڵاوەکانی کێش کرد بۆ ماڵەوە بۆی دەرچوو، حەیای خۆی پاراست،، دانیشتووەکان خوێنەواریان تیا نەما تەنها فێرخوازی فەقێ نەبێ کە هیچ شتێکی لە خوێنەوار نەئەچوو گوێی

گرتبوو جلێکی شڕی لەبەر بوو چەکە پێلاوێکی لە پێدابوو خۆی مـات و کـزەڵ مـەلاس دابـوو، هەستی ئەگرت چاوەڕێی کۆتایی و ئەنجامی ئەکرد، شێخ بەچـی ئەگەیـەنێ؟!! خـەلکی سـەریان سووڕما، بۆچی ئەم کابرایە وای کرد؟! مەلای بۆچی خەجالّت کرد؟ کۆڕی شێخ ساردەوە بوو، جـا شێخ کە بینی کەس نییە بەرهەڵستی بکات هەرچی بلێ ڕاستە بۆی ئەچـێتە سـەر دەسـتی کـرد بەدووان دووانێکی ناشرین بێگومان: هەر بێچووە شێخێك بگریـت بگـرە تـا گەورەکـەیان وا تـێ ئەگات، مادام چەند ڕەش و ڕوتێك دەوری لێ داوە زەبەلاح و مل قەوی ئیش نەکەر و تەوەزل دەم و دەس ئەو ناپاکە خۆی بە غەوێ زەمان و قتبی مەدار ئەزانێ و ئەو خەلکەیش بەکەر تێ ئەگات هەرچی بلێ ئەو خەلکە ئەبێ گوێ ڕایەڵی بن ئەمری ئەو ئەمری خوایە ئەو سـێبەری خوایـە لـە زەوی هەر کەس لابدا لـە فـەرمانی ئـەو لـە دیـن و ئـایین دەرئەچـێ و گـومرا ئـەبێ هەرچـەند نەخوێنەوار و بێ نرخ بێت هەر پیاوی خوان و چاکن لایان وایە یاساکانی شەرع ئەوان ناگرێتـەوە، چاکیان خۆشەویستی خوایە و خەراپیان پێغەمبەر لێی بەرپرسـیارە بـێ پرسـینەوە شـەفاعەتیان ئەکات گوناهیان بە تاعەت حیسابە هەزاران حەدیـث بەدەم حەزرەتەوە هەڵ ئەبەستن وەری ئەگێڕن بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەقسەی خۆیـان ڕەگـەزێکی خـاوێن کاکڵـە و پالاوتـەی چـاکترین تـوخمی ئادەمیزادن خوا بەدی هێناون و و ئافەریدەی کردوون لەسەر زەوی ئەوان چاکە لەگەڵ ئەو خەلکـە ئەکەن کە لەگەڵیان ئەژین فـەیز و فـەڕی ئەوانـە ئـادەمیزاد ئافەریـدەکراوە حـەدیـث و ئایـەت ئەرکەکانی ئاین هەر بۆ ڕەش و ڕووتەی گەلەو ئەوانی لێ بێ بەرین...

کاکە شێخ وتی: ئەی خەلکینە ئەم مەلایانە چاك دینیان گۆڕیوە نازانن ڕاسـتی شـەرع لـە ئێوە بگەینن هەر دەس پان ئەکەنەوە هەمیـشە لـە شـێخ و تەریقـەت و ئـەولیاکان ئـەدوێن، دەماخی ئێوەیان تێك داوە ڕێگای تەکیەی لێ گۆڕیون زیارەتی پیاوچاکان قەدەخە ئەکـەن، زۆر باش بزانن ئەگەر نەخۆش و تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفت هاتە ڕێتان یام فکری شـێخ ڕێگـەی پێ گرتن خێرا خۆتان بگەیننە ئەو مەرقەدانە هاوار بکەن پیران دێن بە هاوارتانەوە و خێرێکـی بۆ قەرار بدەن سەر لە تەکیە بـدەن چـاوتان لـە پـیر و مەشـایخ بێـت ئـیتر دکتـۆر و قـسەی سەرچەورەکان ئەچێتە گوێتان مەلاو مەکتەبی دژی تەکیە و تەریقەتن بە گوێیان مەکەن ئەمانە ئەتان کەن بە گژ ئاغاکانی خۆتانا هەڵتان ئەگێڕنەوە لـە دژی داب و دام و دەسـگای پێـشینان گەورە و بچووك هەربوە (نظری) پیران هەزارانی وەك ئەمانەی لە پیاوەتی خـست شـێت و شـل بوون ئێوە دەروێشن گوێ شل مەکەن بۆ مەلاکان فێری ئاژاوەتان ئەکەن لە ناکاو شیراندی وتی: ئا دەروێش حەویز ئەو إبن الحجرەم بۆ بێنە بزانم مەلاکان چییان ئـەوێ لـە جێگـە داروپیرانـی

تەریقەت، دەروێشیش بە یاهو کێشان وتی ئەمر ئەکەی یا شێخ هەر ئێستا ئەیهێنم، دەستی کرد بە گەڕان خورجە کەی شێخی پشکنی وتی قوربان کلیلەکە گوم بووە ئارامبە تا ئەیدۆزمەوە لەخۆیەوە دەستیکرد بە ئامۆژگاری بە هیچ جۆرێك پەیوەندی نەبوو بە دینەوە گشتی بریتیبوون لە نوێژ و حەج و زەکات و رۆژوو، خزمەتی شێخی گەورە پیاوان و قەناعەت کردن بە بەشی خوا چی دابێ، مەلاو خوێندن و مەکتەب کوفر و حەرامە و حەدیسی بە ئارەزووی خۆی دائەڕشت بەم جۆرە درۆو دەلەسەی هەڵڕشت ئەی پەنا بەخوا!!

فەقێیەکیش لەولاوە چاوی ئاسمانی نەئەدی، تفی لە زەوی و زۆنگاو ئەکرد گینگڵی ئەدا وەکو مار لەسەر پشکۆ قین و تووڕەیی سووری هەڵگێڕا لە ناکاو بەرگی کزەڵ تووڕدا، بە سیمایەکەوە لە شێخ هاتە پێشەوە وتی سلام علیك یا شێخ دەستێکی گرت و توند قیژاندی بەسەریا ئەبێ ئێستا روونی بکەیتەوە رووی راستی و ناوەخنی دەروونت ئەپرسم وەڵامم بدەرەوە لە هەر کوێدا وێستای یان وەڵامی بێ رێ و شوێن، یا قسەی ناشرین بکەیت لە جێگەی خۆتا نەستەقت ئەکەم دەمت دەشکێنم قورگت هەڵئەبڕم ئەم هەموو هەژارو جووتیارانە ئەبێ گوێ لە هەردووکمان بگرن، کام لامان راستی کرد بچینە سەر قسەی ئەویترمان و ئەبێ بۆر بخوات:

١. ئایا دینی ئێمە لە قورئان بەولاوە هیچی تر هەیە؟! ئەگەر زیاتر هەیە!! ئایا جەنابتان تازەی پێی زانیوە؟ ئەوە چییە؟! یان زووتر هەبووە کەس پێی نەزانیوە؟ چۆن ئێوە پەیتان پێ برد؟ و لە کوێوە؟!

٢. ئایا ئەم رێگەی ئێوە لە قورئاندا هەیە؟ کامەیە؟ ئایا دین بە علیم و زانین ئەپارێزرێت؟ یام بە نەخوێنەواری و لاجانگی رشکاوی و کۆڵکنی؟!

٣. ئایا تەریقەت لەسەر چ بناغەیێك هاتووە؟! مار و مشك و زەرگ وەشاندنە؟ خۆ بە گەوج کردن و سك بە کالاّ کردنە؟! بە مانا دین زیاد ئەکات؟! وەکو ئێوە پێی ئەگەن پێغەمبەری خوا هەر خەریکی ئەم شتانە بووە؟

٤. ئایا کەسێك نەبێ بە دەروێش بۆ کافر ئەبێ، وبینا لەسەر چی؟! بەبەڵگەی کام ئایەت ئەمە هەیە؟!

٥. ئایا جەنابتان کەشف و کەرامەتی هەیە؟! هەقتان بەم خەڵکە چی؟! ئایا کەرامەت بۆ ئەوەیە سامان و دارایی پێ کۆ بکرێتەوە؟ هیچ گومانم لەوەدا نییە هەر بەم ناوە ئەم رەش و روتانە ماڵوێران ئەکەن؟ ئێوە دەوڵەمەند ئەکەن پاشان ئێوە دێهاتەکانیان داگیر ئەکەن، و ئەبن

به ئاغا لێیان ئەمانیش وەچەیان ئەبێ بە مسکێن و ژێردەسەی ئێوە ئەیان چەوسێننەوە هەی ترحێو لەم خۆ بە گەوج کردنە.

٦. ئایا جەنابتان بۆ ئەوەندە دڵسۆزی دینن؟ دڵتان بۆچی بەم خەڵکە ئەسوتێ؟ بۆ ئێوە کوێخای خوان؟

٧. ئەی بۆچی ناچن بۆ لە ماڵی خۆتانا عبادەت بکەن؟ رووبکەنە خوا بۆ کەسابەت ناکەن؟ واز لە سواڵ کردن بێنن؟ خوا مزاهەرەو فاکو فیکی بۆ چییە؟ دین رەفتاری باش و کرداری بە کەڵکە جوانی رەوشتە ئەم جووتیارانە لای خوا لە ئێوە پیرۆزترن عەقڵیان پێ ناشکێت خۆیان وان.. ئەمانەی وتمان لە قورئان و لە شەرعا بە ئاشکرا روونە کاکە شێخ گیان خەڵکی کەر نییە زۆر چاك بزانن.

٨. ئایا کەشف و کەرامەت زانینی نهێنی نیشانەی پیاو چاکییە؟ ئەی چی ئەکەن لە گا پەرستەکانی هیندستان؟ یا ئەوانەی گاورن ئەچنە ناو ئاگر و شێر و پڵنگ و مار خەو لێ ئەخەن یان خۆیان ئەنوێنن ئەمرێنن بۆ شەش مانگ لە گۆڕا خۆیان دەفن ئەکەن دوواجار زیندوو ئەبنەوە شتی وا ئەکەن عەقڵ تیا سەری سوڕ ئەمێنێ و عیلمیش لە شیتاڵ کردنی دەسەوەسانە..

٩. یا شێخ: بۆ ئەوەی متمانە بکەم و دڵم پاڵ بداتەوە دان بنێم بە پیرۆزیتانا ولای خوا پایەدارن ئەمە چییە لە دەستما؟!! واتە دەنگە مووروویەك بوو شاردبوومەوە بێگومان وەڵامی یەك پرسیاریشی نەبوو فەقێی رۆشنبیر وتی: رات چییە دەربارەی شافعی و غەزالی و هەزارانی وەك ئەوان؟! وەك ئێوە ئەفەرموون با کتێبەکان بدرێنین و بیان سوتێنین، تەنها ئێوە بەسن بۆ ئەم خەڵکە دینی پێ رابگەینن ئەگەر خوا کردی ئێوەش نەزۆك بوون یان کتێبەکان نەمان شەیتان ئەبێ بە پێشەوای گەل ئەی ئافەرین هەر بژی سێ جرتوو نیو!!!! من هەر لە ئێستاوە ناحەزی ئێوەم ئێوەش درێغی مەکەن بۆچی بە تەنها خوا هەر هی ئێوەیە؟! بەشی ئێمەی پێوە نییە؟ ئەی ئێمە چی بکەین.

یا شێخ زۆر چاك بزانە " ئەدیسۆن و ئەنشتاین ئەوانەی شتی تازەیان دۆزییەوە بۆ خزمەتی ئادەمیزاد بە گشتی لە ئێوە چاکترن تەنها بڕوایان نەبێ، رادیۆ، تەلەفۆن، پەنسلین، چاپ گەری، لاسلکی رەنگە جەنابتان ئەوانەی دروست کردبێ، بەڵام لە نەزانیندا ئەوان دروستیان کردو هیچیان لە کەس ناوێ ئێوەش بەهەشت ئەفرۆشن وەکو تاپۆی باوکتان بێت، ئامۆزای قەشە و پاپان لام وایە ئێوە مار و مشکو پرچ و ئەسپمان بۆ زۆر ئەکەن هەی نەفرەت لە کردارتان دواتان برێ نەختێ بفامن. ئێوەش و ئاغا و مەلاو بەگو هەزاران بێ کاری تەوەزەلی ناپیرۆزی نا

میهرەبان، و پیاوانی میری تێکرا نان خۆری ئەم گەلە رەش و روتەن کەچی ئێوە چاویان دائەبەستن و دەم ئەخەنە ناو خوێنیان ئەی مژن هەر خۆتان بە خۆتان بن هەی بێ ئەمەکینە!!

پاشان قۆڵی شێخی گرت و رایوەشان دووجار لەسەر یەك بە توندی هاواری کرد دەی بیهێنە ئەو إبن الحجرەی کە تۆ پێی ئەنازیت ئەم لاو ئەولا کە هێنایان إبن الحجری عسقلانی بوو..

۱۰. دە پەرە بوو تا دە حەدیسی حەزرەتی تیا بوو لەگەڵ قسەی نەستەق جوان کاری خەڵکی پێ ئەترسان شێخ بە دەستییەوە زەرد هەڵ گەڕابوو زەندەقی چووبوو ئەمجا رووی کردە دەروێشەکان وتی ئەی کەرینە ئەزانن دەروێش یەعنی چی؟ واتە شێت و وێت بەرەڵلاو بێ کارەو گەوج ئێوە بۆ ناچن خزمەتی ماڵ و منداڵی خۆتان بکەن!! ئەگەر سواڵکەرن بۆچی بۆ خۆتانی ناکەن؟ ئەم خۆ بە شێخ کردووە وەکو ئاگر وان دەستی بۆ ئەبەن ئەتان سوتێنێ، وازی لێ دێنن بسوتێ ئەکەوێتەوە دونیا قڕ ئەکات تاکو زووە بیکوژێننەوە رزگارتان ببێ لە چەپەڵییان پوختەی باسەکە ئەوە بوو شێخ دەمی بەسرا یەك دوو دێی تر گەڕان ئەو خەڵکەی لەگەڵیابوو یەك یەکو دوو دوو جێیان هێشت و رۆیشتن ئەویش ناچار بوو گەڕایەوە لە دێیك چەند مانگێك مایەوە کچێکی هەڵگرت و رۆیشت و هەندێ پارە و پوولی بۆ خۆی کۆکردەوە لە کیسەی نەزانا دەری هێنا ئەمەیە کاری شێخەکانی ئێمە واتێ ئەگات کەس بە کاریان نازانێ.....

* * *

پیاوێك کوڕێکی زیرەك و بێ عەقڵی ئەبێ زەکای زۆر لە رادەبەدەر ئەبێ دەرفەتی ئەدەنێ بچێتە ئەمریکا خوێندن تەواو بکا. کە دێتەوە باوکی داوای لێ ئەکات قسەی بە جێ بکات کە لە مەجلیس دائەنیشێت کوڕە دێتە دواندن و فەلسەفە ئەنوێنێ و ئەڵێت: لە ئەمریکا مانگا ئەکەن بەمەکینەدا واتە - کارخانە — لەوسەرەوە ماست و شیر و پەنیر دێتە دەر باوکیشی لە توانایدا نامێنێ ئەڵێت " رۆڵە خۆ ئەو کارە زۆر ئاسانە منیش لە کاتی خۆیدا لێرە مەکینەیەکم کڕی شیرم تێ ئەکرد گا دەرئەچوو؟!!

* * *

## بالۆرەی گەورە کچێك

گەورە کچێك ئەدەن بە مێرد و شووەکەی بەدڵ نابێ کاتێ ئەچێتە ئەو دەشتە بۆ دار و چیلکە کردن دەس ئەکا بە بالۆرە: ئەم رێیە دوو رێیە، لانکی ساوام پێیە ماڵی بابی یارم لە کوێیە، رێی درێژ و باریك دونیام لێ بوو تاریك نەمدی بەژنێ باریك ئەرۆم پشتەو شاری دەخۆم زەهری ماری

ناکەم هەوێ باری هەوێی سەربەقوڕ جێگەم گەرم و گوڕ جێگام لێ دەستێنێ بە جلە گا دەم خەوێنێ لانکۆڵەم پێ دەژێنێ..

*　*　*

لەسەر بیر ئەمانخوێند، فەقێیەکمان نارد بۆ ناو دێ کە ماست و نان بێنێ بۆ ئەمیش ناچێت خۆی ئەکا بە ماڵێکا تا ناوەڕاستی ژوورەکە راناوەستێت کە سەر هەڵئەبڕێت ئەبینێ خاوەن ماڵ و ژنەکەی وان لە کاری خێر دایە!! ئەمیش ئەگەڕێتەوە بۆ دوواوە لە شەرمەزاریدا سەری ئەکێشێت بە دیوارا سەری ئەشکێت و ڕێی لێ گوم ئەبێ ئەملا ئەکات ئەولا ئەکات دەرگا نادۆزێتەوە جا کابرا دێت پەلی ئەگرێت و ئەڵێ لێرە بڕۆ ماڵت وێران بێ کاتێ هاتەوە خوێن بالای ئەندامی سوور کردبوو زامێکی گەورەی تێ کردبوو کەچی پەشتا پێ ئەکەنی و خەشی کردبوو فەقێیش دەوریان دابوو: کوڕە کێ سەری شکاندی و بۆچی؟!!

*　*　*

مەلایەك لەبەری سرۆچکە زۆر ناحەزی شێخ و تەکیە بوو ئەچێت بۆ تەکیەی یەکێك لە شێخە ناودارەکانی کوردستان و فەسالّی شێخ لای ناشرین بوو شەو شێخ دێت بۆ ناو دەروێشەکان و بانگی مەلا ئەکا ببێ بە خەلیفە، ئەویش ئەڵێ قوربان من بتوانم تەفسیری (بیضاوی) و (بوخاری) بکەم بۆ دەروێشەکانت ئەمەندە بەس، ئەویش ئەڵێ هەر مەلایەك نەبێ بە خەلیفە دەروێش کەری پێ ناگێت مەلایش دەسبەجێ وەلام ئەداتەوە ئەڵێ قوربان زۆر راستە هەر بە شێخی ئەگێن پیرۆزی خۆتان بێت..

*　*　*

جارێکیان شێخ رەزای شاعیر لە تەمەنی لاویدا دێت بۆ سلێمانی بۆ دیدەنی و سەردانی شێخە ناودارەکانی ئەو سەردەمە کۆمەڵە فەقێی هاوچەرخی خۆی دەوری لێ ئەدەن و پێشوازی ئەکەن و رێزی لێ ئەگرن بڕیار ئەدەن بچنە دەرەوەی شار بۆ تۆپێن و سێباز کردن، کاتێ تەماشا ئەکات یەکێك بەرەو کۆڕەکەیان دێت سمێڵێکی زۆر زل و قەبەی بەدەم و قەپۆزی خۆیدا هەڵواسیوە شێخ رەزایش بڕیار ئەدات شیعرێکی پیا بڵێت لەوکاتەدا کابرا ئەیەوێت سەلام بکات دەس بۆ سەر و سەقەلی درێژ ئەکات و ئەڵێت:

**لێم ئەپرسن بۆچی ناویەتە سەر ریشی سمێڵ**
**تا بڵێن سامی هەیە تڕ رەشەبای فس کلکە بێڵ**

کاتێ دائەنیشن باس و خواسی لێ ئەپرسن بۆی دەرئەکەوێ ئەم پیاوە خەڵکی رانییە. ئەم شیعرەیشی پیا ئەڵێ

رانییە رانییە رانییە　　　　نسائها فاحشه و رجالها زانیه

جارێتر ئارەزووی دیدەنی و بەزمی ئەبێ و ئەیەوێ بچێت بۆ ناو هۆز و خزمی {حسن کەنۆش} کاغەزێك ئەنووسێت بۆ سەرەك هۆزەکەیان ئەڵێت دێم بۆ دیدەنیتان هەموو شتێکم ئەوێ لێتان ئەو ماوەی لاتان ئەمێنمەوە ئەمانیش ناویان بیستبووە ئەیناس شەڕ فرۆش و جنێو بازە، خۆیان ئامادە ئەکەن کە کەمو کوورِیان نەبێ {حسن کەنۆش} ئەڵێت هیچ حەقتان نەبێ من وەلامی ئەدەمەوە ئەگەر گێچەڵ بکات و بیەوێ حەق بکاتەوە لێمان!! بەڵێ لە ناکاودا دێت و ئەمێنێتەوە شەو هیچ کەم و کورِی نابینێ بەیانی رۆژهەلات کە وەختێ قاوەڵتی دێت خۆی عاجز ئەکات و توورِە ئەبێت ئەڵێن قوربان بۆچی زویرو پەستی؟! ئەویش ئەڵێ! ئێوە شوورەیی ناکەن شەرمەزار نابن؟! ئەم شەو کێرم دزراوە، ئێوە بردوتانە هەزار بۆڵە ئەکات و سەرزەنشتیان ئەکات.

{حسن کەنۆش} لەسەرخۆ ئەڵێ قوربان ئێوە قاوەڵتی بکەن خوا کەریمە لە پاشان روو ئەکاتە شێخ رەزاو ئەڵێ قوربان ئەم کێری تۆ بەراستە دزراوە، بەلام ئێمە وامان زانیوە دوو قالبی تایبەتی خۆی هەیە {شێخ دوو ژنی ئەبێ} بیان هێنە کورِ و کاڵ پیاوی هۆزەکەیش هەر هەموویان دێنمە خزمەتت، بابە قالبەکان تاقی بکەنەوە کامیان پڕ بە قالبەکە بوو ئەوە هی تۆیە؟ بیبەرەوە چیش ئەفەرمووی باری سزای ئەکێشین؟ ئەویش بەراستی و یەکجاری قینی دادێت و توورِە ئەبێ، ئەرِوات خوا حافیزی ناکات.

* * *

جارێك مامۆستایەکی قوتابخانەی زەمانی عوسمانلی (مغالطة) لە شێخ رەزا ئەکات و لێی ئەپرسێت: مامۆستا: ئەم رستەیە إعرابی چۆنە (یا أحمق الحمار) ئەویش بە شیعر وەلامی ئەداتەوە:

یا حەرفی نیدا ئەحمە تەرخیمە

مونادای مفرد معریفەی میمە

ق فعل و فاعل بینا مجهولە

مەکتەبلی و حمار هەردوو مفعولە

حمار بە هەر حالّ هەر سالّەو سالّە

بەلاّم مەکتەبلی دائیم بە فالّە

* * *

بۆیان گێڕامەوە پیاوێك ئەبێ داوای پێغمبەرێتی ئەکات هەروا وەحـی و الهـامی بـۆ دێـت لەلایەن خواوە پاشان کاربەدەستان پێی ئەزانن ئەنێرن بە دوایدا پێی ئەلّێن ئێستایش وەحیت بۆ دێت؟ ئەلّێت بەلّێ: ئەلّێن پەشیمان بەرەوە ئەلّێت کێ بیستویە، یـام کـامن پێغەمبـەر هەیـە پەشیمان بووبێتەوە؟ فەرمان ئەدەن بیبەنە چێشتخانە و لەوێ حەپـسی بکـەن و تێـری بکـەن، پاش ماوەیەك ئەنێرنەوە بە دوایدا کە دێتەڕوو لێی ئەپرسن: لە ماوەی ئەم مانگەدا جوبرائیـل هات بۆ لات؟ سورووشی هیچ بۆ هێنایت؟ ئەلّێت بەلّێ ئەلّێن چی بۆ هێنایت و چی پێ وتیت؟ وتی: وەحی هێناو پێی وتم لەم چێشتخانەیە دەرمەچۆ، لێرەوە دینەکەت بلاّوبکەنەوە.

* * *

ژنێکی گەنجی جوان دێتەلای کۆلکە مەلاییێکی سـەعبەت چـی و پرسـیاری شـتی لێ ئەکات، کۆمەلّی فەقێ و خوێنەواری لا بێت ئەمانیش داوای هێلکەو ماستی لێ ئەکـەن، ئەویش قەولیان ئەداتێ؟ کابرای کۆلکەیش وەکو دوعـای خێری بۆ بکات ئـەلّێت یـا خـوا دایکە بەر حەشەفەی حیمار بکەوی رۆژی سێجار ئەویش وەلاّمی ئەداتەوە " یا خوا لەگەلّ دایکو باوکی ئێوەش.

* * *

## چیرۆکی مێش

دێتە یادم ئەمخوێند لە دێی کتکە نزیك ئالّتون کۆپری کە ئێستا چۆلّکراوە عەرەب نشینە بە پێی داب و نەریتی کوردان لەو کاتەدا، واتە لە زۆربەی دێیەکان مەلاو مەدرەسە و فەقێی تیـا هەبوو لەسەر حیسابی ئەو جووتیارانە و خەلّکی دێ ئەژیان و ئەیان خوێند هەر ئەم نەریتەیشە بۆتە هۆی بلاّوبوونەوەی رۆشنبیری ئایینی لەناو دێهاتییەکاندا لە کوردستان، و لە ناو زۆربـەی زۆری جەماوەری گەل.

* * *

مامۆستا مەلا عبدالرحمن بوو خەڵکی یارمجە و مەلا حسن خەڵکی دێی کاریتانی لای دیبەگە یەکەمیان گاڵتە چی بوو زۆر بگرە گوێدرێژی حەلیمی شێت و تووڕە ئەکرد دووەمیان هەرگیز بێ تاقەت و تووڕە نەئەبوو، ئەم ئەی وت سەرم سڕ ئەمێنێ لە کەسانی تر بۆچی تووڕە ئەبن؟ بۆ میزەڵدانی حەوسەڵەیان پف هەڵدێت و تەنگ ئەبێ؟

سەرجەمی فەقێکان (١٦) کەس بوون یەکەم وەڵامی دایەوە ئارەزوو بکەم تۆیش تووڕە ئەکەم خۆت بە پاڵەوان نەزانی!! وتی چۆن؟ ناتوانی!! ئەگەر لەسەر سکم یا دڵم هەڵپەریت وەڵامی دایەوە " وات لێ ئەکەم شێت بیت بە چەپۆك بماڵیت بەسەر خۆتا وتی ناتوانی یەکەم بیری کردەوە چیرۆکی مێشی بۆ هێنایە پێشەوە هەرچی دووەم بیکردایە دەمەلاسکێی ئەکردەوە ئەیکرد دەستی ئەجوولاند ئەویش دەستی خۆی ئەجوولاند چاوی ئەتروکاند ئەیتروکاند قسەی بکردایە قسەکەی ئەوی ئەکردەوە ئەچوو بۆ ئاودەس ئەمیش ئەچوو لەگەڵیا ئەنووست ئەمیشی رائەکشا بە کورتی بوو بە پارچەیەك لەو، دووەم هەڵسا چوو قورئانی خوێند ئەمیش هەر وشەیەکی بوتایە ئەیوتەوە ئەمە دوو شەوی خایاند یەشتا کەسی دووەم نەشێوا، بەڵام لە دواییدا بێ تاقەت بوو زۆر دانیشتووی دێیەکە هاتنە تکا کاری وازی لێ بێنێ بێ کەڵك بوو کەسی دووەم وەخت بوو شێت بێت، ناچار بوو دەستی داخەنجەرو پەلاماری دا وتی هەی ژنی بابت دبگێم خۆ من شەقم برد وازم لێ بێنە ئەویش بە وێنەی ئەو پەلاماری دا، خەڵك و خوا کەوتنە بەینەوە لێکیان کردنەوە، بەڵام هەربێ کەڵك بوو بوو بە یەکپارچە لەو یان بە سێبەری ئەو، جا شەخسی دووەم کە مەلا حسن بوو هەڵسا شتومەك و جل و پێخەف هەرچییەکی هەبوو پێچایەوە دای بە شانیداو رۆیشت، یەکەمیش وەکو ئەو چی هەبوو پێچایەوە دایبە شانیدا لەگەڵ ئەو ملی رێگەیان گرت و لە دێ دەرچوون پێکەوە ماوەی دوو کاتژمێر بەسەرچوو لەو ماوەیدا پێکرا ئەڕۆن شەخسی دووەم ماندوو ئەبێ و دانیشت ئەمیش پاڵی پێوە ئەدات جا مەلا حسن بوخچە ئەکاتەوە قورئان دەردێنێ و ئەڵێ "بیکە بە خاتری خاوەنی ئەم قورئانە ئەمە کەلامی خوایە واز بێنە و دەس هەڵگرە، دەس ئەکا بە گریان و ئەڵێ" باوکم ناما قووڵیم کرد، ئەو کەسەی تووڕە ئەبێ حەوسەڵەی تەنگ ئەبێ لەوێدا دەس ئەکەنە ملی یەکترو ئاشت ئەبنەوە کاتێك بە پێکەنینەوە لە سەرەوە هاتنە خوارەوە بۆ ناو دێ تۆیەی بەروو دوای مەرگی پێکرد. بەداخەوە گەلی کوردی میهرەبان کەمێکیان نەبێ لە چیرۆکی مێشدا ئەژین دەمەلاسکێی یەکتر ئەکەنەوە کە بینیان یەکێك گۆرانی بلێ چەقەنە لێ بدات، یان شینی خۆی

بگێڕێت، یا شەوارەی سالآنەی خۆی بگرێت یا شایی بۆ مردوو بکـات هـەر خێـرا ئەتەنێتـەوە چاوی لێ ئەکەن وای لێ دێت کەسێك ئەیکات بەسووك شاز تەماشای ئەکەن.

* * *

مامۆستا بیگورە ئەم خەلکە بەسالآنە نایەن بۆ نوێژی جومعە، مەلاییێ هەبوو لە دەشتی دزەیـی نوێژی جومعە و وتاری بۆ خەلکی ئەکردو ئەدا هەرچەند ئەچووە سەربانی مزگـەوت سـەلای ئـەکرد کەم کەس بەو بانگ داهێشتنە ئەهاتن و جومعەکەی پێ تەواو نەئەبوو، فەقێ جەوهەری گالتەجاری قۆشمە و گۆیەندچی و دەنگ هات و ئەبێتە میوانی، مەلا گلەیی و بێزاری حالی خۆی دەرئەبڕی کـە خەلکی بە سەلآنایەن بۆ جومعـە کـردن شـێخ جەوهـەری فـەقێ وتـی قوربـان "ئەگـەر جـەنابتان مریشکێکی قەلەو سەر ئەبڕن وەکو ئاهـەنگ و ئیجـازەی منـیش بـدەن ئـەوا ئەمڕۆکـە نوێـژێکی جومعەی راست و دروست ئەکەین، مەلا وتی هەردوو مەرجەکـەم قـەبوولکرد کـاتی نیـوەڕۆ چـووە سەربانی مزگەوت یەکدو سەلای کرد کەس دیار نەبوو بێت، ئەمجا دای لـە چـەپلەو، بـە نـەزمێکی خۆش وتی هەی کولەندە کولەندە ، وەی بالآی بەرز و بلندە"- کیژێ بێنە ماچت کەم ئەو تیرەت بـۆ لە مندا مەمکت هەناری نەورەس خڕو توند پڕ بەدەس بە ماچێکو سیان و چوار قەت تێر نابم مەلێ بەس هەی کولەندە......تاد ئەمجا هەرچی خەلکی دێ بوو هەموویان دەوریان لە مزگەوتدا نوێـژێکی دروستیان کرد مەلا جەوهەریش چی خوا حەز نەکا پێی کردن.

* * *

مەلا حسن هەبوو، زۆر قسە خۆش و بەزم بوو بێژەکانی جێگر و لە جێگای خۆیدا بوو، ورد و زیرەك بوو، پیاوێکی خێلێ نشین دێتە میوانیان، ئەبینێ مەلا ژن رێکو پێکو خاوێنە جوان و بە زەوقە عەقلی وا بڕ ئەکات روو ئەکاتە مامۆستا و ئەلێت " قوربان من حـەز لە ژنی تۆ ئەکەم کە مەلا ژنە، نازانم چۆن ئەوبێ، ئەویش هیچ تێك ناچێت ئەلێت: بۆیـە حەزت لە مەلا ژنە، چونکە پاکو خاوێنە؟! یا ژنی منە بۆیە ئەلێت قوربان هەر کامیـان هەس ئەلێت " من ژنی خۆم نادەم بە تۆ، بەلام تۆ ژنەکەی خۆت بێنە بـۆ ئێـرە یەکـدوو شەوێك یا هەفتەییێك لێرە بێ بۆت ئەکەم بە مەلا ژن رێکو پێك.

* * *

مەلا ئەحمەد قسرت بە مامرەکەی خۆیدا هەڵئەدات مەلا ئەحمەد مریشکێکی ئــەدزرێت و زۆر پێی ناخۆش ئەبێت ئەم شیعرانەی پێدا هەڵئەدات.

مرم مر نەبوو بەناو مامر بوو

لە گاو لە گامێش گەلێ چاتر بوو

سێ تەختەی دەوار لایی جلی بوو

دەگوریسی جافی گیزی ملی بوو

وەختێ لێم ئەنا سەد و چل من خوێ

هەیهۆ ئەم لە کوێ و گا پەڵخە لە کوێ

دانم ئەدایێ جەمی تەغارێ

سەدو چل هێلکەی ئەکرد بە جارێ

بۆ بەگ و ئاغا و شێخ و گەوج و کەر

سەری شۆڕ نەبوو بە پارەو بەزەڕ

لە ماڵان گەڕی سەری خۆی دانا

بۆ کەڵەشێرێ وەکو خۆی زانا

شەرتە لە دوای تۆ گلاراوم بێ

گوشت مر حەرام کوێری چاوم بێ

هەوار بە گومیر دزی شارەزوور

بە قوربانی بێ لە نزدیکو دوور

* * *

## تەڵقینی مردوو بە کوردی

کابرایەك ئەبێ کار و پیشەی هەر دزی ئەبێ، بیر ئەکاتەوە هیچیان نییە وا ساڵیش خەریکە بگاتە بهار و زەخیرە ئەکەوێتە قات و قڕی ڕۆیشت مەندیلێکی سپی کرد بە سەراو خـۆی کـرد بە مەلا لە دڵی خۆیدا وتی وا چاکە خۆم بخلافێنم لە نزدیك خێڵێکەوە کە بەزیبوون لە دەم ئاوو مێرگێکدا کە زۆریش بژون بوو بۆ ئەوەی تاریك دابێت و شەو دەستی خۆی بوەشێنێ تومەز لــە خێڵەکە شەو یەکێکیان لێ ئەمرێت مەلایان پێویست ئەبێ بۆ تەڵقین کردنی دیارە مەلایـشیان دەس گیرنابێ وا کوتوپڕ بیبەن بۆ گۆرستان، بە ڕێکەوت چاویان ئەکەوێت بــە کـابرای مەنـدیل بەسەر سەرەك خێڵ فەرمان ئەدات " ئا بچن ئەو مەلایە بێنن مێــزەری سـپی وا بــە سـەرەوە

ئەچن کێشی ئەکەن و ئەیهێنن پێی ئەڵێن ئا مەلای شەمڵە بەسەر دەی!! تەڵقینی ئەم مردگــە بکە دەی خێرا بێژە دەویت باوك، ئەمیش بێگومان هیچ نـازانێ ئەگـەر بڵـێ مـەلا نـیم هـیچ نازانم، باری کوتەك ئەکەن لە دڵی خۆیدا ئەڵێ چارێکی خۆم نەکەم سەرم تیا ئەچێت، ئەپرسێت ئەم پیاوە مردووە ناوی چییە؟! ئەڵێن ناوی ئالاّیی گویٚ خڕە جا دێتە پـشت سـەری بـۆ تـەڵقین ئەڵێت: ئەی ئالاّی گویٚ خڕ هیچ مەکە جڕەجڕ دوو مەلایکەی خوات دێنـە سـەر کوتـوپڕ گـەر جوابیان نەدەیتەوە وەکو کوڕ کوتەك لێدانە و ترتڕ باڵت پێ ئەگرن بـە شـەق، هـەردوو چـاوت ئەکەن زەق هەی ئەحمەقی کوڕی ئەحمەق، ئەڵێن ئا ئەمەیـە مـەلای خاسـە کـەس نەیئـەزانی ئەوانیتر چییان ئەفلّتاند؟! دێن چەند سەرێکی بۆ پیتاك ئەکەن و خەلاّتێکی باشی ئەکەن.

* * *

کابرایەك ئەبێ ژنێك و کوڕێکی ئەبێ کوڕەکەی زۆر حـەز لـە ژن ئـەکات، لای برادەرێکـی ئەیدرکێنێ هانی ئەدات کە بە باوکی بڵێت، ئەمیش زۆر لەگەڵ باوکیا خەریك ئەبێ هیچی لیٚ نابیستێت، برادەرەکەی ئەڵێ ها چیت کرد؟! ئەڵێ هیچ، بەلاّم قەی ناکات با دایکم بمرێت باوکم ژن بێنێتــەوە ئەوسـا منـیش لەگـەڵیا رێـك ئەکـەوم ژنم ناوێـت، پـاش بـەینێك هاورێکـەی ئەیبینێتەوە ئەڵێ ها چیت کرد؟! دایکت نەمرد یا ژنت نەهێنا؟! وتی نـەخێر بـە پێـچەوانەوە باوکم مرد ئەڵێ کەوابوو ژن و رابواردنت مایە پووچ بوو، ئەڵێ ئەویش هـەر بـە پێـچەوانەوە، ئەڵێ یەعنی چی تێناگەم؟! ئەڵێت برادەر قەی ناکات کابرای زڕ بـاوکم دایکـم ئـەگێت، بـەلاّم منیشی پێوە ئەگێت.

* * *

## زیندە خەونێکی کچێکی موراهیق:

دایك و کچێك ئەبێ کچەکە فەریکە ئەبێ خەو ئەگێڕێتەوە بۆ دایکی بەم جۆرە:

خەوێکم دی بەوێمەوە مشەمش ئەهات لەلای جێمەوە لە باوەش کوڕێ ئەخولێمـەوە کـاتێ دیم ئاخرم شەڕ بی وەختێ زانیم ناو گەڵم تەڕ بی، دایکی وتی: رۆڵە هیچ نییە خێرە ئەم خـەوە خۆشەیش بە من فێرە منیش ئەوسا وەك تۆ وا بیم بۆ کوڕ و کاڵ بە جیا بیم، هـەر بـۆ باوکـت بەرەلاّ بیم کورگەل یەك یەکو دوو دوو ئەهاتنە باڵینم زوو زوو هەر بەو مشەمشە تۆم بوو کچان بە محاڵە چوونە نیشانەی بلوغ بوونە بەشمان هەر شەپلە قوونە.

* * *

مەلا جەلالی حاجی مەلا عەلی هەبوو لە سلێمانی دوو کچۆڵەی جوانی ئـەبێ زۆر لەیـەك ئەچن کەم کەس لە یەکیان جیا ئەکاتەوە هاتوو چۆی لای باوکیان ئەکەن لە مزگـەوتا، چـونکە یەشتا منداڵ کار ئەبن شێخ محمدێکیش لەوێدا ئەبێ جوتێ پـێڵاوی کڕیبـوو پێـی ئـەبێ وتـی قوربان ئەم کچانە هـی جەنابتانـە رەنگـە لفانـە بـن وا لێـك ناکرێنـەوە ئـەویش لەسـەر خـۆ ئەفەرمووێت بەڵێ وایە، بەڵام بە ئێوە نا و پیاوی خۆیان ساڵێ دوایتر لێکیان ئەکاتـەوە. ئـەی ئێوە بۆ جووتێ پێڵاوی چاکتان کڕیوە؟! ئەبوایە دووان بووایە قوربان پێویستتان ئـەبێ! کەچـی یەشتا لە هیچ کامیان ناگات.

* * *

## کاکەی دز کەی تەشریف دێنێتەوە؟!

لەوبەری کۆیەدا پیاوێکی خۆش حاڵ ئەبێ تا رادەیەك باری گوزەران و دارایی رێك ئـەبێ و ئـەو کاتە زۆربەی گەل هەژار ئەبێ بە هۆی زاڵبوونی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی، دزی کردنیش لـە بۆگـەنی رەوشتی ئەوانەوە چەکەرە ئەکاو بڵاوئەبێتەوە، شەو دزێك دێتە سەر کەنێراوی ئاغا ئـەبێت ژنەکـەی پێی ئەزانێت مێردەکەی هەڵ ئەسێنێ و پێی ئـەڵێت: سـەگەڵەکە دەم لێـك نـانێن ئـەویش هەسـت رائەگرێت خەریکن وا ماڵەکەی ئەبڕن دەنگ ناکات پیشەی دزیش وایە کە خـانووی بـڕی لـە پێـشا سمت و کلۆکی دائەکێشێتە ژوورەوە پاشان وردە وردە ئەڕواتە خوارەوە ئەمیش دەرفـەت دێنـێ تونـد سمت و کلۆکی ئەگرێت و شەرواڵەکەی دێنێتە خوارەوە بێ سڵەمینەوە پیا ئەکێـشێت حـەقی بـەرەو دوای لێ ئەکاتەوە دزەیش ماوەی هیچی نابێ و هیچی پێ ناکرێت کابرای خاوەن مـاڵ لێ ئەبێتـەوە دەرپێکەی هەڵ ئەکێشێتەوە دزە ئەڕوات خاوەن مـاڵ بـەخێر هـاتنی ئـەکات و ئـەڵێت کـاکی بـرا بەخێرکەی دێیتەوە؟! ئەویش وەڵام ئەداتەوە کەی حەزم لە گاندان کرد ئەوا دێمەوە.

* * *

## قەزای قولی هاتە ملی:

لەوبەری کۆیەدا رێبوارێك رێی ئەکەوێتە دێیك بیر ئەکاتەوە لە دڵی خۆیدا ئەڵێ ئـەم شـەو ئەچمە ناو کادێنی ماڵێك رەنگە شەو دەرم نەکەن؟ بەدزییـەوە لـە بـەینی مـەغریب و شـێوان هەلی دەس ئەکەوێ ئەچێتە ناو کادێنەوە شەو کەمێك رائەکشێت یـەکێك بـە دزییـەوە دێتـە ژوورەوە ئەمیش تا ملی خۆی ناوەتە ناو کا، پاش کەمێك ژنـی خـاوەن کـادێن ئـەویش دێتـە جێگەی ژووان. باوەش بەیەکدا ئەکەن ئەڵێ فلاَن کەس ئەوە چۆن حەزت لە من کرد؟! ئـەویش

ئەڵێ: چونکە فلاّن ڕۆژ شەرتان بوو لەگەڵ فلاّن ماڵدا تۆیش تێلاّیکت گرتبوو بە دەستەوە ئەتوەشاند بۆچی بەرچیغێك لەوێدا ناکەوی!! کابرا هەڵی ئەگریّ و رای ئەوەشێنیّ بۆ بەفیزێکەوە نایکێشێت بە کایەکەدا، بەر سەری کابرای رێبوار ئەکەوێت کابرا هاوار ئەکا ئای باوکە رۆ برا رۆ کوژراو خۆم هەی هاوار خەڵکینە بمگەنیّ، ئیتر خەڵکی دیّ دەوری لیّ ئەدەن و دێن بە دەنگییەوە تیماریان کرد وتی: ژن و پیاوێك بوو وایان لە من کرد نەمناسین ژنێکی قۆشمە وتی: قەزای قولی نای لە ملی.

* * *

شێخ علی برای شێخ رەزا بانگی شێخ رەزا ئەکات ئەڵیّ: رەزا دوو شەوە نیو شیعرم بۆ هاتووە نیوەکەی تریم بۆ تەواو بکە ئەویش ئەڵیّ بفەرموو:

مەی ئۆمەی ساقی ئۆ ساقی حالەت ئۆ حالەت دوگل

ئەویش ئەڵیّ: گوێت ئۆ گوێت تفرج ئۆ تفرج ئالەت ئۆ ئالەت دوگل

* * *

## ماڵی خۆ نەخۆر بۆ چەکمە بۆر:

پیاوێك ژنێکی ئەبیّ بێزوو ئەکات و زۆریش دەوڵەمەند ئەبیّ تا بڵێی رژدو رەزیل ئەبیّ، ژنەکەی داوای گۆشت یا سیوجگەر ئەکات ئەویش دێتە شار و لای قەساب مامەڵەی ئەکات ئەڵێت بە درهەمێکە ئەڵیّ خالۆ زۆر گرانە قەساب ئەڵیّ بۆ ناچیت بۆ کەرکوك لەویّ هەرزانە بە نیو درهەمە؟! کابرا ئەی گوتیّ بۆ کەرکوك لەوێش پێی ئەڵێن بچۆ بۆ هەولێر لەویّ زۆر هەرزانە بیکرە ئەچێت بۆ هەولێر شەوی بەسەر دێت رێی ئەکەوێتە ماڵێك کابرای خانە خویّ خۆش هاتن و رێزی لیّ ئەگرێت خواردن و جێگای چاکو پاکی بۆ دابینئەکات پاش ئەوەی شەو ڕائەکشیّ ژنەکە بە مێردەکەی ئەڵێت: بیکوژن جا بیکەن یان بیکەین جا بیکوژین؟! کابرای میوان رۆح دێتە سەر لوتی ئەڵێت بە خۆی بۆ سیوجگەری چۆن خۆم بە کوشتدا؟! کە گوێی گرت وا زرم و کوت دێت روانی گۆرێك هەڵبەستراوە لە ژوورەکەدا وا بە هەردووکیان دارکەری ئەکەن خۆی مەلاّس ئەدا تا بەیانی خانە خویّ هەڵی ئەسێنیّ نوێژ و قاوەڵتی ئەکەن کابرا رووئەکاتە خاوەن ماڵ تووخوا پێم بڵێن مەعنای چی بوو گوێم لیّ بوو بیکوژین جا بیکەین؟! پێچەوانەیشی وەلاّمی ئەداتەوە:

برام ئەم ژنە وەختی خۆی خێزان و حەلاڵی پیاوێکی تـر بـوو، منـیش ڕەنجبـەریان بـووم، زۆر دەوڵەمەند بوو قەت تێری نەئەخوارد لە ماڵی خۆی گۆشتێکی بـۆ ماڵـەوە نەئـەکڕی میـوانێکی بەریێ نەئەکرد هەر کۆی ئەکردەوە و جاغی کوێر بوو کاتێك مرد لەسەر سپاردەی خۆی لـەو ژوورە ناشتمان بەلای نەختینەکانییەوە ئەم ژنە بانگی کردم وتی وەرە شوت پێ ئەکەم، بـەلاّم هەرچـیت پێ ئەڵێم ئەبێ بە قسەم بکەی وتم باشە وتی ئەم پیاوە یەکجار دەوڵەمەندە هەرچـیش هەیـە لای منەو گەردەنیشی ئازاد کردووم، بەلاّم ئێمە درێغی نابێ بکەین لە خواردن و چاکە کردن بە ڕاست و چەپدا لەسەری منیش بە شەرعی خوا مارەم کرد و هیچ درێغیمـان لـە خـواردنی و پیـاوەتی و چاکە نەکردووە، بەلاّم هەموو شەوێك پێش ئەوەی بیچنە جێگەوە و ئیـشی شـەرعی بکـەین دوو لیستمان داناوە جارێ وا ئەبێ پێش کارەکە گۆڕەکەی دارکاری ئەکەین جاری وایـش ئـەبێ دووای کارەکە لیس کوژی ئەکەین پێی ئەڵێین: ماڵی خۆنە خۆر بۆ چەکمە بۆر بە کوێرایی چاوتەوە ئێمـە ئەیخۆین و ئەیکەین، ئا لێرەدا کابرا تاس بردییەوە لێی بوو بە دەرس و عیـبرەت خێـرا گەڕایـەوە هەر کە گەیشتەوە ماڵەوە خێرا مەرێکی دا بە زەوی داو سەری بڕی ژنەکەی سەری سوورِما وتـی ئەوە چییە پیاوەکە؟! وتی ژنەکە وازبێنە تۆ گێو من کوژ پەیابووە با بیخۆین.

* * *

خێزانێك هەیە ئەژین لە بەغداد لە نەژادا کوردن سەرەك خێزان ناوی مەغدوورە یەك ڕستە کوردی نازانێ، ژنەکەی کەمێك تێ ئەگات برایەکی هەیە یەك ڕستە عـەرەبی نـازانێ دایکیـان عەرەبییەکەی شکاوەیە کە دائەنیشن گوێیان لێ بگرێت سەرت سڕ ئەمێنێ. برا کوردەکەی کە باسی کوردایەتی کورد و عەرەب ئەکرێت ئەڵێت من بڕوام پێـی نییـە تـەنها برایـەتی کـوردو عەرەبی من و مغدووری برام نەبێ ئەشهەدو من و ئەو براین.

* * *

لە (کەرکوك) دا کۆمەڵێك ئافرەت دائەنیشن لە یەکتر ئەپرسن: ئەوە مەعنای چییە؟! فلاّن شافعییە فیسار حەنەفییە؟! یەکێکیان، وەلاّم ئەداتەوە شافعی لایان وایە لـە کـاتی بێنوێژیـدا چوونە لای ژن دروست نییە تا پاك نەبێتەوە، بەلاّم حەنەفی لەو ماوەدا لـە دواوە کـاری خـۆی ئەکات تا پێشەوە بە کەڵك ئەشێ و خاوێن ئەبێتەوە یـەکیتر ئـەڵێت: ئەحمـەد بـە باسـی هـەم شافعی درهەم حەنەفی در بیروەختی بۆ خدر، واتە باوکی ئەحمەد هەم شافعییە هـەم حەنەفییـە هیچ وەخت پاش و پێشی نییە.

* * *

ژنێك کوڕێکی شێتی ئەبێ شێتێکی قسە نەستەق، بردی بۆ لای شێخ کە لەوێ چاك ببێتەوە جەنابی شێخیش چەکداری هەبوو پاڵپشتی میری ئەکرد لە دژی جەنگی ئێران و عێراق و بە شێخێکی زۆر گەورە ناسرابوو کە ئەچنە لای شێخ دەست ئەکات بە دواندنی شێتە وتی ئینشاالله چاك ئەبیتەوە کوڕم عاقڵ بە ژیر بە شێتە وتی یا شێخ جا چاك ئەبمەوە وتی بۆ چاك نابیتەوە وتی: چونکە کەریان بۆلای جاش هێناوە جەنابت جاشی ئەوەتا بە چاوی خۆمان ئەبینین جا شێخ عارەقی کرد وتی ببیەنە دەرەوە؟!

* * *

## حیکایەتی خۆ زۆڵ نین

تەکیە گەرمە بازاڕی سۆزی دەروێشە هەر کەسێك لە بارێکەوە ئەدوێت قسە هاتە سەر ژن هێنان (١ – ٢ – ٣ – ٤) یەکێك رووی کردە مەجلیسی شێخان و وتی قوربان بۆ ئێوە هەمیشە پتر لە دوو ژن دێنن؟! شێخێك لە هەرە گەورەکان وتی ئاخر ئێمە زۆر گان کەرین شێخین شێخ!! وتی قوربان زۆر راستە مێینەکانتان لە خۆتان ئەچێت ئەگینا ئەبوایە زۆڵ بن چونکە هیچ لاتان قسوور ناکەن رەگ بە ریشەو گەنم بە بنەتۆو لە هەر کوێ بن و جاختان روونە.

* * *

## حیکایەتی ماشاالله

ماشاالله (جهنم) بووە بە {دار شهداء} لە زەمانی کەریم قاسم گەلی کورد دەستی دایە چەك بە ناوی شۆڕشەوە کۆڕ و کۆمەڵێش هەبوو زۆر لایەنگیری میری ئەکرد، ئێوارە وەختە هەندێك لە پێشمەرگەکان خۆیان ئەکەن بە دێی هۆرێناو ئەچنە ماڵی مامۆستا مەلا حەسەنی هۆرێنی کە شەو دائەنیشن مامۆستا ئەپرسێت: ئایا رۆڵە هیچ خەسارەت و زیانتان بووە وا پەرۆشن؟! ئەوانیش ئەڵێن بەڵێ قوربان: ئەڵێت چۆن بوو؟! ئەڵێت ئێمە دوو شەهیدمان بوو میری سێ تا چوار شەهید جاشەکان دوو شەهید شوعییەکان یەك شەهید مامۆستا ئەفەرمووێت ئەمانە هەموو هەر شەهید بوون؟! ئەڵێت بەڵێ مامۆستایش ئەفەرموێت ماشاالله چۆن جەهەنم بووە بە{دار شهداء}.

* * *

بۆ گێڕانەوە باشە: حەمە چەکوشی زیندە بەچاڵ کرا!! شێتێك دانیشتبوو لەبەر خۆیەوە ئەی وت: ئەم کەژاوەیە بووکی تیا سوار ناکرێ لەبەر خۆیەوە ئەی بۆلاند لەگەڵ بۆڵەکەیشا بەردێکی بچووکی فرێ ئەدا ئەیدا لە بنگی کولەکەکە زرەی لێوە نەئەهات ئەی وت یا شێخ قوربانت بم بیخۆ لە من خەرابتر کاکەی کرێکار تۆ بەدەس بەگو ئاغاو شێخ منیش بە دەس ژنەوە: ئاخ ژنان داخ ژنان مردم لە داختان ئاخۆ بەسەر کێدا؟! ئەرێژن قەرەزاختان بەخوا سەیرە ئارام و ئاسایش بۆ لەم خەڵکە هەڵگیراوە؟! خۆ ئێمە ئاشت بووین؟! ئاشتی خۆراکی هەست و گیانی مرۆڤە مەل و باڵندە لە هێلانەکانیاندا بە ئارام بوون؟! بۆ کوێ چوون؟! زیندەوەر بە کام و ئارەزوو ئەهات و ئەچوو لە پێش ئێستا ئەریڤان و مەریوان بادینان و هەورامان یەکیان ئەگرت لە گەرمیان و لە کوێستان گەشەو بزە خەندەو پێکەنین بوو بوون بە پەپوولەی سەری شکۆفە گوڵی دەم و لێوی ئەو خەڵکەی جێ نەئەهێشت. خۆزگە بەو کاتە بەو وەختە بەوددەمە هەر کەس بە ئاواتێك بە هیوایەك بۆ خۆی خڵەفابوو بەروبووم هەڵگیرابوو تازەیش چەکەرەی کردبوو رووابوو، حەمە چەکوش بیری لە رۆژی رەشی وا نەئەکردەوە کلاوی ئەنایە قنجی سەریەوە بەکاوە خۆ لەسەر کار ئەهاتەوە پشووی حەسانەوەی تەواوی لە ناو خێزانەکەیدا ئەدا ژنەکەی و کچەکەی و دایکە پیرە ژنەکەی کە تەنها هەر ئەمی هەبوو زۆری دڵ پێ خۆش بوو دونیایەکی سەیرە!! پەلاری قەدەر شەلْ و کوێرم نا پارێزم گیانی ئەم خەڵکەی ئەدوورییەوە بە هەزارانی دائەپلۆسی ئەیکات بە خۆراك و دەرخواردی ئەژدەهاکی ئەم شەرخەی ئەدات بێ بەزەییانە دەرخواردی ئەو مارانە ئەدرێن بە قۆچی قوربانی ئەکرێن ئەژدەهاکی ئەم سەردەمە پەشتا رووباری خوێن و خەمی لا کەمە. چ رۆژێکی رەشە هاونیشتمانی خۆزگە و ئاوات بە مردن ئەخوازێت کەچی مەرگ پێ خەفی ئارام و هێمنی ئەسوتێنێ گوڵی ئاسایش ئەوەرێنێ تۆوی دووبەرەکی ئەوەشێنێ رووداوێکی جگەربڕ بوو تەنها ئیمپریالیزم کور بوو وەك بەرزەکی بانان دەرچوو. دروستکردنی ئاژاوە بە دەست چەپەلانی ئەم لاو ئەولا کەوتنە کۆشش پیاو خراپان مەرگەوەر جامی تاوانی شکان لەسەر کاسەی سەری بێ تاوان بێ پەروا خۆی لە ناو خەڵکا پێ ئەشارێتەوە ئەڵێت پەکوو!! بەخودای سەلامەتە:

پیاو چاکێك نییە دوعاگیر بێ نزیکی میر بێ رەفتاری ژێر بێ... (٢٧٠) قاسمی مشترك نیهادی نەگۆڕابوو دەستەو کۆرە رامیارییەکان جۆر بوون گشتیان بە خەستی مۆر بوون کلپەی ناکۆکی گڕی سەندبوو ویژدانی نەبردبوو، لە تان و بۆی برایەتی نە بووردەبوو،

ئەو کاتە دەستی برایەتی بڕا، حەمە چەکوش زیندە بەچاڵ کرا، لێرە و لەوێ ئەڵقە لە گوێ دەنگی وەك زەنگی دیر ئەزرینگایەوە، شقڵی دۆلاری پیس ئەچریکایەوە، لە جۆرکەکان

ئەبریسکایەوە، کڕینی هەندێکی مسۆگەر کرد، شالاوی بۆ زۆر لای تر برد، بۆ تامی تامی ئاو ئەزایە دەمی جنۆکەکان ببوون بە یەك شەیتان جنۆکەکان ئەتوت خورمای بابییە هەر کەس دەنکێکی بخواردایە ئیتر ئەبوو بە دەروێش و سۆفی ئەو خانەقایە لەو مەزاتخانەیە کڕین و فرۆشتن بوو هەر تەنها پیلانی تالآن و کوشتن بوو و ئەبوو بەسەر چۆپی کێشی ئەو زەماوەندە شاباشی سەری مەیموونەوانی ئەکرد.

مەزات هەی مەزات هەراجە هەراج سەرو سامانی کوردی لا مەبەست بوو جا هێدی هێدی لەسەرخۆ فوویان کرد بە فیقنە و زوورنادا شێخ و بێوەژن خۆیان بادا با مەست و سەرخۆش براوێنیێ، ئەمە چاکترە دڵی داخورپێنیێ ئەوانەی کرمی کینە بەری ئاوێنەی دڵی گرتبوون لەسەرخۆ چووبوون هەمیشە ماندوو بوون مرۆڤ دۆستیش کرمۆڵ بوون وەکو ئەسپ لە سمکۆڵ بوون ئەیان نووسی دوو توخمی رەگەز جیاواز لە بۆتەیەکدا ئاوێتە ئەکرێت و ئەتوێتەوە ئیتر لە قالب نادرێتەوە کێشە و بەربەرەکانی ئەبڕێتەوە هەندێك کەوتنە بیرکردنەوە کتێبی فاڵ بگرنەوە بەختی خۆیان تاقی کردەوە لە ئەستێرە و خورشیدا تاسی بردەوە چارەسەری مەبەستە ئاڵۆزەکان لای مەلای کتێب سوورەکان هێماکانی باش هەڵنەسەنگاند تێی نەگەیشتن بۆیە دۆڕان.

جا گیراوخانە بوو بە مۆڵگەی پیاسەی قەڵەو یانەی بێتاوانی رۆژ و شەو ئەیان پێوا بست بە بست قولانج بە قولانج نەئەگەیشتنە ئامانج هەنگاوی نائاسایی گەف کردن لە سڕینەوەی مەڵبەندی خۆرسکی یەزدان شێوانی سروشت و روشتەی ژیان سێ دێڕی برایەتی خووم شێواوە قەی ناکات چییە؟! منیش وتم رێگا درکەزییە هەر فیقەنەیەك لێ بدرێ دەنگی دیوار ناسمێ گۆبەندە باوك دوژمنی فرزەندە سوقرات دووبارە ئەبێ پیاڵەی مەرگ بنۆشێ بە زەهرەوە، بەداخەوە قوتابییەکان دووبارە کۆستیان کەوتەوە پانی و درێژی چوار گۆشەی گشت ژوورەکان بوو بە ماتەمینگا، بەسرایەوە رێگا داخە جگەر بڕە کسپەیە ماتەمین کۆست ئەکەوێ، چی نەشێوێ.

هەوری رەش باڵی کێشاوە بەسەر دۆڵ و چیاوە شاخە سەرکەشەکان تەم و مژی گرتووە ترس و لەرزو بیم گەشەی لە روخسار پڕوکاندووە دڵی بێوەژن هەتیوی بێ باوك دایکی جگەر سوتاو دەروون و ویژدانی ئەخستە ئازار زۆریش لە خۆ ولاتی یەکتریان لە گیراوخانە ئەناسییەوە کەسانی خاوەن بیروباوەڕ بە سەلکی سیر و قنچکی پیاز نەئەچوون هی وایش هەبوو سەری تێکچووبوو سەرەو خوار سەرەو ژوور ئەچوو، بەردی بۆ ئاسمان فڕێ ئەدا تفی بۆ ناوچاوی خۆی ئەکرد بە زەنگوڵ لە بوونەوەری ئەکرد سڵ ماکانی مشکی سەر خەزینە بوو عیلمی لا پەڵپینە

بوو تازە کەی کێ دەمەلاسکێی کوڕی ئازار ئەکاتەوە مەنجەنیق تاو دراوە گڵپە ئەکا ئەیەوێ بتخاتە ئاوەدان کاتەوە خۆی ببێ بە موغ و پیری موغان لە ئاتەش کە دەدا لەگەڵ کەشیشاتیکەی چەور و نەرم بگلمێنێ بووکی هیوا لە ئاسۆدا بگلێنێ و بگەوزێنێ هەی ئافەریم کەری دێزە کاری وات لا پیرۆزە.

بەڵێ پاشگەزبوونەوە لەو مافەی خۆیان بەڵێنیان دابوو رۆژنامەیەك زوو ئەگەیشتە بازاڕ پێنووسی نووکی شکابوو لە تۆمارکردنی دەنگوباس، پاڵەپەستۆ خەڵکی تووشی تەنگەنەفەسی کردبوو بە توندوتیژی دووبارە میزڵدانی فیتنە تەقییەوە کێشە و ناکۆکی دیسان بێ لایەن و بێ تاوانی کرد بە مەلەوانی کوندە لە دەس بەربوو لە مانگی رەمەزاندا {الله أکبر} مانگیراوە، نەخێر بینراوە لە دێی سیارە قۆچی قوربان بە زەویدا درا هەژدە بەران سەر بڕان لەولاوە کاکم کاڵەك و شوتی بە چنگاڵی مەرگ شەق ئەکات و قوتی ئەدات.

ئاخر زەمانە: خەرمان و مەڵۆی برایەتی پاکۆی ئەدا بنبڕی ئەکا پێنووس ئەشکێنێ مێژوو لەلایەن خۆیەوە رووداوی تۆمارکرد قیامەتی رەگەزپەرست هەڵسا خوێن بە رووبار رژێنرا ئێسقان شکێنرا هەلپەرستان لە گۆمی مەنگ و لێلاودا هاتنەدەر رایەڵیان تەنی، کەفیان ئەچەنی لە بۆگەنی، لەم لایشەوە ئەوەندە شەکوشی و زیندان کوورەی بۆ دانرابوو بێ ئەندازە فووی تێکرابوو لالغاوەی مووشە دەمەی دەمیان تەقەڵی هەڵپچڕابوو بۆ بەرژەوەندی خۆیان ماری کینەییان گینگڵی پێ ئەدان.

دەستەیەکی تر بە نهێنی لە ژێر سەردا بەکان ئیشیان ئەکرد، بانگی گەلیان ئەکرد بە پێی سەرنجی تایبەتی لای خۆیان بۆ خودی وڵات و کوردستان شەقڵی پەنجەیان ئەنا بە گوزاریش نامەدا بۆ بەرگری کردن لەلافاوی مردنە واتە بڕینەوەی کێشەکان بە ئاشتیخوازانە بە گفتەگۆو برایانە ئەوەی مۆری کرد ناوەکانیان هێڵی سووری بە ژێرداهات و پێچرایەوە لە ئەرشیفی تایبەتی بۆ کاتی پێویست دانرا تا دەزگایەکی لەبارتر دێتە کایەوە و بۆ لێپرسینەوە هەرچی مایەوە، بەڵێ هات پێشوو سەرەو نخوون کرا رەنگەکان لە جێگەی خۆیان کاڵ بوونەوە دیسان پیاچوونەوە هەندێکیش وەك نەهەنگ لە خۆی بچووکتری قوت ئەدا رووکەشێك پێك هێنرا، ئۆخەی ئۆخەی ئاشت بووینەوە.

نەخێر وچانە کوردانە، خۆئامادەکردنە بۆ تەکانێکی تر سەری مارەکان لای خۆیان پان بکەنەوە ئەمجا بە ئێمەدا بچنەوە زۆر شت کرا لەناو برا ئەو پەیمانە دیسان دڕا ئەگەر بڕێکیش لە مردن رزگاری بووبوو لە بەندیخانە ئاخنرا پەلپ و بیانووی دروست کراو بوون بە مایەی قۆچی

قوربانی لە کەشتییە کۆنەکەی حەزرەتی نووح (أستغفرالله العظیم) ڕووباری دیجلە و فورات پۆل پۆل ئەواهات.

کزۆڵ و حەمە چەکوش لە پاڵی یەکتر جوت کران، چونکە یاداشتی ئاشتیان مۆرکردووە کاکە حەمە ئەی وت: نەخێر بابە بە قورئان هیچم نەکردووە لێتان تەنها (إستعمار) ئەبوغزێنم گەر کاڵەك بە ئەژنۆ بشکێنم.

دەنگوباس خۆی ئاخنی بە ژوورا: خەڵکی دڵخۆشە هەموو شت بە کامی دڵی دۆستانە خەڵك بە ئاوی زەمزەم شۆراوەتەوە هەموو تاوانی لە بیر ئەباتەوە کەڵەبابی سەر لە ئێوارە دیسان بانگ ئەداتەوە لەولایشەوە پەپوو ئەخوێنێ دەنگی وێرانی وڵات دێنێ.

ڕۆژ و شەو هەفتە و مانگ تێئەپەڕێت ماوە خۆش ئەبێت هەندێ ئەستێرە بەخشیان کز ئەبێت چرایان ئەکوژێتەوە کە ڕۆیشتن ئیتر نایەنەوە تا کۆمەڵێکی تر دێنە سەر شانۆی ژین و کارگوزاری ئەکەن ماوە بۆ هەندێکی تر چۆڵ ئەبێت خولیای کاوە جارێکی تر ئەروێت بۆیە سەرلەنوێ جومگە و پێشەی کوردی سەردەم بە ئاگر و ئاسن بە سووتان و وێرانکاری ئەدرێتەوە دەس یاسای ڕامیاری تا قین و داخی دڵیان بڕێژن پاشان وەڵامی مافی ژێر پێ خراو ئەدەنەوە هەزاران کۆستی زیندوو ئەخەنەوە بە پاکۆ دانی ویژدان و دەروون و بارستەی لاشەی ژێر گڵ خراو بە گزرە کردی ژن و پیاو کچ و کوڕ و لاو... تا خوێن نەبێ بە ئاو مرۆڤ گەیشتە ڕادەیەك ئاواتی بە مردن ئەخواست ئاسمان بەرگی ماتەمینی پۆشی تەمومژ زەوی کێو و کەژی داگرت ترس و بیم عەقڵی ژێری شێت کردبوو شێتی پەتیا ڕیش بووبوو بە شێت چەخماخەی ئەدا ئاسمان زەوی کڵپەی گڕی سەندبوو بە گشت لادا پەرەی سەند بوو مرۆڤ لە خۆی و لە کەس و کاری بە گومان بوو بگرە سڵی لە سێبەری خۆیشی ئەکردەوە ڕۆژێ چەند جار هەڵئەساو ئەمردەوە پۆرخز بووبوو بە چەتری سەری خەڵکی بەرادەیەك خۆفرۆشیش ڕاپۆرتێکی لەسەر ئەدرا بۆ پێی حیساب و پرسیار ئەبرا ئەگەر یاخییەکان زۆر باشیان لە یەکێ کردبێ، یا شەوێکی کوردایەتی درکاندبێ ئەبێ مامەڵەی یاخی لەگەڵ بکرێت لە هەلێکا بە دادگای کاتی بدرێت کەمترین سزا کە بدرێت بەستوونی کارەبادا هەڵواسرێت.

سەمەرەیە: شێت و دێوانە لە بەندیخانە خزا دەستیان بە ئاگر چزا برێك ئاوی ناشیاوی پیالکێنرا ئاوا حەمەچەکوشی پێ زیندە بەچاڵ کرا، یەکەم تاوان بوو لەو دەربەندیخانەدا کرا.

❋ ❋ ❋

## کاکەی بروسکەچی

ئازار و ئەشکەنجە بروسکەچی هەڵئەقرچان وەك ژارەماسی خواردبێ وابوو دەنگوباسی قەلاچۆی کورد پێوەی دابوو هات وتی رۆژی گەل ئاوابوو پاشە رۆژێکی تاریك چاوەڕوان ئەکرێ پاکۆ دان و خوێن شتن دەشت و شاخ، دێهات سووتاندن لاشەی مرۆڤ بۆ خۆراکی مردن ماڵ و سامان بەتالانکردن ئاوەدانی بە وێرانکردن، بە ئەنجام ئەدرێ ئەمەیە باسی رامیاری بە نهێنی راگەیاندرا ئێوەش بە خزم و کەستان رای بگەیێنن، هاتووچۆتان نەکەن ئەوانیش بە خەڵکی بڵێن: ترسێکی لە ناکاو لە پێشەوەیە ئەم پەلاماردانە لە پاش و لە پێشەوەیە سووپاگا ئەبێتە دادگا.

سەر و فەساڵ ناشرین بوو هیوای خۆشی بڕا کزەی گەشی لە دڵ و دەروونی گشتلا پەنگی خواردەوە وەیشوومە بوو گشتی بردەوە لە ناکاو رێگا داخرا هاتووچۆ بڕا گیان ماڵئاوایی لە میوانداریەتی ئەندام و تەن کرد پەنای بۆ یەزدان برد بارانی مردن حەشری پێ کردن.

مووچە خۆرەکان رەوانەکران: رۆژێکی دژوار و ستەم بوو، هەموو چاوێك فرمێسکی گەرم و بەکوڵی ئەرشت ویژدانی نەمردوو نەکراو کسپەی لێوە ئەهات خۆڵ و گەردی گۆرستانی بێژرابوو بەسەر ئەو خەڵکەدا مووچە خۆرەکان پێکرا هێنرانە فەرمانگا، هاتووچۆ قەدەغەکرا، چوار دەوریان بە تانك گیرا سەرباز کالای غەزەبی پۆشی، ماوەیان نەدان بچنەوە ناو ماڵ و خێزان، پەل بەست کران توند سەپێنرانە ناو زیلەوە رەوانەی ناوچەکانی خواروو کران کە پێیان زانی کەس و کاریان خوا هاوار نایەتە ئەژمار دانیشتوانی ناوچەکە: ژن و دایك و باب و منداڵ، کردیان بە زاری و فغان، لە داخا خەجاڵەت ئەبوو شەیتان لە ناڵە گوێی کەڕ بووبوو ئاسمان، هەر لەو بەیانییە زووەدا سووپا کەوتە پشکنین بە پێشرەوی ئەوانەی زۆر جانەوەرو دڕندە بوون، واتە ئەوانەی لە پێستی مەڕا نووستبوون خۆیان حەشاردابوو کزو مات وێستابوو لەگەڵ عابدی خەڵوەتخانەی هەژاران بەناو مەولوودی سیخور، پڵنگی جانەوەری جگەر دڕە دەمانچە بە دەست و ستەمکار، نەبەردی پیسی تاوانبار ئەم مرۆڤە گشت زاراوەیەکی عێراقی ئەزانی میچی قومارخانەی شەوەزەنگی وێرانی بوو هەڵبژاردەی شانەی بێگانی بوو مامۆستای موخابەراتی جیهانی بوو، ئەمیش لەگەڵ ئەوان ئاوێتە بوو، چالاکانە ئەهات و ئەچوو راشکانە پشکنین هەرچی دروشم کرابوو بە نووسین گرتیان و هێنایان بە قۆڵ بەسراوی خزاندیانە ناو ژوورێکی بچووك پیس و چرووك سەد کەسی تێخرا بە سوپا و سەرباز دەورەدرا بۆ رۆژی دادگا هەروا

شارەکانی گشت کوردستان گەمارۆدران بە هەزاران گیانی پاکی بێ تاوان زیندە بەچاڵ کرا بۆ ئەو دونیا رەوانەکرا بۆیە گۆرستانی شەهیدان ئەبێتە بەڵگەو نیشان بۆ زیکری وتارمان سبحان الله، کردەوەی ئاوا تاوانە تاوان ئەی گەلانی جیهان (حەمە چەکوشی قور بەسەر) هێنایانە دەر زیندە بە چاڵیان کرد بابە چی بوو خۆی مرد لە تەنها دایك و کچێك دوعا خوازی نەکرد میوانی ئەم سەر زەمینە بوو بۆ کوردستان نەختینە بوو ئەمە ساڵی (١٩٦٢) بوو تۆمارم کردبوو نەم زانی خەو ئەبینم وام ئەزانی گوڵ ئەچینم.

* * *

## کەرە کۆتەرە

مایاوا دێیەکە سەر بە ناوچەی سروچك پیاوێکی ئەو دێیە گوێدرێژێکی هەبوو ناوی نابوو کەرە کۆتەرە، هەرچی گوێدرێژ هەبوو لێی ئەترسا بار بکرایە لەگەڵ کەر گەلدا، خاوەنەکانیان ئەبوون بە چوارپا، کە گازی لە هەر کەرێك ئەگرت باڵی لێ پەیدا ئەکرد بەرلا بوایە ماین و بارگیری راو ئەنا ئەیویست لێیان هەڵ بێت چەند جارێك تاقی کراوەتەوە خۆپیشاندانی پێ ئەکردن: ولاخی دێی کۆئەکردەوە بە زەرە زەر پێشیان ئەکەوت، ئەیکرد بەرەوت چوار دەوری ئاوایی پێ ئەکردن منیش ئەم کۆلکە شیعرەم پێدا وت:

کەرەکۆتەرەی بە کام نەگەییوو
بۆ ماین و بارگیر گەڕای دۆڵ و شیو
بەماکەر رازی نەبووی تا تۆپیت
جارێك لە ماین بۆ خۆت هەڵ نەچوویت
لە ناو کەرانا بەگزادەی کەر بووی
لە دەمار و فیز و لەحەد بەدەربووی
لە ئیش نەکەری تەمەڵی و سستی
پیتی بۆرجوای کردبووە دەستی
سەیریش بوو کەر و ماین و بارگیر
لە ئەم ئەترسان وەك دەروێش لە پیر
فیتۆزە ئەبوو لە سەرووی کۆڵان
دڵداری ئەکرد لەگەڵ جاشوولان

وەك چکمەرەقی شێخ و بەگزادە
لا قرتێ بکا بە کیژی سادە
ئارەزووی بوایە بە لوشکە و زەڕین
چوار پێ لە ترسی گشت دەرئەپەڕین
ئەیکرد بە بەزم و بە موزاهەرە
بە دەوری دێدا فرکە و مەسخەرە
دیوار و پەرژین خانووی بنە بان
وەکو مامۆستا بازی پێ ئەدان
نە جوتکە و لوشکە نەلەقەی ماین
چەپۆکێ ئەسپ نەی ئەکرد غەمگین
نەسوخرە کێشی شێخ و مەلا بوو
نەزیانە حزۆی گەل و بەلاّ بوو
هیچ کەسێ نەبوو باری پێ بێنێ
یا نەقیزە پشت کلکی بخورێنێ
قور بەسەر ئێمە چیمان بەسەر هات
بووینە مەسخەرەی سەر سەری ولاّت
شینی ئەو رۆژە ئەگێڕم بەدڵ
خۆزگە بەو رۆژە نەئەبووین خجل
یەکتر ئەکوژین جەنگیش بەرپایە
کەرە کۆتەرەیش زەڕینی نایە
ئەو رۆژە تێکچوو دونیا لە کزەڵ
کەر و جاش ئەبنە پێشەوا بۆ گەل
ترحێو هەی ترحیۆ لە سەرمایەدار
حەسانەوە قەت نابینێ زۆردار

*　　*　　*

## چاکە بۆ خوا هەر ئەبێ وابێ
## فەقێ محمد هەژارەو قادری مری وەیس

خالۆ قادری مری وەیس ئەبێ لەوبەری زەهاوەدا زۆر دەس رۆیشتوو ئەبێ و سەرەك هـۆز و بە پیاوەتی و جوامێری ناوی دەرکردبوو کوڕێکی ئەبێ رۆژی بەگژ ئەمدا ئەچێ و بیانوو بە هاو ماڵێك ئەگرێ رووی لەسەر چڵی ئەبێ، لە هـۆزێکی هاوماڵیانـدا کوڕێـك ئـەبێ نـاوی فـەقێ محەمەد هەژارە ئەبێ پیاوێکی هەژار لەسەرخۆ، بێ وەی ئەبێ پشت لـە خەراپـە و ئاژاوەکـاری روو لە چاکە ئەبێ.

رۆژێك تووشی کوڕی خالۆ قادر ئەبێ لەو دەشتە رێگا ئەکەن بۆ هۆزەکـەی خۆیـان کەچـی کوڕی خالۆ قادر هەواو لوت بەرزی ئەیگرێت دەس بە لاقرتێ کردن ئـەکا پێـی و سەرەچـەنەی ئەدات بێ ئەندازە ئەمیش خۆی زۆر ئەپارێزێت لێی بێ کەڵك ئەبێ هەروا لەبەر چاوی خـەڵکی هۆزەکە بە قامچی دای ئەگرێت گوایە کوڕە ئازایە و خۆی پێوە ئەنوێنێ فەقێ محەمەد هـەژارە لە دڵی ئەدات، دەستێکی لێ ئەوەشێنێ کاریگەر ئەبێ و ئەیکوژێت ناچـار خـۆی ئەشـارێتەوە هەر رۆژ لە جێگا ئەنجام خۆی ئەگەیێنێتە خاناقای بیارە لە دەوری شێخ (عمـر ضـیاءالدین...) هۆزی خالۆ قادر جەنازەی کورەکە ئەبەنەوە و ئەی سپێرن، بەلام باوکی چاوی تێـوە ئـەبێ کـە پرسە تەواو ئەبێ دوشمنایەتی نێوان هەردوو هۆزەکە گەرم ئەبێ و خالۆ قادر خـۆی نایـەڵێ زۆر گڕ بگرێت و بتەنێتەوە... پاش ماوەیەك خزم و خۆیشی هەژارە ئەچن دەس و داوێنـی بـەگزادە پیاو ماقوولانی ناوچەکە ئەبن بۆ مەسلەحەت خالۆ قادر ئەمانە داوا ئەکات:

دوو ژن، دوو ماین، دوو تفەنگ، دوو کیسە لیرەی خـالیس، ئـەگینا کوڕەکـەی بـۆ بیـنن بیکوژێتەوە لە بار تەقای کوڕەکـەی و ئـەمانیش مەیـسەر نـابێ و عقـڵ نایگرێـت و ناگەنـە ئەنجام.. پاشان شێخ (عمر) بانگی شێخ (علاءالدین) کوڕی ئەکات، ئەفـەرموێت ئـەڕۆیت لـە خزمەت مەلا (فتح الله) و فەقێ هەژاردا ئەیبەیت بۆ لای خالۆ قادر مری وەیس و کۆتایی بەم مەسئلەیە دێنێ و ئەیبڕێتەوە، ئەمیش تەشریف ئەبات تا ئەگاتە لای خالۆ قـادر پـاش نوێـژی عیشاو نان خواردن و خزمەتگوزاری بێ پایـان شـێخ (عـلاءالـدین) روو ئەکاتـە خـالۆ قـادر ئەفەرموێت خالۆ ئەمە فەقێ هەژارە هێناومەتە خزمەتت یام عەفوی بکە یام چارێکی بکـە و باوکم سلاوی هەیە و ئەڵێ خوا لە قورئاندا ئەفەرموێت {والكاظمين الغيظ والعافين عن النـاس والله يحب المحسنين} با دوژمنایەتی ئەم دوو هۆزە چەڵەکە بڕ نەکات.

خالۆ قادر وتی مەبەستی ئایەتەکە چییە؟! وەلاّمی ئەداتەوە خوا داوا لە ئێمە ئەکات: قینی خۆمان قوت دەینەوە لە تاوانی خەلکی خۆش بین هەروا خوا حەز ئەکات کە چاکەیشی لەگەلّدا بکەین ئەویش ئەلێ: یا شێخ وەخێر هاتی و سەرچاوان، هەرسێکیان ئەکەین، جەنابت پشتی داگە بەو چیغەوە خێزان ئێستا گوێیان لە ئێمە گرتگە با مامۆستا مەلا (فتح الله) بچێتە دیوی حەرەم کچێکی جوانم هەیە یاسای شەرع بەجێ بێنن و تەقلیدی پێ بکات.. کە مامۆستا هاتەوە بانگی فەقێ محمد هەژاری کرد لێی مارە بڕی پاشان بۆ بەیانی هانیدا دەوارێکیان بۆ هەلّدا هەرچی پێویستی مالّ بێت ناردیە ئەوێ و ئەندازەیەك باش حەیوان و ئاژەلّی کردە بەردەم دەوارەکە پاشان کچەکەی خۆی رازاندەوە وەکو بووکێکی رێکوپێك بردیانە ناو دەوارەکە، پاش نان خواردنی مەغریب و بانگی، فەقێ محەمەد هەژارەی کرد وتی رۆلّە بچۆرە ناو مالّ و مندالّی خۆت، ئەمجا رووی کردە حەزرەتی شێخ و دانیشتوانی دیوان وتی ئێوە بە شاهیدبن ئەگەر مردم پاش مردنم ئەم فەقێ محەمەد هەژارەیە لە ئێستاوە یەکێکە وەکو کوڕەکانم، بگرە لە بارەی کەلەپووری ئیرثەوە پاش خۆم لە گشت شتێکا و لە ئێستاش بە دواوە تا ماوەیەکی کە وەکو کوڕەکانم، جیاوازیەك دەربارەی تێبینی ناکرێ..

شێخ عەرزی کرد ئەی لەوە بەر بۆچی عفوت نەکرد خالۆ قادر؟! وتی یا شێخ ئەوانەی ئەهاتن پیاوی دونیا بوون، مرۆڤ ئەبێ بۆ خوا ئاوا رەفتار بکات و شەیتان شەق پێ بەرێ، ئەگینا تا ئێستا پەلپم ئەگرت لێیان، یا خوا بەخێر بێن سەر هەردوو چاوان چاوەڕوانی ئەم خێرو چاکەیەم ئەکرد..

* * *

میوان داری و پاداشتی مەردانە،، حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە!! باوەڕپێکراوێك بۆی گێرامەوە: لە کاتی دەسەلاّتی عوسمانییەکان حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە قایمقام ئەبێ لەلایەن میری شاهانەی عوسمانلي لە دەربەند فەقەرە ئەم پیاوە مرۆڤێکی چاکە خوازو دەسەلاّت و دیوەخان و میوان پەرێز ئەبێ، چونکە رۆشنبیربووە لە قەلّەم رەوی خۆیدا جێگای لە دلّی خەلّکی ناوچەکە کردۆتەوە شەوێك دیوەخان گەرم ئەبێ، لە میهمان پەزێری خۆی نامەیەکی پێ ئەگات لە دۆستێکییەوە لە سلێمانی، ناوەڕۆکی ئەوەیە کە سولتان فەرمانی داوە بەهەر جۆرێك ئەبێ حەمەد ئاغای قایمقام بگرن و نەیخەنە سەر شك و گومان و پەل بەستی بکەن و لە ناوی بەرن بەهەر هۆیێك بێت جا پێویست ئەکات چاری خۆی بکات، و خۆی بشارێتەوە تا خوا دەروو

ئەکاتەوە ئەویش دەنگ ناکات تا میوانەکان ئەنوون و خێرا ئەچێتە ماڵەوە، بە خێزانەکەی ئەڵێت بەپەلە خۆت کۆکەرەوە و چی سووك بێت بە دەستییەوە بێت لە نەختینە و پارە و جل و بەرگ و بێچوە کچەکەی هەڵی ئەگرن و بۆی دەرئەچن، بێ ئەوەی کەس بزانێ زەهاو خۆت بگرە وا هاتم دوو بە دوو خێڵ بە خێڵ ئەگەنە دێیەك ئەچنە ماڵی مەلای دێ، ئەوانیش دێن بە دەمیەوە بەرووخۆشی و هیچ لێی ناپرسن چیت و چ کارەی هەروا مەلایش بەرەنجی خۆی ژیاوە و زۆریش رێز گیراوە، وەك سەرەك هۆز تەماشا کراوە، بەیانی مەلا ئەچێت بۆ جووت، حەمە ئاغای کۆنە قایمقام گوێدرێژ دەرئەکات و ئەچێت بارە دارێك دێنێ بێ ئەوەی کەس پێی بڵێ و ئاغا ژنیش لەگەڵ مەلا ژنا دەس ئەکات بە فەرمان و مەشکە ژەنین و بەکونە ئاو هێنان، وەك ماڵی خۆیان بێ جیاوازی هەروا ئەبن بە خێزانێکی ئاوێتەکراو مەلا ژنیش هیچ ناپرسێت لە ئاغا ژن بە هیچ جۆرێك هەروا لەو پەڕی خۆش و خۆشەویستیدا ئەژین تا هەشت مانگێك. چێشتانێك حەمە ئاغا کابرایێك بەدی ئەکات ئەیناسێتەوە خەڵکی لای خۆیان ئەبێت ئەچێت بەدەمیەوە، لە دوورەوە ئەڵێت لێم مەپرسە و ناوم مەبە، ئەگەر نامەت پێیە ئا لەوێدا داینێ و بچۆرە ئەو ماڵە، سبەینێ وەلامەکەی ئەنووسمەوە لەسەر ئەو بەردە دای ئەنێم، هەڵی بگرەو بیبەرەوە. ئەویش کاغەزێك دائەنێت و ئەڕوات کە هەڵی ئەگرێت تێ ئەگات فەرمانێکی شاهانەی تێدایە، عفوو کراوە و کراویشە بە متەسەریفی سلێمانی، ئەویش وەلامی ئەنووسێتەوە: کە سێچوار ولاغ بێنن تا خۆیو خێزانی پێی بگەڕێنەوە پاش چەند رۆژێك دێن بە دوایدا، حەمە ئاغا دوعا خوازی ئەکات لە مامۆستا و مامۆستا ژن، ئەوانیش خواحافیزی لێ ئەکەن یەشتا ناپرسن چین و چ کارەن؟ بۆ ئەڕۆن؟ خەڵکی کوێن؟! زۆر ئاسایی ئەبێ لایان دەستیان ئەکەنە مل و ماچیان ئەکەن حەمە ئاغا ئەگاتەوە ولاتی خۆی پاش یەك دوو ساڵێك ناوچەی زەهاو تووشی نەهاتی دێت و پەرێشان ئەبن بۆ زەخیرە خەڵکەکە دێنە خزمەتی مامۆستاو پێی ئەڵێن: ناوچەی شارەزوور قەراخ بەهاتە زەخیرە و گەنم و جۆیان زۆرە ئەگەر لە گەڵمان تەشریف بێنی؟؟! ئەڵێت باشە دێن هەر دێن تا رێگەیان ئەکەوێتە دەربەن فەقرە و تا سی ولاخێکیان پێ ئەبێ، حەمە ئاغا ئەیان ناسێتەوە باش میواندارییان ئەکات عەرزی مامۆستا ئەکات رەنگە بۆ زەخیرە و ئازووقە هاتبن؟! ئەڵێت بەڵێ ئەویش باریان بۆ دائەگرێت تا ولاخ بتوانێت و پێیان رائەگەیەنێ کە مامۆستا پارەی گشتیانی داوە هیچ لەکەس وەرناگرێت و پاش دوو شەو بەڕێیان ئەکات کە دوور ئەکەونە ئەڵێن با پارەکەی مامۆستا بدەنەوە ئەڵێت پارەی چی؟! بەخوا من فلسم نەداوە و نایشمەوێت و کابرایش ناناسم هەر تەنها پێی ئەڵێن حمە ئاغای دەربەن فەقرە.

که شەو دادێ جەردە دەوریان ئـەگرێت، مـەلایش ئەچـێتە پێـشەوە ئـەڵێت ئێـوە چـیتان ئەوێت؟! ئەڵێن ئەم گەنم و زەخیرەتان لە کوێ دەسکەوتووە؟! ڕاست بڵێن مـەلایش ئـەڵێت بـرا چووینە دەربەن فەقرە حەمە ئاغا بە خۆرایی بۆی داگرتووین و لەوێ هێناومانە ئـەڵێت ئێـوەو ئەوان چیتان لە بەینە؟! بتان داتێ و بەخۆرایی مەلا ئەڵێت بچن لەو بپرسن. هەر ئەوەندە هەیە ئێمەو ئەو هەردووك موسڵمانین و خوایش دڵی ئەوی بۆ ئێمە نەرم کردووە سەر تەریـدە ئـەڵێت نەخێر وانییە ئێوە ناسیوتانە بۆیە چاکەی لەگەڵ کـردوون مـەلا ئـەڵێت مەبەسـتت چـییە؟! و ئەتەوێ چی بێژیت؟! ئەڵێت ئاخر ئەو حەمە ئاغایە ساڵێك لە ناو ئێـوەدا ژیـاوە خزمـەتکاری مامۆسـتا بـووە ژنەکەیـشی کارەکـەری بـووە ئێـوەو مامۆسـتا پـەناتان داوە!! ئێـستا چـۆن سەرکۆنەتان کردووە، ئەویش ویستوویە پاداشتی چاکەتان بداتەوە، منـیش روتتـان ئەکەمـەوە مەلا ئەڵێت برا گیان با پێت بێژم شتی وانییە، چەند مانگێك یەکێك لامـان ماوەتـەوە لێمـان نەپرسیوە چییە و چ کارەیە و بۆچی هاتووە وەك برا لامان میوان بووە کە ڕۆیـشتووشە نـەمان پرسیوە بۆچی ئەڕوات؟! تەنها ئەوەندە بە موسوڵمانێك بووە ئەو ماوەیە بە ئێمـە رازی بـووە و چەند بمایایەتەوە هەر هەمان ڕێزی ئەبوو، چونکە موسوڵمان برای موسوڵمانە حەقی لەسەرمان بووە کە ڕۆیشتووە مەعنای وایە کاری بەم برا موسوڵمانەی نەماوە ئیتر ئێمـە حەمـە ئاغـای دەربەند فەقەرەو خلە و بلە ناناسین، ئەو پیاوەتی و چاکەی خۆی کردووە، خوا پاداشتی بداتەوە و ئێمە بەتەمای سوپاسی ئەو ژن و پیاوە نین و سووپاسی ئەم حەمە ئاغایەیش ناکەین گشتمان موسوڵمانین و براییەوە، ماڵی موسوڵمان هی موسوڵمانە ئەمجا خۆی ئاشـکرا ئـەکات کـە ئـەم جەردەیە حمە ئاغا خۆیەتی دەس ئەکاتە ملی مامۆستاو تێرتێر ماچی ئەکات ئەڵێ مامۆسـتا موسڵمان و برای وەکو تۆم چۆن دەس ئەکەوێ؟! بە قوربانت بم مـن میوانەکـەت بـووم ویـستم تاقیت بکەمەوە بەخوا ناڕۆیت پیاو ئەنێریت مامۆستا ژنیش بێـنن خـاو خێـزان تێکـرا ئـەڵێ مامۆستا من و خێزانم برا بچووکو خوشکە بچووکین پێنج مانگێك لای خۆیان گلیان ئەداتـەوە بەو پەڕی ڕێزو میهرەبانییەوە.

حەمە ئاغا خۆی ئەڵێت: تا ئێستا ئەوەندەم خۆش ڕانەبواردووە و نەژیاوم بـێ خـەم و غائیلە بە قەد ئەوەی لای مامۆستا بچووکی بووم خۆم و خێـزانم و ئـەوانیش هیـچیان لێ دریغ نەکردووین..

❊ ❊ ❊

## ژنێکی مەرد و داوێن پاك:

کاك - هوما - خولکی کردم بچمەوە شێوی لەگەڵ بکەم و ژن و مێردێـك لـەوێ بـوو بـە میوانی وتی بیانناسە و بێن بە ئاشنا کە چووینەوە ژنەکە هات دەستی کردە ملی وەکو خوشـك و برا و لەگەڵ کابرادا ئەملاو لای یەکیان ماچ کرد وۆر بە تاسووقەوە مرۆڤ وای ئەزانی لـەم ژن و مێردە خۆشەویستی تری نییە گومانیش لەوەدا نییە نەخوشك و نـەبرابێ نییـەتی و هـەردوو لایان گەش بوونەوە بە بینینی یەکتر کاك هوما رووی تێکردم ها ئەڵێی دالغەت هەیە؟! ئـەزانم ئەتەوێ بپرسیت ئەمانە کێن؟!

ئەم ژنە مامۆستا و خوشکی دونیا و قیامەتی منە و مێردەکەیشی برامە هەتا هەم و هەتا ئەمرم و خاوەنی هیچ نیم لە عاستی ئەمان و دەسنوێژیش لەم خویشکەیشم ناشۆمەوە، چونکە فێری رەوشت و دین و ئەخلاقی کردووم، بەڵاّم ژن و مێردەکە دایان لە قاقای پێکـەنین وتم بـۆم بگێرنەوە چییە کارەسات؟! وتی خوشکم بابیگێڕێتەوە، وتی ناوالله خۆت باسـی بکـە دەی بـرا وازبێنە هەرچی بوو بەسەرچوو الحمدالله. کاك هوما وتی: پۆلیس بووم بە واجب رەوانە کرام بـۆ دێیەکەی ئەمان... شەوماینەوە کوێخا منی نارده ماڵی ئەم براو خوشکەم ئەمانیش لە دەوارا ئەژیان سەگەلێکی زۆریان هـەبوو، خۆیـشت ئـەزانی لـە (٣٠)یەکانـدا پۆلیـسێك دەسـەلاّتی حاکمێکی هەبوو، کە ئێمە ئەچووینە دێهاتەکان خەڵکی بێ هـیچ تاوانێـك ئەلـەرزین، لێمـان ئەترسان، ئێمەش خۆمان گیڤ و فش ئەکردەوە خۆمان بە کەش و فشێکەوە ئەنواند زۆر شـتی بێ جێمان ئەکرد بۆمان نەچووە سەر، چونکە خەڵك نەزان بوو، ئەو خەڵکە نەی ئـەوێرا دەنـگ بکات. منیش کە چوومە ماڵی ئەم برایەم لە ماڵ نەبوو ئێوارە نانی باشم بۆ کراو خـواردم بـە ئارەزوو حەسامەوە، شەو کاتی نووستن هات، شەیتان چووە بن دەستم، هانی دام چـوومە سـەر جێگەی ئەم خوشکەم، بە نیازی چەپەڵی گلاّوەمەوە، ئەویش وتی: ئـەوە کێیـە؟! ئەمـە تـۆی؟! دەباشە راکشێ تا ئێستا دێمەوە پاڵت کاتێکم زانی حەلەلەی لەسەگەل کرد لە خۆیەوە کردی بە هەرا ئا بیگرەو بەری مەدە، گاگەلەکەی بەرەڵلاّ کرد ئەمجا هاتە وێـزەم بـەر لیـسی دام کوێـت دێشێ هەموو گیانی تێك شکاندم دەست و سەر و چاو شل کوت کرام و هیچ جم و جوڵێشم بـۆ نەکرا هەر لە خۆیشییەوە دەنگی لە سەگەل ئەکرد ها بیگرە حەلەلە هەلەلە خەڵکینـە بمگـەنێ دزو جەردە ماڵیان تالاّنکردین ئەی هاوار کاکە هومایـان کوشـت، ئەمـە لەسـەر یـەك پیامـا ئەکێشێت ئەوە خۆی وانەبوو ئەویش پێ ئەکەنی و ئەی وت بەڵێ وابوو، بۆ بەدبەختی من ئـەو شەوە بەفرێکی یەکجار قورس باری پتر لە دوو بالاّ (٢٠) رۆژ رێگای برِی باڵنـدە دەرنەئەچـوو

خەڵكیش هاتن بە دەنگییەوە، بەڵام من لیس كوژراو كرابووم رایكێشامە سەر جێگاكەی خـۆم وای شەپرزە كردم یەكەم گورز لە تەوەرەی بردم ئەمجا ئاوی هێنا دەسـت و دەم و چـاوی شـۆریم برینەكانی تیماركردم برژاندییەوە رای كێشام بۆی كەوتم گشت رۆژێك رێكو پێك لەشی تـەداوی ئەكردم پیاوەكەی ئەم برایەم هاتەوە و هات بەلامەوە دڵخۆشـی دامـەوە و هیچیـشی بـۆ ئـەم نەگێڕایەوە كە راستییەكەی چۆن بووە هەر ئەیوت دز هاتە سەرمان ئەمیشیان وا شەپرزە كـرد رووی بابیان رەش بێت منیش هەر شەرمەزار ئەبووم، مردن بەدەستی خۆم بوایە ئەم كرِی جـار جاریش ئەهات بەلامەوە ئەی وت خۆ شكور چاكی گوێ مـەدەرێ.. ئـەمجارەیش رزگـارت بـوو تۆبە بكە خوا لێت ناگرێت، كە هاتمە سەر چاكبوونەوە پەیمانم كرد و بەڵێنمدا بەم وەبـەخوا تـا ماووم كەم و كورِی و خەوش نەبێ لە رەوشتما بە هیچ جۆر وە نوێژو رۆژ و تەرك نەكەم هەرگیز و لە چاكە بەولاوە نەیكەم.. منیش بانگی ئەم برایەم كرد واتێ گەیشتبووم زانیویـە ئـاوی بـۆ هێنام دەسنوێژم شۆری قورئانێك هەڵواسرابوو دام گرت سێ جار دەستم پیادا كـە تۆبـەم بێـت وەهەڵسام دەستی ئەمم ماچ كرد وتم عەفوم بكەن تۆبەم بێت لەسـەر دەسـتی تـۆدا وا تۆیـشم قەبووڵ كرد بە خوشكی خۆم خوشكی راستەقینە و ئەمیش بە برام ئەم خوشكەم وتی گەردەنت ئازابێ هەر رەنجێكم داوە لەگەڵتا واجبی خۆم بووە من خەجاڵەتم كە لێـرە لـە مـاڵی ئێمـە دز وایان لێكردی و بەفر رێگەی لێ گرتی تۆ گلەیی مەكـە، ئـەم برایـەم وتـی تێناگـەم قـسەكان بەراورد ئەكەم یەك ناگرنەوە!! وتم كورە وەرە پێشەوە بێ شەرەفی ناپیاوی خۆمت بۆ بگێڕمـەوە حاڵ و مەسئەلە وابوو، ئیتر چیم لێ ئەكەی بیكە، ئەویش ئەی وت پیاوەكە پێی بڕوا مەكە درۆ ئەكات لە ژێریشەوە بزە ئەیگرت، بە كوردی و بە كورتی بی بڕمەوە گەردەنیان ئـازاد كـردم و منیش پاكانەم بۆیان كرد لەو رۆژەوە ئەو خوشكی منە و ئەمیش برامە ئەچم لەوان میوان ئەبم و ئەوانیش دێن بۆ ماڵی برای خۆیان هەتا هەم هەر مەمنوونی خوشكی دڵسۆزی مەردی داوێن پاكی خۆمم كە منی كرد بەم پیاوە لە خوا بەزیاد بێ، ئەمجا منـیش بـەوان ئاشـنا بـووم، كـە چاكترین ژن و مێردن سیوان بە زێڕ و دڵنوازن خاوەنی دین و شەرەف و ئـەخلاقن مـن قوتـابی ئەمانم خوا یارمەتیان بدات.

❊ ❊ ❊

## خەڵكی لە پیاو ئەترسێت:

كات زستانە وەكو چووزەرەی رێواس چلوورە بە گوێسوانەدا هاتۆتـە خـوارێ تـا بڵێیـت سـاردە سالحە شێت هەبوو رێگای ئەكەوێتە دێی قەیتوول ئەو شەوە كەس نایباتەوە لە مزگەوتی بێ ئـاگر و

سوتەمەنیدا لە سەرما هەر گینگل ئەدا کە بەیانی خەڵك و خوا دێن بۆ مزگەوت لێی ئەپرسن چۆنی؟! چاکی؟! ئەویش ئەڵێت: ئەم شەو عەقڵم بەکارهێنا، زانیم ئەم خەڵکە گەوجن، ئەگەر من ژن بوومایە زۆر کەس هەبوو ئەیبردمەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام وادیارە پیاوم، خەڵکیش لە پیاو ئەترسێت.

* * *

## کێ ئەتوانێت ئەوەندە جوامێر و مرۆڤ بێت:

لەو مەریوانەدا مەلاییەکی گەنج هەبوو دڵی بە کچێکەوە ئەبێ زۆر و زۆریشی خۆش ئەوێت و گرفتاری دڵدار و ئەوینی یەك ئەبن لە رادەبەدەر مەلاکە مەشهور ناسراو ئەبێ لە مەلاچاکەکان، بەڵام لەو کاتەدا هەژار و دەسکورت ئەبێ کچیش وەسفی نایەتە گوفتار لە جوانی شەنگ و شۆخیدا بێ وێنە بووە، باوکیشی بەگزادە و دەس رۆیشتوو سەربەست ئەبێ ناوی خێزانیان بێ لەکەو شەرەفمەند بووە، رێزو ئیحترامی مەلای زۆر لابوو بەگزادە خانێکی ئەو ناوچەیە دەسەڵات دار و خاوەن بازوو بووە چاوی بەم کچە ئەکەوێ کە خزمی خۆیشێتی دڵی تێی ئەچێت و داوای ئەکات باوکیشی پێشکەشی ئەکات بێ گوێدانە دڵی کچەکەی و پرسیار پێ کردنی نەریتی ئەو خاناوادەیە تانەی گوێزنەوە مارەی نابڕن بە شەرعی بێگومان هەردووکیان لەو ماوەیەدا کە خەریکی تەدارەك و جیهاز و گوێزانەوەی ئەبن زۆر بێ ئارام و قەرار ئەبن، رێگای دەربازبوون شك نابەن و نایدۆزنەوە. کاتێ دێنە سەر گوێزانەوەی ئەیرازێننەوە بە گشت جۆرە خشڵی گرینگ و بەهادار بۆ خان دێن بە دوای مەلادا کە بچێت مارەی ببڕێت و ئیقراری لە دەم وەرگرێت ئەم خۆی ئەشارێتەوە لە داخا خۆی گوم ئەکات، هەرچەند ئەگەڕێن هیچ نییە پەکیان وەختە بکەوێت بیر ئەکەنەوە ئەم مەلایە شێواز منداڵ و هەرزە نییە ئەی چی لێهات؟! یەکێك دێتە بن دەست خانەوە عەرزی ئەکات: لام وایە دەس لە مەلا بشۆرن بە تەمای مەبن، ئەپرسێت بۆچی؟! وەڵامی ئەداتەوە ئەمە راستییەکەی ئەوەیە مەلا خۆی زۆر دڵی بەم دەستگیرانەی تۆوە بوو ئەی ویست بیخوازێت و داوای بکات چاوەڕوانی ئەوە بوو سەرمایەیەکی ببێ کە بتوانێ جهازو ماڵی بۆ بکات، بەڵام ئێستا چارەی نەماوە خۆی شاردۆتەوە. ئەم خانەیش دەماری مرۆڤایەتی و پیاوەتی لە ناخدا ئەجووڵێت، بانگی باوکی کچە ئەکات ئەڵێت داخوازیت لێ ئەکەم ئەم بووکی منە بدەیت بە مەلا بە گشت جهاز و حاڵ و باڵێکەوە کە بۆم داناوە هەر ئێستا ئەیبەین بۆ ماڵی مامۆستا لێی پیرۆز بێت کاتێك ئەبێت بە شایی و سەرلەنوێ ئاهەنگ و مەلا ئەدۆزنەوە لێی مارە ئەبڕن بە تەوازعەوە ئەیکەنە پەردەوە ئەم پیاوەتییە نابڕێتەوە.

* * *

خەپە شێت هەبوو لە دزەیی زۆر خۆشبوو بۆ هیچ وەلامێك دانەئەما دونیا بەهار بـوو، گـویٚ درێژ بەرەللاّ کرابوو لە گژ و گیاو پووش تێریان خواردبوو، نێرەکەر و جاشوولە بە ئـارەزوو یاریـان ئەکرد، قەپیان لە یەکتر ئەگرت، خەپە رووی کردە فەقێکان وتی: ئەوە کامیان منم؟! دێزەکـە یـا سپییەکە؟! پێیان وت دێزەکە تۆی، جا کە خەپە – دێزەکـە – قـەپی لـەویتر بگرتایـە ئـەی وت ئافەریم بەخوا خەپە ئازایە دەی ئاوای لیٚ بکە حەقی خۆیـەتی. کـە وەختـیٚ ئـەویتر گـازی لـەم بگرتایە، واتە سپییەکە لە دێزەکە پڕ بە دونیا هاواری ئەکرد: توخوا مەیەلّن خواردمی برا رۆ، برا رۆ، ملی بچریم خواردمی گیانم هاوار ئەکا ئەزیرێنیٚ لە کـۆلّمی بکەنـەوە، کـە دێزەکـە دوویـارە سەرئەکەوت ئەی وت ئافەریم حەقی خۆم ئەکەمەوە بەخوا ئەبیٚ گوێت لە بن دەربێـنم خـۆ دونیـا هەروا نابیٚ: هەی ئاغای دایکت بگێم خۆ ئێمە یەکمان خوارد بۆ بەرەللاّی کردووە دەنـگ ناکـات لە شەویشدا هاواری ئەکرد ئەی وت: ماندووم گیانم دێشیٚ ئەی هاوار لە خۆم کەر خواردمی ئێـوە جاش ئەتان خوات {دایکی فەقیٚ ئیبراهیم نوێژان ناکات}.

*　　*　　*

## مەلا عومەری شێت:

مەلا عومەری شێت هەبوو هەر وشەیەك گافی تێدا بوایـە قینـی پـیٚ هەلّئەسـا وەکـو: گـا، مانگا، مانگ، لنگ، سنگ.... تاد ئەی وت دایکە حەوا لە مەکر بـازی خۆیـدا ئـەم وشـانەی داتاشیوە بۆ باوکە گەورە ئادەم تا گـانی لـە بـیر نەچـێت و هەمیـشە چەشـی لیٚوەرگرێـت بۆیـە کچەکانیش بەم مەکرە سەودا گەرن هەر چاویان لێیە.

| | |
|---|---|
| چاری غەزیرە هی نێر بۆ مێیە | تا رادەیەکیش ئەمە بەجێیە |
| بەلاّم ئێستاکە نێر بە نێر فێرە | قاش و دەسپەری مێینگە کێرە |
| ئاخر زەمانە سروشت گۆڕاوە | کوڕ بە کچ ئەبیٚ هەر ژن خۆی پیاوە |

*　　*　　*

## ئەفەندی حەسەن دەروێش:

پیاوێك هەبوو ناوی حەسەن دەروێش بوو، بۆ وەلاّم هەرگیز دانەماوە، جارێکیان بـەزۆر ئـەیان بەن بۆ دەنگدان بۆ (سالح جبر) (موسی بن سدر) گوایە (بنی صدر) شیعە بووە نەئەبوو ئەم دەنگی خۆی بدۆڕێنیٚ بۆ جەعفەری و شیعە و باری رامیاریِ ئەو کاتە ئـەمیان مەبەسـت بـووە دەرچـێت سەرزنشتی ئەکەن ئەویش لەوەلاّمدا ئەلّێت:

که بەرز و نزمی بووبێ بە نۆرە

ناقوس خراپترە لە بەردە مۆرە

کابتەنێکی ئینگلیز لێی ئەپرسێت: ئایا مسی یا مسافری موسوڵمانی یا کافری؟ ئەویش ئەڵێت: بە پێ مسم بە خەیاڵ مسافرم، بە دڵ موسوڵمانم بە نەفس کافرم.

* * *

## مام محمود هەبوو وەلامی لە جێگەی خۆی دابوو:

جارێکیان ئەچێتە کەرکوك، لە پیاوێکی بەگی تورکمان میوان ئەبێ ئەم بەگەیش زۆر حەزی لە قسەی خۆش و میوان و حەق بووە، ئەم بەگە دیوەخانی ئەبێ لە بەیانی تا شەو هەر زەمی کورد ئەکەن هەر بەسەر و گوێلاکی کوردا دێن ئەمیش هیچ دەنگ ناکات، لێی ئەپرسن قسەیەك بکە وانییە؟! ئەویش ئەڵێ خەڵکمان لێ دڵگیر ئەبێ!! ئەوانیش ئەڵێن ئیشتە جانم قسەیەك بیکە ئێمە توورە نابین لە خۆت. ئەویش ئەڵێت: پیرەژنێکی نەنکم هەبوو، بۆی ئەگێڕامەوە وتی کە عەقڵ بەشکرا لە نێوان کورد و عەرەب و تورك، دایان بە عەرەب بەشە عەقڵەکەی خۆی خستە ژێر زووبانی کە وتی:

{أعوذ بالله من الشيطان الرحيم} ئیتر لێی مەترسە کە دایان بە کورد بەشەکەی خۆی خستە پشت گوێی ژێر کلاوەکەی بۆیە هەر شتێك بڵێ یا بیکات، پێشەکی دەس بۆ پشت ئەبات، پرسی پێ ئەکات، بەلاَم کە دایان بە تورکمان نەیزانی چی لێ بکات بردییەوە بۆ ماڵەوە، دایە دەستی ژنەکەی، جا هەر ئیشێك یان شتێك ببێ ناتوانێ رای خۆی دەربڕێت تا خانم رێی بۆ نەکێشێت نایکات بگرە پیاو کوشتنیش هەر بە خانم حەل ئەکرێت، جا دانیشتوان هەر بە یەکیانا رووانی هەندێکیش دڵگیربوون، خانە خوێی خاوەن دیوەخان وتی جانم ئیشتە راست دەیکات ئێمە ئیشمان وا لە دەس ژنەکانماندایە.

* * *

لەو هەورامانە دێیەك هەیە پێی ئەڵێن دێلی، لەکاتی خۆی خێڵ گەرمیان و کوێستانی ئەکرد، خاڵۆی کۆماسی دۆستی مەولەوی ئەبێت خێڵەکەیان لە دێلێ ئەبەزێت، جەنابی مەولەوی ئەم شیعرەی بۆ ئەنووسێت:

گەر حەپەی گەماڵ و کوردە ماڵ بێڵێ

لەززەت ئەوینی خاڵۆ لە دێڵێ

ئەویش بەم شیعرە وەڵامی ئەداتەوە:

ماڵمان باری کرد ئەو بەری ماڵەکان

دێڵێمان جێهێشت بۆ گەماڵەکان

* * *

## تەڵاق کەوتووە!!

کابرایەك ژنێکی جوانی ئەبێ لەفزی تەڵاقی بە دەمیا دێت، ئەچێتە لای مەلا باسی بۆ ئەکاو پرسی پێ ئەکات مەلایش پێی ئەڵێ تەلاقت کەوتووە کابرا ئەڵێ چارم چییە؟! عیلاجێکم بکە! ئەڵێت هیچ چارت نییە هەر تکای لێ ئەکات و ئەیلێتەوە، ئەڵێ بچۆ بۆلای قازی، ئەو ئەتوانێ چارت بکات ئەویش ئەڵێ قوربان هەر ئەو گووە ئەخوات کە جەنابت خواردی.

* * *

## پرسیاری بەزین لە شێخ رەزا!

جارێك برادەرێکی شێخ رەزا ئەپرسێت ئایا ناحەزەکانت هیچ تۆیان بەزاندووە؟! وتی بەڵێ ئێستایش هەر ئازارم ئەدات جارێکیان مەحمود پادشای جاف ناردی بە دواما کە بچم بۆ لای کاتێ گەیشتمە ئەوێ کابرایەکی دەستە پیاوی دانابوو لای خۆی دانیشتبوون پێیان ئەوت حەمەی ئەوزا گوایە ئەمە زۆر شاعیرە، منیش گێچەڵم پێ کرد یەکدوو شیعر و توانجم تێگرت ئەویش لەسەرخۆ وتی شێخ رەزا وسبە:

هەی کەم لە زوورنا بکوتمە ژێرت

وەك چەقەنەی ئاش هەڵپەرێ کێرت

* * *

## هەم بەرانە هەم نێرییە!!

میرێکی زۆرداری ستەم کار هەبوو، لە خوانەترسا، ویژدانی نەبوو، وەکو گشت دەسدارەکانی تر، هیچ کۆیشی لەگەڵ و دانیشتووی وڵات نەئەکرد، چاکو خەراپی دەم کوت کردبوو بە داپڵۆسینی کوێرانە و ستەمکردنی گشت دەنگێکی بێزاری و هوشیار کردنەوە ورەتاندنی خەڵك و هەڵواسین و

گیراوخانه لەسەرانسەری ولاتا. ئاگاداریـان کـردەوە کـە دارایـی و بۆجـەی ولات خەریکـە خـالّی و پووچەڵ ئەبیّ، هیچی تیانەماوە، قەوارەی رژێم و دەستەلاتداری بەرەو رووخان ئەچێت، ئەگەر هـەروا بڕوات میری ولات فەرمان ئەدات: نێرییێکو بەرانێکی بۆ بێنی دایان ببەستیّ لـە ژوورێکـدا. بـانگی مەلاو ئاغا و شێخ و قەشەی کرد لێیانی پرسی؟! دەستی درێژ کرد بۆتەگەکە وتی ئەمە بەرانـە یـان تەگەیە وتیان تەگەیە، وتی ئاغا چییە؟! وتی تەگەیە وتی گاڵتە بە بـەرانی پادشـا ئەکـەن؟! ئەمـە بەرانە ئەبیّ ئەوەندە.......... پارە بدەن جەزای درۆکەتان، وتی یا شێخ چـییە؟! وتـی نـازانم وتـی ئەوەندە گەوجی ئەبیّ ئەوەندە... بدەی جەریمە بکرێیت وتی مەلا چـییە؟! وتـی بەرانـە وتـی ئەمـە تەگەکەیە یان بەرانە؟! چۆن خۆت بەنەزان ئەکەی؟ تۆلای خۆت مەلای، ئەبیّ ئەوەندە... پارە بـدەی راست ناکەیت و شەرع ئەگۆڕیت، وتی جەنابی قەشە ئەمە چییە؟! وتی قوربان ئەگەر بەران بێت سی هەزار هەڵ ئەگرێت ئەگەر تەگە بێت؟! سی و پێنج سەد ئەهێنیّ، ئەگەر هەردووکیان بێت ئەوا چوار هەزار هەڵ ئەگرێت، بەلاّم من لام وایە بە پێنج هـەزار هـەڵ ئەسـەنگێنیت، فـەرموون: ئـەك دوو، سیّ... تاد تا پێنج هەزار لێیان پرسی چۆنت وا هەڵ سەنگاندوو؟! خۆت رزگار کرد وتی لە دارکـاری کردنی ئەوان فێری نرخاندنی بووم بە سەمەلات هەم نێرییە هەم بەرانە.

* * *

## بریارێکی پڕ لە دادا!!

ئەگێڕنەوە کابرایەك ئەچـێتە لای جوولەکەیـەك داوای هەنـدێك پـارەی لیّ ئـەکات بیکـات بـە کشتوکاڵ بەشەریکی، بەهەر فرت و فێڵێك ئەبیّ جووە لە خشتە ئەبات، کۆتایی ساڵ دێت چاوی بـە شەریکەکەی ئەکەوێت ئەڵێت بۆچی دیار نەبووی؟! هیچت بـۆ نـەهێنام قـەرز و پارەکـەم کـەی بـۆ دێنیتەوە؟! ئەویش ئەڵێت مام ئیسحاق ئەمساڵ نەهاتبوو هیچم دەسنەکەوت، ئەوەنـدەی تـر پـارەم بدەریّ ئەمساڵیش لە کشتوکاڵدا خەرجی ئەکەم، بەڵکو بتوانم لـە سـاڵی داهـاتوو ئەویتریـشت بـۆ عەوێزە بکەمەوە و لە قەرزەکەت رزگارم ببـیّ، بێگومـان ئەویتریـشی خـواردووە ئەیـەویّ ئـەمیش بقرمێنیّ وتی نایدەم، پارەی خۆم ئەوێت، شکاتت لیّ ئەکەم لای حاکم، حاکم زۆر ناوازە بوو لـە بـیّ دادی و ستەمکاریدا، کابرای موسوڵمان راپێچ ئەکات لەگەڵ خۆیدا بـۆ دادگـای ئـەبات، لـە رێگـا ئەڕۆیشتن پیاوێك ماینێکی لە دەس بەربوو بوو بۆی نەئەگیرا هاواری کرد فریام کـەون بـۆم بگرنـەوە هەرچۆنێك بێت کابرای موسوڵمان پێشی ئەگرێت بۆی ناگیرێت بەردێکی تیّ ئەسرەوێنیّ بـەر چـاوی ئەکەوێت کوێری ئەکات، کابرای خاوەن ماین ئەیکا بە هەراو سمڕ ئەیکوژم کابرای جـووە وتـی نـابیّ

بیکوژیت، تۆیش وەرە لەگەڵ مندا شکاتی خۆت لە دادگادا بکە کەوتە گەڵیان، کابرا لە دڵی خۆیدا وتی ئەگەر لە جوولەکە رزگارم بێت، لە چاو کوێرکردنی ماینی ئەم رزگارم نابێ وا چاکە راکەم لە دەسیان هەڵات و خۆی کرد بە ناو دێدا کۆڵانە و کۆڵان کاتێ لەسەر بانێکەوە بازیدا کەوت بەسەر کابرایەکی پیری نەخۆش کەوتوو گیانی دەرچوو دەسبەجێ کەس و کاری مرد و توند گرتیان، ویستیان بیکوژن جوولەکە نەیهێشت وتی: پارەکەی من و حەقی ئەم پیاوە ماین کوێر کراوە تیا ئەچێت مـن ئەو کاتە شکات لە ئێوە ئەکەم بۆ پارەکەم، ئێوەش وەرن بۆ دادگا حەقی خوێنی باوکتان داوا بکەن، ئەوانیش رۆیشتن لە رێگا دایان بەلای دێیەکدا هەر بیری کردەوە لە دەستیان راکات چونکە سەری تیا ئەچێت خۆی کرد بە دێیەکەدا لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ لە ترسا بە پرتاو بۆ ژنێك دوو گیان لەبەر دەرگا راناوەستێ لەترسا ئەیەوێ دەرگاکە پێوە بدات ئەمیش خۆی ئەماڵێ بە قاپییەکەداو ئەیماڵێ بەسکی ژنە دووگیانەکەدا، دەسبەجێ بەراویتە ئەبێ و سکی لەبار ئەچێ ئەیگرنەوە دیسان ئەویش ئەکەوتە تەکیان لە رێگا ئەڕۆن تووشی کابرایەك دێن کەرەکەی بە بارەوە لە قوڕا چەقیوە بە تۆزی گشتیان زۆری لێ ئەکەن لەگەڵیا دەریبێنێ ئەچێت: لە داخی دەردی گرانی خۆی پەلاماری ئەدات و کلکی ئەگرێت و رای ئەکێشێت بە توندی کلکی کەرەکە ئەپچرێت بەدەستییەوە خاوەن گوێدرێژ ئەیکات بە قیرە قیرو بۆڵە بۆڵ گشتیان پێی ئەڵێن: تۆیش وەرە بۆ دادگا لای حاکم شکاتی خۆت بکە ئەڕۆن بەیانی زوو ئەبێ ئەیکەن بە دادگدا ئەمیش لە تاو دەردو خەفەتی خۆی بە پرتاو خۆی ئەکا بە دادگادا و بە ژووری خودی خۆی بێ پرس و لە دەرگادان کاتێك ئەبینێ فەراشەکەی کوڕێکی جوان وا بەسەر حاکمەوە وان لە بیرێکی ناشیریندا ئەمیش ئەکشێتە دواوە حاکم خۆی کۆ ئەکاتەوە ئەڵێ، کابرا چیتە؟! ئەڵێ قوربان هێنراوم بۆ دادپەروەری، بەناچاری و بە زۆر کراوم بە ژووردا. حاکم بانگی جوولەکە ئەکات و پێی ئەڵێت: ئەم هەژارە راست ئەکات یا ئەبێ پارەی بدەیتێ تا بتوانێ کشتوکاڵی پێ بکات و پارەکەت بداتەوە، ئەگینا زیانی لە دەستی تۆ کردووە چۆنی بداتەوە؟! جووەیش ئەڵێ نایدەم ئەڵێ کەوابوو ئیهانەی مەحکەمە ئەکەیت ئەم پیاوەت لەکار و کەسابەت کردووە ئەبێ (١٠٠) دیناری بدەیتێ ئادەی هەر ئێستە بانگی ماین کوێر ئەکا لێی ئەپرسێت؟! باشە تۆ لەسەر حەقی بەڵام ئەم رابکات و تۆیش بەردێك هەڵگریت بیمالچی بەو چاوەیدا وەکو ماینەکە کوێری بکەی و ئەگەر لێی نەکەوت، یان بەر سەری، یان لەشی، یان چاوەکەی تری کەوت ئەبێ چاوت دەربێنی هەر چەند هاوار ئەکا تۆڵەم ناوێت جا حاکم ئەڵێت (٥٠) دیناری بدەرێ ئادەی بانگی باوك کوژراو ئەکا ئەڵێ تۆیش حەقتە ئەبێ ئەم پیاوە راکشێت لە جێگەکەی باوکتان، تۆیش لەوێوە رابکەی و باز بدەی و ئەبێ بێ کەم و کورت بکەویتە سەر ئەو جێگەیە کە باوکتی پێ مردووە ئەگەر نەیکوژیت یان بەر

جێگایێ تری بکەوێ یەك هەزار دینارت لێ ئەسێنم جا هەرچەند هاوار ئەکات خوێنی باوکم ناوێت (١٠٠) دیناریش لەو ئەسێنێ بۆی کابرای ژن بەراوێتە کراو بانگ ئەکات لێی ئەپرسێت حاکم ئەمر ئەکات ژنەکەی بداتێ تا شەش مانگ لای بێت تا سکی پڕ ئەبێتەوە بۆی بنێرێتەوە ئەگەر سکیشی پڕ نەبوو ئەبێ هەزار دیناری بداتێ هەرچەند هاوار ئەکات (١٠٠) دیناریش لەو وەرئەگرن بۆی کابرای کەر کلك بڕاو بانگ ئەکات و لێی ئەپرسێت ئەویش ئەڵێت قوربان من هیچ داوایەکم نییە لەم پیاوە هەر بۆ ئەوە هاتووم کە فێر ببم و بزانم دادپەروەری چۆن ئەکرێت؟ چونکە لە راستیدا ئەم گوێدرێژەم لە دزای بەرماڵی خۆمانە شهادەت ئەدەم کە هەر لە دایك بوو کلکی نەبوو وەکو ئێستای خۆی وابوو من بوختانی ناحەق چۆن ئەکەم جا هەموو پارەکانی دایە دەستی وتی بڕۆ حیز باب هەرچیت دیوە نەیگێڕیتەوە تەنها مەحکەمەی دادکوستەری نەبێ!

* * *

## مەلایشە و زوڕنا ژەنە

دوو برادەری خۆشەویستی یەك ئەبن پێکەوە فەقێیەتی و خوێندن تەواو ئەکەن و مەلای چاك ئەبن و پێکەوەش بڕوانامەی مەلایەتی وەرئەگرن هەر یەکەیان ژن دێنێ و ئەبێ بە مەلا لە دێیەکدا ئیتر یەکتر نابیننەوە تا چەند ساڵێك یەکێکیان باری ژیانی زۆر سازو گونجاو ئەبێ و ئەویتریان بە پێچەوانەوە مەلای بار ساز بار ئەکات بۆ دەوروبەری ئەمیتریان دێت بە خەیاڵیا کە بچێت بۆ دیدەنی هاورێکەی خۆیو دوو فەقێ ئەچن مەلا ژن زۆر بە ماریفەت بەخێرهاتنیان ئەکات ئەمانیش ئەپرسن کوا مامۆستا؟! ئەڵێت رۆیشتووە بۆ ئەو دێیە هەر ئێستە دێتەوە فەرموون دانیشن زۆر ناخاینێ مەلا دێتەوە خۆشحاڵی دەرئەبڕێت پریاسکە بزگورێك ئەداتە دەس مەلا ژن لێی ئەپرسن لە کوێ بوویت؟! وەلاّم ئەداتەوە چووم بۆ ئەو دێیە ژنم بۆ مارە بڕین زوڕناژەنیشیان نەبوو ناچار زوڕنایشم بۆیان ژەند و بەسترابوو دوعایشم بۆ کرد تا خەلیفە داخڵی بەغداد بوو، وا ئێستە هاتمەوە ئەوانیش ئەڵێن کوڕە وا نەڵێیت؟! ئەویش ئەڵێت: باوکم بەخوا بەدەم مەلایەتییەوە زوڕنا ئەژەنم ئیدارە ناکەم ئەی چیبکەم؟! کە مەلا ژن بانگ ئەکەن پریاسکە ئەکەنەوە زوونایەکی تێدایە هیچ چاوشێك نییەتی. مەلای زوڕنا بێژ ئەڵێت: کە عیلم و دین بایەخی نەما ئێمە ئەبێ یا زورنا ژەن بین یا جادووگەر یا لە دیوەخانی بەگدا هەر بڵێین (أشهد بالله) راست ئەفەرموویت لە کوفری نەمردوو چاو بپۆشین، سزای دۆزەخ بنۆشین.

* * *

## ماتەمینی مامۆستایەکی قوتابخانە بۆ نەناسراوێك!!

ئەگێڕنەوە مامۆستایەکی قوتابخانە زوو هەبووە لەوانەدا سەرکەوتوو بووە سروشت و شێوازو ڕەفتاری تایبەتی هەبووە خۆی ئەچوو لـە خـەڵکی ئەپرسـی: ئێـوە چ خەوشـێك لـەمن بـەدی ئەکەن؟! و بۆچی ئەڵێن زۆربەی مامۆستایان دەبەنگ و کەودەنن؟! دۆستەکانی ئەیان وت ڕاست نییە بوختانە، چەند ڕۆژێك بەرچاوی دۆستێکی ناکەوێ و نابینێ ئەچێت هەواڵی ئەپرسێت پێی ئەڵێن: لە ماڵەوەیە لە ماتەمینی پرسـەدایە مـردووی لێ مـردووە، ئـەمیش ئەچـێت بـۆ لای مەرحەبا خوا پاداشتی خێرتان بداتەوە (الفاتحە)..... ئەمجا برا نەئەبوو ئاگـادارت بکردمایـە؟! لەم کۆستە ناوادەدا ئەمە کێ بوو؟ بەرەحمەتی خوا شاد بوو باوکتە نەء؟ دایکتە نەء؟خوشکتە نەء؟ براتانە نەء؟ خێزانتە نەء؟، ئەی گوایە کێیە؟! پێم بڵێ واللە برا گیان دۆستێکمە لێرەیە؟! نەء: لە دڵی خۆمدا گرتوومەو ناوم لێ ناوە، وا دێتە دڵم مردووە ئەمیش ڕووی تێکردوو گوتی: زۆر ڕاستە مامۆستایان لە (٢٥٪) یان بێ عـەقڵ و گەوجن، ئەگینا ئەمە قسەیە هەی کەودەنی گەوج و نەزان.

* * *

## جنێوبازی لە نێوان دوو کەسی خوێنەواردا.

## زانایەك و نـەزانێك:

زانا بەویتری وت (علی) ناو بوو ژاوە ژاوت لابە لاچۆ لەبەر چاوم، بەدوانی وەکو تـۆ ئـەمجا کەرێکی تیا ئەبێ (علی) تۆ نیوە کەرێکی، واتە: علی بە حیسابی أبجد ئەکاتە (١١٠) ئەمەی مەبەست بوو ئەویش کەفی ئەچەند تۆ خۆت کەری تووڕە بوو بوو چۆن من نیوە کەرێکم هەیـە کەری تەواوی نەفام.

* * *

## کاشکی لە ژێرەوە بوایە نەتریبایە:

کابرایەك لە دەشتێکی چۆڵا ڕاکشابوو نووسـتبوو ڕێگرێکـی مەشـهوری پاڵـەوان ئەگـەڕێ خەڵك ڕووتکاتەوە تووشی ئەم ئەبێ خۆی ئەدا بە سەریا و ئەڵێ: هەی بەدبەخت ڕووت بەرەوە، تەسلیم بە چیت پێیە بیدە دەستم؟!

ئەویش پیرۆزت بێ باشە دەست ئەبات هەردوو دەست و پەنجەی لە ژێرەوە بـۆ سـەرەوە تێك ئەپەرێنێ توند ئەیگوشێ وردە وردە کابرای پاڵەوان لەسـەرەوە لـە تاوانـا ئـەترێت

ئەمەی ژێرەوە وتی ها برا! تۆ وایت لەسەرەوە کەچی ترِ راگیر ناکەیت؟! وتی کاشکی لە ژێرەوە بوومایە بەلاّم نەترِمایە.

* * *

لە حوجرەی فەقێکان دانیشتبووین گالّتە و گەپ دەستی پیّ کرد هەریەکەیان فیّلیّکی لە شەیتان کردبوو یەکێکیان وتی وا فلاّن کەس هات ئەیکەمە گریان پیاوە، تەمەنی (٢٥) سالاّنە باوکی مندالاّنە هات دانیشت و سەلامی کرد. وتی ئەریّ کابرا بۆچی ئەگریت؟ چیت لیّ قەوماوە کیّ زولّمی لیّ کردوویت؟ راست برِۆ؟ بۆچی ئەگریت براینە تەماشاکەن وا ئاو بە چاویا دیّتە خوارەوە؟ ئەوە نییە؟!

چەند جارێك وای وت: کابار گریاو ئاو بە چاویا ئەهاتە خوارەوە توورِە بوو هەلّسا گوتی گشتتان سەگو فیّلّبازن خۆمنیان کردە گریان.

* * *

**یاسای جازیبە درۆیە!!**

پیاوێکی زۆر زەبەلاح هاتە حوجرە رایان کێشا وتیان چرچ لە خۆت ببرِە هەناسە بگرە تا ئەتوانی یان زۆر کز و بێدەنگ بیت، سووك وابزانە مردوویت، دوو کەس هاتنە ئەم بەرو ئەو بەری لای شانییەوە سەرو دوو پەنجەیان خستە ژێر ناو شانی دوانیتریش لای سمت و کلّۆکی سەرو پەنجەیان خستە ژێری ئەمەی لای راستی بەبیّ دەنگ دەمی خستە بن گوێی بەرانبەرکەی وتی: ئەم خەبەرە چ خەبەرە، خەبەری شای ئەجندانە مردوویەکمان لیّ مردووە لە مردووانە نیوەی لە ئێمە و نیوەی لە شای ئەجندانە هەلّی بگرن بە چوار دەستانە ئەی بەین بۆ سەر قەبرانە فیکە پێکرِا فیکەیەك لیّ ئەدەن هەلّی ئەگرن.

جۆرێکی تر: پیاوێك مردووە لەم ناوە ئەمیش بەوی لای خۆی ئەوت: پیاوێك مردووە لەم ناوە ئەویش بەوی یەکەمی ئەوتەوە.

دیسان: ئەمە تەرمی شای ئەجندانە، دەورەیان پیّ کردەوە، وتی بانگ بکەن لەو جنۆکانە دووبارە دەورەی پێکرایەوە تا گەیشتەوە یەکەم وتی یەکجار درەنگمانە دەوریان پیّ کردەوە وتی با هەلّی بگرن بۆ گۆرستانە، دەوریان پیّ کردەوە دیسان: با نەزانن ئەو خەلّکانە دەوریان پیّ کردەوە دیسان وتی: بە دزیوە ئەینیێژن، دەوری پیّ کرایەوە هەلّی ئەگرین بەکەس نابیّژین، دەوری پیّ کریاوە فیکەییێکی کرد ئەوانیش فیکەیان کردەوە بۆیان سەندەوە بە ئەسپایی

هەڵیان گرت ئەتوت پووشە بردیان بۆ بەردەرگای حەوشەکە، هەر چواریان بێ یارمەتی کەسیتر، واتە بە (٨) پەنجە.

* * *

## بە ئارەزووی خۆت چ لە پاش و چ لە پێش!

مەولەوی فەقێ ئەبێ لە شاری سنەی کوردستان ئەخوێنێ وەکو پیاوێکی دەوڵەمەندی بازرگانی ناسراوی ئەو رۆژەیش لەگەڵیا فەقێ ئەبێ پێکەوە ئەخوێنن، بێگومان عبدالرحیم مەولەوی هەژار و دەستکورت ئەبێ کەوایشی لەبەر نابێ کە زستان بیپۆشێ و گەرمی کاتەوە، ئەم کورە مەولەوی زۆر خۆش ئەوێ بە باوکی ئەڵێت: بابە ئەمجارە کە چوویت بۆ تەهران و ماڵی بازرگانیت هێنا پشتە کەوایێکیش بێنە بۆ (فەقێ عبدالرحیم) ی هاوڕێم، چونکە هەژارە و نییەتی پاش ماوەیەك بۆی دێنێ و مەولەوی بانگ ئەکەنە ماڵەوە پارچە قوماشەکەی نیشان ئەدەن لای پەسند ئەبێ دایکی کوڕەکە پێی ئەڵێت: منیش بەری پێوە ئەنێم و بۆت ئەدوورم بەڵێ بە دووراوی و ئامادەکراوی ئەیدەنە دەستی و ئەیکاتە بەری، رۆژێك ئەچنە دەرەوەی شار بۆ سەیران و تۆپێن و کەوشەك کردن کوڕەکە ئەبینێ زۆر جوانە لەبەریا بۆ شۆخی و توانج ئاسا بە مەولەوی ئەڵێت: ئەمجارە منیش لە پشتی ئەم کەوایە یەکێك ئەکەم، ئەویش خێرا وەڵامی ئەداتەوە: چیتی هی باوکتەو بەریشی هی دایکتە تۆیش ئارەزووی خۆتە لە پاشی ئەکەیت یا لە پێش (لە پشی ئەکەیت یا لەبەری کەیفی خۆتە).

* * *

مەحمود پاشای جاف ئەچێتە تاران لەوێ ددان بۆ خۆی دروستئەکات، دێتەوە پیاوێکی گەوجی ئەبێ و ئەپرسێ قوربان: ئەو ددانە گوێزی پێ ئەخورێت؟! ئەڵێ نەء ئەڵێ کەشکی پێ ئەخورێت ئەڵێ نەء، ئەی قەزوان ئەڵێ نەء ئەڵێ ساگوی سەگی تێ بێت بەکەڵکی چی دێت؟!

* * *

## هەر هەمان پیاوی مەحمود پاشای جاف:

هەمیشە شەڕی ئەبێ لەگەڵ ژنەکەی، پادشا ئاشتیان ئەکاتەوە و گشت جارێك، ئەمجارە ئەبێتە شەڕیان پادشا بانگی ژنەکەیشی ئەکات ئەڵێت بۆ بەقسەی مێردەکەت ناکەیت؟ ئەڵێت قووربان نازیشی ئەکێشم ئەڵێت رەنگە شەو نەچیتە پاڵی بۆیە ئەم پیاوە شێت بووە، کابرا

ئەڵێت قوروبان خوا بیوڕێت ئەو گانەی ئەم بە منی ئەدات تۆ بە سەیە کوڵی نادەیت ئەویش پێ ئەکەنێ و ئاشتیان ئەکاتەوە...

* * *

## لە نێوان مەلا ئەبوبەکری باقلانی و پاپادا:

مەلا ئەبوبەکری پاقلانی کورد ئەبێ و خەڵکی باقلان ئەبێ، پایەیەکی بەرزی هەیە لە زانیاری و وەڵامی دەست و برد، هەر وایش بەڕێز بوو لەلای خەلیفەی وەخت و جێگایێکی دیاری ئەبێ و زۆریش ئەینێرن وەکو نوێنەر بۆ وتوویژ بۆ حکوومەتەکانی دراوسێ، بەتایبەتی بەرپرسیار ئەبێ لە وەڵامدانەوەی گیروگرفتی ئایینی و مەزهەبی ... جارێك سەلیبیەکان: واتە خاچ پەرستەکانی مەسیحی داوای زانایەکی ئایینی ئەکەن لەسەر خواستی پاپا، بۆ ئەوەی پاپا لەگەڵیا بدوێت و ئەمیش لە باتی حکوومەتی ئیسلام وەڵام بداتەوە، پاپایش زۆری خوێندبووەوە، وە زۆر سەرچاوەی پشکنی بوو لە دڵی خۆیدا ئەڵێت بە سەریا زاڵ ئەبم، و ئایینی ئیسلامی پێ پووچەڵ ئەکەمەوە وە ئیتر رزگاری یەکجاری ئەبێ لە کوشتن و برین و ناچار ئەبێ ئایینی مەسیح بەراست بزانێ، ئەمانیش مەلا: قازی ئەبوبەکری باقلانی هەڵ ئەبژێرن و ئەینێرن ئەمیش کە ئەگاتە ئەوێ لە باتی سەلام کردن ئەڵێت (حیاکم الله علی حق والخیر)، واتە خوا بتان هێڵێ لەسەر خێر و حەق سروشتییە ڕێزی ئەگرن، چونکە نومایندەی، و نوێنەری خەلیفەی ئیسلامە پاشان روو ئەکاتە پاپاو ئەڵێت چۆنی چاکی؟! ژنەکەت چۆنە؟ ئەویش پێ ئەکەنێ و ئەڵێ: گوایە ئیسلام نازانێ ئێمە و مانان ژنمان نییە؟! وەڵام ئەداتەوە: هەڵبەت خۆتان بەخوا ئەوانن (ولم یلد ولم یولد...) یان کچ و ژنی مەسیحییەکان بۆ ئێوە منت و خۆراییە؟! ئێوە پرسیارتان لەسەر نییە؟! بێشك خواو فریشتە نین ئادەمیزادن و ئەبێ ئادەمیزاد لە خۆرسکا سروشتی بێ وەکو مرۆڤ، مرۆڤ بێت.

جا پاپا وتی: قورئان بێژە و کەلامی خوایە وا ئەزانن، بەڵام پێغەمبەرەکەتان رازی نییە باسی ژنەکەی بکرێت خۆشیان پێ نەئەوت؟! من ئەگەر ژنیشم ببوایە چۆن باسی ژنی من ئەبێ بکرێت لە دانیشتنێکی وادا؟! ئایا شوورەیی نییە؟! باقەلانی وتی راستە وەکو ئەفەرموون، بەڵام قورئان باسی دوو ئافرەتی پیرۆزی بۆ کردووین کە ئێمە لامان وایە قورئان هەردووکیانی لە تهمەو بوختان پاك کردووەتەوە، بە هیچ جۆرێك لەکەدارنین، یەکێکیان عائشەی (رض) هاوسەری پێغەمبەری ئێمەیە ئەویتریان حەزرەتی مەریەمەیە دایکی عیسای پێغەمبەری

ئێوەیە بەلاّم خێزانی پێغەمبەرەکەی ئێمە هاتەوە هیچی لەگەڵ خۆیدا نەهێنایەوە، بەلاّم حەزرەتی مەریەمە کۆرپەیەکی بە باوەشەوە بوو ولاشمان وایە پێغەمبەرێکی بێ گەردە.

* * *

## لەبەر حەیاو نامووس خۆی حەیایی چوو:

لە ئافرەتێکی سۆزانیان پرسی تۆ بۆچی وابێ حەیاو نامووس بوویت؟! وتی لەبەر پاراستنی شەرەف و ناموسی خۆم لەبەر حەیای خۆم، چونکە هەر کەسێك هات دەستێکی بۆ هێنام نەمکرد بەهەراو قیژە قیژ تا حەیام نەچێت و ناوم نەزرێت و کەس پێم نەزانێ تا گەیشتم بەم حاڵە و بووم بە پەند حەیام چوو.

* * *

ئەم شیعرەی خوارەوە بۆ حەمەی ئەولاّ ئەخوێننەوە:

لیت الشباب یعود یوماً فأخبره بما فعل المشیب

واتاکەیشی بۆ شی ئەکەنەوە ئەویش هەر دەستبەجێ ئەڵێ منیش وتوومە بە کوردی:

کاشکی لاوێتیم ئەهاتە دواوە

گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

* * *

## حەسەنە فەندی شاعیر:

پیاوێك هەبوو لە سلێمانی ئەژیا ناوی حەسەنە فەندی بوو زۆر خۆی بە شاعیر ئەزانی گلەیی لەو خەڵکە ئەوەبوو کە رێز و بایەخ بە شعیرەکانی نادەن ئەمیش نموونەی شیعرێکیێتی:

جەنابی خطیب شێخ محمد أفندی تۆ خاوەنی عیلم و ئەدەبی

خاوەنی وەکانی رێز و حەیایە بۆیە هەرچی ئەڵێم وایە

تۆ هەر خۆت ئەدەبی یا خوا هەر ببی

لێمان پرسی ئەم شیعرە لەسەر کام کێش و سەرەوایە؟! وتی شیعر و شیعری سوورە، لەبەحری پانە، زۆر رێکو جوانە بە بست ئەمان پێوا خاڵی بوو لە کێش و مەعناو سەرەوا.

ئەیوت خەڵك ئەبێ بۆ خۆی مەعنای بۆ دانێ من هەر شیعرەکە دائەنێم، کەڵە شاعیرەکانی کۆنی بە شاعیر نەزانی داوایشی لە شاعیرەکان ئەکرد بۆی بکەین بە پێنج خشتەکی!!

* * *

مامۆستا مەلا (محمد امین) شێت هەبوو، لە خانەقای مەولانا ژیانی بردە سەر ژنێکی هێناو تەلاقیدا کە کۆڕی دانیشتن ببوایە باسی ژن بکرایە ئەی وت: قوربان بۆچی ژنەکەی من ناخوازن بەخوا ژنێکی زۆر چاکە، ئەو ژنی منە بێ عەیبە.

* * *

جارێکی کۆڕێکی مەلاکان یەك ئەگرن باسی ژن ئەکەن چۆن و بە چ زەحمەتێك منداڵی لێ ئەبێتەوە، یەکێکیان مەلاییێکی چاك ئەبێ ئەڵێت هەرچی ئەفەرموون وایە، بەلاّم لە کاتی بووندا فریشتەیەکی خوا دێت وەکو پوزو ئەیرەوێنێتەوە و پاش بوونیشی دیسان دێت گورجی ئەکاتەوە تەنگ ئەبێت، وێك دێتەوە یەکێکیان کە زۆر قسە خۆش بوو وتی بەسەری ئێوە لەوەتی فلاّن منداڵمان بوو هەر یەکەجار ماڵی ئێمەی دیوە تا ئێستا بۆ دووەم جار نەهاتووەتەوە.

* * *

گوایە تەیووری لەنگ نومایشگایکی ساڵانەی بووە گشت ساڵێك شتی ناوازەی تیا پیشان دراوە، هەر چینێك هی خۆی هاوردووە خەلاّتی پێ وەرگرتووە مەلایش ئەڵێ قوربان منیش هەنجیری باشم بۆت حازر کردووە نۆبەرەیەتی تازەگەیشتووە لە ئەو رۆژا جەنابت تاسووقە بیخوات، ئەویش ئەڵێت مامۆستا: ئێستا پێ ناگات هاوین ئەبێ؟! ئەڵێت تۆ حەقت چییە؟! ئەچێت ئەیپێچێتەوە لە قەرتاڵەیەکدا: بەرچنە تەیووریش پیاوێك ئەنێرێت هەنجیرە خووساوەکەی بدزن و لە باتی ئەوە کەروێشکێك بخەنە ناو بەرچنەکە و دای پۆشنەوە کە ئەتاسێت رۆژی دیاری کراو گشت ئەچنە گۆرەیانی پیشاندان هەر کەسێك شتی خۆی ئەنوێنێ سەرە دێتە سەر مامۆستای ناوبراو کە بەرچنەکە سەر هەڵ ئەداتەوە کەروێشکێك ئەپەڕێت و عالەم ئەشلەژێنێ و ئەبێ بە پێکەنین مەلایش هیچ تێك ناچێت و ئەڵێت: قوربان (حەوتی بەمە نەگە شەشی ریەیەکە) بەسەری تۆ هیچ درۆی تیا نییە، بەلاّم منیش خەلاّتی خۆم هەر ئەوێت.

* * *

## یەزیدی وا ژن مارە ئەبڕن:

کریف گێ بتەکینە: شێخ ئادی شێخی مەیە هەرچی دەڵێـی هەروەیـە، کـچێك لـە کـوڕێ مارەیە. ئەوە نەسیبی تەیە گەر تەنگەو گەر فرەیە، مەلەك تا دبێـژی، ئـەتو هـیچ نەدبێـژی، قەبیلت کرد؟! قەبیلم کرد.

* * *

جارێکیان ملکە زەوییێك ئەکەوێتە نێوان مزگەوت و تەکیە و نیزاعی ئەکەوێتە سەر ئەگاتە دادگا حاکم بانگی پیاوێك ئەکات تێی بگەیەێنێ رووی تێ ئەکات: مـەعنای چـییە تەکیـە؟! ئەڵێت تەکیە هی دەروێشانە، خانەقاهی سوفیانە، مزگـەوت هـی موسـوڵمانانە، حوسـەینییە جێگای ئەوانەیە نە کافرن نە موسوڵمانن ئیتر جەنابی حاکم کەیفی خۆتە.

* * *

## کەوابوو من میاو

دەمە تەقێ لە نێوان ژن و مێردی قسە رەواندا هەر بۆ گاڵتە و گەپ ئەدوان پیاوەکـە هـەر گازندەی بوو لە دەس ژن و یاسا هیچ مافی بۆ پیاو دانەناوە وتی ئێستا ژن مافی هەیە:

١/ شوو بەهەر کەس بکات ، ٢/ هەر کاتێ بیەوێ بەجێی دێڵێ ، ٣/ هەر جۆرە پۆشاکێك لەبەر بکات کێ ئەتوانێ بڵێ عەیبە یا گوناهە ، ٤/ لەگەڵ هەر کەسێك بـدوێ، یـا دەرچـێتە دەرەوە بەهەر بیانووێك بێت ، ٥ / لە فەرمانگادا لەگەڵ نامحرم خۆی و شیری، ٦/دەم درێژی و بۆڵە کردن، بە ئارەزوو هەڵسوکەوت، ٧/ بیانوو پەڵپ گرتن لە مێرد ، ٨/ ئیشکردن بە مێـرد دوای یەکسانی، بگرە لە بەخێوکردنی منـداڵ و خـاوێن کردنـەوەی ، ٩/ هـەر کـاتێ ویـستی مێردەکەیشی تەلاق ئەدات، هەرپیشی هەبێت ئەیبات و ئەڕوات، چەند سەد لیرەیەکش لەسـەر ئەکات بە ماڵ لە دادگا لەسەریەتی بیدات بە قەرز و حازر یاسایش پشت گیریەتی.

ئەی مافی پیاو چییە؟! خەڵکینە بزانن ئێمە میاو ژنە وتی مەعنای چییە ئێوە میاو؟!

وتی کابرایەك خەڵکی سلێمانی چێشت و گۆشتی ئەخوارد پشیلەیەك هاتە بەرانبەری وتـی میاو، پارچە گۆشتێکی بۆ هەڵدا، خێرا قـوتی دا، وتـی میـاو پارچـەیەکی تـریش بـۆ هەڵـدا خواردی، وتی میاو بە ئەسپایی دەستی گرتەوە وتی: مام پشی تۆ وەرە سەر سـفرەکەو منـیش دێمە جێگەی تۆ، من میاو.

ژنەکە وتی تێ ناگەم وتی یەعنی ئێمە بۆ چێشتخانە و ئێوە بۆ دەرەوە وتی یەعنی چی؟ وتی یەعنی ئێمە ئەکەوین بۆ ئێوە، ئێوە سواری ئێمە بن ئێمە میاو ئێوە پیاو، بەلکو یاسایەکیش بۆ مافی ئێمە بێتە کایەوە ئەگەر بۆ چەند بەرەیەکی تریش بێت ئێمە میاو ئێمە میاو.

* * *

کابرایێك سادە پەرست ئەبێ چاوی بە منداڵێکی (٧ — ٨) ساڵان ئەکەوێ، شەیتان گینگلی پێ ئەدات ئەڵێت ئەم کورە ناوی چییە؟! ئەڵێن: ناوی محەمەدە خێرا سەلاواتێك لێ ئەدات ئەڵێت لەبەر خاتری حەزرەتی محەمەد ماچێکی ئەکات پاش نیو سەعات منداڵێکی تریش دێتە ئەوێ چڵمن و پیس ئەبێت کابرای هاورێی کە لە نیازی چاك تێ ئەگات ئەڵێ ئەم منداڵەیش ناوی محەمەدە بۆچی لەبەر خاتری حەزرەتی محەمەد ماچی ناکەیت؟! ئەویش ئەڵێت: بۆ هەر من موسوڵمانم؟! با یەکێکی تر ماچی بکات لەبەر خاتری ئەو.

* * *

## حیکایەتی کابرای مەڕ گێ

کابرایەك دڵی بە ژنێکەوە ئەبێت چەند جارێك رێگەی پێ ئەگرێت رۆژێکیان پێی ئەڵێت: ئەم شەو وەرە بۆ ماڵەوە بێ ترس کابرای مێردی چووە بۆ سەفەر لە ماڵ نییە، بە مێردەکەیشی ئەڵێت: لە کاتی دیاریکراو شەو بێتەوە لە دەرگا بدات با پەنێکی پێ بدەین

بەڵێ: پاش مەغریب دێتە لای ژنەکەو خۆی روت ئەکاتەوە تەنها بە کراسی و دەرپێوە ئەمێنێتەوە دائەنیشێت لەو کاتەدا مێردەکەی لە دەرگا ئەدات خێرا خێرا لەسەر یەك ژنە ئەڵێ حەیام چوو خۆ، مێردەکەم هاتەوە کابرا چیت لێ بکەم؟! وەرە بچۆرە ناو ئەو مەڕو ئاژاڵانەوە، بەڵکو لە دەرفەتێکدا رزگارت بکەم، دەرگا لە مێردەکەی ئەکاتەوە و خێر هاتنەوەی ئەکات چی بۆ ئەو ئامادە کردبوو بۆ ئەمی دائەنێ و ئەیخوات مێردە روو ئەکاتە ژنەکەی و ئەڵێت راکشێ با پێکەوە دروست بین!! ئەم ملی بۆ نادات و هەرچی هەوڵئەدات ئەڵێ نەم دەیتێ ئەچم مەڕێك ئەگێم، ئەڵێ کەیفی خۆتە جا ئەنیشێت بە کابراوە جوولەی ئەبرێت دێتەوە نەختێ تری پێ ئەچێت ئەڵێ ژنەکە لەکەلی شەیتان بێرە خوارەوە حەزم لێیە راکشێ، ئەڵێ ناتوانم خۆم بشۆم، برۆ مەڕێکی تر بگێ، ئەچێت لایەك دەرگا ئەکاتەوە و

دێتەوە گیانی کابراو لێی قایم ئەکات، ئەباڕێنیٚ و ئەڵێت باع بۆ هەر من مەڕم؟!
دەرئەپەڕێت و رائەکات.

* * *

لە سلێمانی کابرایەکی مەسیحی ئیسلام ئەبێت و ئەچێت بۆ خەستەخانە تا خەتەنەی بکەن. حوسەین هەبوو لەویٚ قسە خۆش و جنێو فرۆش بوو، لەو کاتەدا ئەچێتە بن دەستی و ئەڵیٚ دایکت دەگێم بۆ ئێمە حیز و دزمان کەم هەبوو؟! تۆیش هاتی یەکێکت زیاد کرد ئەویش ئەڵیٚ هاتم جێگای تۆ بگرمەوە.

* * *

کابرایەك لە کاتی هەنجیر گەیاندن تەفسیری ئایەی (والتین)ی (والزیتون)ی ئەپرسێتەوە، وەلاٚمی ئەدەنەوە یەکێتر گوێی لیٚ ئەبێت خێرا ئەچێت خۆی بە باخێکدا ئەکات و دەس ئەکات بە هەنجیر خواردن زۆری پیٚ خۆش ئەبێت، هەر لەوێدا ئەچێتە لای بنکە زەیتونێك سیٚ چوار دانە و قل هەڵئەدات، زۆر تفت و تاڵ ئەبێت روو ئەکاتە خواو ئەڵێت نەئەبوایە لێت بچەشتایە ئەمجا سوێندت پیٚ خواردایە؟ بارغ وەکو هەنجیرەکە بوایە؟ سوێند بە شتی وا تاڵ چۆن ئەخورێت؟

* * *

## باپیرەیان خۆی کوێر ئەکات بە درۆ!!

خاڵۆ زێدان هەبوو لە کەرکوك خانووبەرەیەکی هەبوو دوو کوڕی مرد بە جارێك کەماڵ و ژندار بوون کچێك و کوڕێکیان لیٚ بەجێما سێچوار ساڵانە بوون، باپیرەیان بەسەریانەوە دانیشت و بەخێویانی کرد تا گەیشتنە رادەی بلوغ بوون و رەسیدەیی، کاتیٚ سەرنج و هەستی لیٚ گرتن، تەماشای کرد زۆر بەیەکدا ئەچن و چنکە یۆشەی یەك ئەبن، لێیان ئەکەوێتە شکەوە زۆری لاستەم ئەبێت و گینگل ئەدات بە دەم مەراق و بیرکردنەوە ئەنجام بانگی هەردووکیان ئەکات دەرگای وتووێژ ئەکاتەوە ئامۆژگارییەکی چاکیان ئەکات بە کچەکە ئەڵێت: وا پیٚ گەیشتوویت ئەتدەم بە ئامۆزای خۆت کچە بەرد هەڵئەدات و سەری ئەداتە بەر خەریك ئەبێت بیکات بە گۆیەند و خەڵکی بێنێتە سەر، بە کوڕەیش ئەڵێت هەر هەمان وەلاٚمی ساردو سڕ ئەداتەوە زۆریان لەگەڵ ماندوو ئەبیٚ ملی نادەنیٚ، جا پێیان ئەڵێت: تا دوو رۆژ مۆڵەتتان ئەدەمیٚ بیری لیٚ بکەنەوە: خەبەرم بدەنەوە ئەگینا چاوتان لیٚ ناپۆشم سزایەکتان ئەدەم کەس

نەیکردبێ نەکەن بە حەرام لەگەڵ یەك دروست و جۆر بن، پاشی دوو رۆژەکە ئاگاداری ئەکەن کە بەیەك قائیل نین هەر خوشك و بران باپیرەیش چەند رۆژێك هەست ئەگرێت و بێ دەنگ ئەبێت، کاتێك هەر لە خۆیەوە دەست ئەکات بە هاوار هاوار گوایە سەری دێشێ، خەریکە چاوی دەربێت هەڵیان ئەپێچێت بۆ لای پزیشکی بەرن ئەیبەن بۆ لای پزیشکی تایبەتی و هی چاو هیچی لێ بەدی ناکرێت ئەمجا وا دێتە بیری پزیشکەکانەوە کە نەخۆشێکی تایبەتی تووش هاتووە وا زەق ئەڕوانێت و نابینێت ئەبێ لە دەماغدا چینێك رووی دابێ پزیشك لە خشتە ئەبات و بە درۆ ئیتر خۆی بێ دەنگ ئەکات گوایە کوێر و نابینایە چاوەکانی رەق ئەیڕوانی، بەڵام ملی بە دار و دیوارەوە ئەناو سەرسمی ئەدا هەمیشە دارە کوتێی بوو تا خەڵکی گەرەك و ناسیار و دۆست هاتنە لای بۆ دەربڕینی خەم و داخ ئەمیش هەرداخی بۆ خۆی ئەخواردو بە خۆیا ئەماڵی خاڵۆ زێدان دنیا دیدەو میچی قومارخانە بوو لە زۆر بوارێدا بوو خەڵکی زۆر هەڵسەنگاندبوو، ئەیزانی نەوسی دەمکوت کراو کە بواری دەسکەوێ وەکو مار وایە و زەنی خۆی ئەکات سل لە قەوارەی شوورەیی ناکات و پێ شێلی ئەکات بەڵێ رۆژو هەفتە بەرێ بوو، مژی بیری باپیرە بەجێ بوو ئەم کوێرە کۆتەرەی بەر ئاگردانە بەردی گرفتی سەر دڵانە دڕکی چزو داری مەموو زینە تا بڵێیت لە رەفتاریان بە قینە، جا ئەم کچ و کوڕە شەیتان لە خشتەی بردن بە پەنی کردن لەبەر دەمی باپیرە کوێرەدا هەموو شتێکیان ئەکرد و ئەبرد، پەردەی ناموسیان دڕی دەرفەتی تۆمەتیان بڕی هەرچی خوا حەز نەکات کردیان بە چری، مام زێدانی باپیرە کوێرە سەری خۆی دائەخست چاوی خۆی هەڵ ئەبەست، سەری پەنجەی خۆی ئەگەزت، لە حەوشەکەدا بیرێك هەبوو زۆر کۆن بوو بیست مەترێك قووڵ بوو شەوێك نیوە شەو، ئەم دوانە لەیەك ئالا بوون شەکەتی سەودا بوون مەست بوون لەگەرمەی خەو نەیان بوو ترسی ئەم و ئەو، مام زێدان غیرەت بزوێن هاتەدەر لە پێخەف و نوێن چەقۆی کافرمانی خستە سەر گەردەن، ئاکامی کوڕی دایە دەس مردن، ئەمجا هاتە سەر کچی جوان، ناسك و میهرەبان درۆشم بە سۆزانی بێ خشپە مرانی هەتا بەیانی هیچ کەس پێی نەزانی بە لنگی رووتی هەردووکیان خستە ناو بیری زیندان بۆ جەهەنەمی ناردن بە شەیتانی سپاردن، خۆیشی پاش چەند رۆژێك رۆیشت بۆ پۆلیسخانە دانی بەو تاوانەدا نا کە بێ شەرەفی لەسەر خۆی لابرد، ئەم کارەی بەرپاکرد خەڵکیش چی پێ ئەڵێن با بیڵێن.

هەردوو تاوانباری خیانەتکار

نەمان لە ناو دەرچوون لە شار

بە مارەیی زۆر وا کچ ئەفرۆشن

حیز و بیٚ نامووس بۆی تیٚ ئەکۆشن

شار و دێهاتی ئەواگرتەوە

هەر داوێن پیسە وا لەبەرتەوە

* * *

کابرایەك ئەچێت بۆ حەج، مەرجەکانی حەج ئەوەیە کە بگەرێت بە دەوری کەعبەدا، شتێکی ئاشکرایە زۆر قەرەباڵغە، واتە خەڵکێکی زۆری ژن و پیاو لە ژمارە بەدەر ئەسوورێنەوە تەواف ئەکەن چر و سفت و پڕن بە تێکەلاّوی کابرایەك لەو کاتەدا ژنێکی قەڵەو، سمت و کەفەڵ پان ئەکەوێتە ئامێزی و باوەشی هیچ چاری نابیٚ لە دەستی دەرباز نابیٚ روو ئەکاتە ئاسمان و ئەڵێت خوایە گوایە من وتم دوعاکەم لێرەدا قەبووڵبکە؟ ئێرە جێگەی ئەوەیە؟

* * *

## تۆیش هەر لە ئێستاوە چاویلکە پەیاکە

ئەم چیرۆکە پۆڵۆنییە:

هەرزەکاریٚ گورج و گۆڵ جەنتل، زۆر پەل و پۆ ئەستوور زبر و تێکسمراوو خەڵکی لادیٚ، هەر چۆن ئافرەت بیر و خەیاڵی لیٚ بکاتەوە ئاوا ئەبیٚ دێتە شار و فەرمانێك ئەدۆزێتەوە، باری ژیانی پیٚ دابینئەکات. چاوی بە کچێك ئەکەوێت زۆر جوان و قەشەنگ ئەبیٚ تا ئەو پەری ناسکی و دڵ رفێنی ئەچنە دڵی یەکترو داوای ئەکات و ئەیخوازێت و رێك ئەکەون ئەیبات بۆ مانگی شیرینی بۆ لادیٚ ئەچنە ئوتێلێك میوانخانە دائەبەزن کوڕەکە ئەچێتە پاڵ پەنجەرەکەوە تەماشای سروشت و ولاّت ئەکات زۆری لا جوان ئەبیٚ دیمەنی هەور و باران و گژ و گیاو بەهارو چەم و قەڵبەزی بانگی دەزگیرانی ئەکات ئەڵێت وەرە بنوارە ئەو دەشت و گوڵزارە چەند رەنگین و دڵفرێنە ئەفسووناوییە دڵگیرە مرۆڤ لیٚی تێر نابێت ئەویش، واتە کچەکە هەر خەریکی ئارایشت و خۆی ئەبیٚ نایێت ئەنجام بانگی ئەکات وەرە تا ئەمرۆت لەدەس نەرۆیشتووە ئەگینا لە ئێستا بەدواوە تووشی کورت بینی ئەبیٚ (قصر النظر) هەر بنمیچەکە بەولاوە زیاتر نابینی ئەویش لەسەرخۆ وەلاّمی ئەداتەوە الحمد لله کەوابوو چاویلکەیشت بۆ خۆت هێناوە کەاوبوو من دەستت راناکێشم!!

* * *

## قوربان ئەڵێن بوگیت بە بۆراق

لەم ناوچەی خۆمانەدا شێخێك هەبوو پایە بڵند و ناوداربوو، دەست و پێوەند و دەروێشێکی زۆری هەبوو و لەلایەن میری و زۆر بەڕێز و پشتگیری ئەکرا، خەڵکیش بە راست یا بەدرۆ پێیان ئەوت جاشە مریدەکانیشی لایان ناخۆشبوو ئەم وشە ناشرینە بلکێت بە شێخەکەیانەوە کە لایان وابوو لە حەزرەتی غەوس کەمتر نییە. دەروێشێکی حاڵی لێ هاتبوو ئەی وت قوربان:

وەقوروانت بم شێخەکەی سەنگاو
نظر کا لە قوڕ ئەبێ بە دۆشاو
پێت دێژن ناحەز، بووگیت بە بۆراق
پێم بێژە توخوا وا کردم فیراق
بە گیانی پاکی پیری تەریقەت
وە بۆراق ناوێ شێخی حەقیقەت
ئەوانە مونکیر شێخ و دەروێشن
هەر خۆیان جاشن ریشەی دەرکێشن
واتە رووی نەئەهات کە بڵێ
شێخ بووە بە جاشی میری

* * *

ئەوەی عەلی کردی ئەبوبەکر نەیکردووە، عومەر نەیکردووە عوسمان نەیکردوە لە عەلی مەپرسە لە یەکێ لە مزگەوتەکانی تەهران چوار فەقێ ئەخوێنن بە ناو و مەزهەبی خوازراوە — مستعار —وە ئاخوێنکیش زۆر قینی لە سێ خەلیفەی پێشەوەی پێغەمبەر ئەبێ بەیانیان پێش سلاو کردن دەس ئەکا بە جنێودانی: (أبوبکر، عمر، عوسمان) هەرچی خوا حەز ئەکا ئەوەیان پێ ئەڵێت سەعاتێ پێش کازیوەی بەیانی لەسەر منارەی گەورەی مزگەوتەکە ئەمانیش سوونی مەزهەب ئەبن زۆریان لا ناخۆش ئەبێت نازانن چۆن حەقی لێ بکەنەوە؟! یەکێکیان ئەڵێت ئەگەر ئێوە بڕیار بدەن خۆمانی لێ ئەگۆڕین پەنێکی باشی پێ ئەدەین نەمان ناسی ئەڵێت هەوڵبدەن لە دوکانەکانی تەهراندا کێرە لاستیکێکم بۆ بکرن بیبەستم بە خۆمەوە بەڵێ هەوڵ ئەدەن دەسگیری ئەکەن، خۆیان ئەگۆڕن: بەرگ و کالاو پۆشاك و ریش و سمێڵ و رەنگ و روخساریش بە ئارایشتێکی زۆر چاك یەکێکیان ئەبێ بە ئەبوبکر ئەویتریان ئەبێ بە عومەر یەکێتریان بە عوسمان ئەمیشیان ئەبێ بە عەلی. کە بەیانی زوو ئاخوون سەرئەکەوێ بۆ سەر

مناره ئەمانیش ئەچن بە دوایدا چاوی پێیان ئەکەوێ ئەڵێت ئێوە چین؟! واتە بە فارسی ئەدوێت ئەڵێین ئێمە هەر چوار خەلیفەکەین یەکەمیان ئەڵێت من ئەبوبکرم.... تا ئەمجا ئەبوبکر رووئەکاتە حەزرەتی عەلی ئەڵێت من لە دونیا دۆستی راستەقینەم تۆ بوویت و خۆشەویستم بوویت من چیم کردووە لە تۆ یا لە یەکێکیتر؟ وا ئەم ئاخونە کە شیعەی تۆیە هەموو بەیانییێك وا جنێو بارانم ئەکات محاکمەمان بکە یا عەلی هەروایش عومەر ئەم سکالاّیەی خۆی ئەکات پاشان عوسمانیش، عەلی ئەڵێت دارێکم بۆ بێنن بەهەرسێکیان ئەڵێت داری حەدی لێ دەربکەن (حدی قذف) یەکێ سەروو (٨٠) جلدەی لێ ئەدەن کە تەواو ئەبن ئەڵێت: ئەی ئاخون کەی من مردم وەسییەتم کرد ئێوە ئەم ئیشە قۆرانە بکەن جنێو بە جبرائیل و هەرسێ خەلیفەی پێغەمبەر بدەن؟! ئێمە و جماعەت ئەگەر ناکۆکیمان بووبێ لەبەر خاتری ئاییینی ئیسلام بووە ئەم درۆو قومار بازییە ئێوە دروستتان کردووە بیگرن دەرپێی لە پێ داکەنن چاوی ببەستنەوە زۆر چاك بە کێرە لاستیك دەست ئەکات بە گاینی لەسەر منارەکەیشەوە بەرەو خوار فرێی ئەدەنە خوارەوە بەپلیکانەکاندا زیارت ئەندامی لەشی تێك ئەشکێت و بێهۆش ئەکەوێ ئەمانیش دەرنگانێك هەڵی ئەگرنەوە بە بەرگی فەقێیەتی ئاسایی خۆیان و ئەیبەنە ماڵەوە، جا دۆست و مەلاو ئاخون دێن لێی ئەپرسن یەکێك ئەڵێت ئەی هاوارت بۆ نەکرد بۆ عەلی؟! ئەویش ئەڵێت: أز علی مپرس أن کاری کە علی کردە ئەبوبکر نکردە است عمر نەکردەاست عوسمان نەکردەاست.. واتە ئەو کارەی عەلی پێی کردوم نە ئەبوبکر کردوویە نە عومەر کردوویە نە عوسمان کردوویە عەلی دوشمنا نشانەمی گاید، واتە علی دوشمنەکانی ئەوان ئەگێت بەراستی دیگر من عەلی نخوایم ئیتر من علیم ناوێت..

* * *

لە ١٢ و ١٣ی مانگی ١٩٨٤/٥ مانگرتنێك لە شاری سلێمانی روویدا خوێناوی بوو چەند کەسێکی تیا کوژرا، لە پیاوانی میری و خەڵکی خۆپیشاندەر جا کابرایەك ئەچێت بۆ فاتحە خوێندنی فرسانێك یەکێك پێی ئەڵێت بۆ کوێ ئەچیت؟! ئەڵێت بۆ ئەو مزگەوتە فاتحەی بخوێنم ئەڵێت ماڵت وێران بێ ئەوە سێ قوتابی مانگرتووە پێت بزانن لەت و پەتت ئەکەن ئەویش ئەڵێت ئەمجا کێرم بە گۆڕی با پێی نەزانن گوی بۆ ئەنێرم.

* * *

## پەروەردە گەوج و زەبەلاح رۆشنبیر ئەکات

ئەگێڕنەوە پادشایەك لەگەڵ وەزیرێکیا بۆ گەردوش ئەچنە دەرەوە بە وڵاتی خۆیاندا ئەسوورێنەوە ئەیانەوێ سروشت و دیمەنی نیشتیمان ببینن و کەڵکیش لەو گەردوشە وەرگرن. ئەڕۆن چەند شەو و رۆژێك ئەگەرێن زۆر دەشت و بیابان دەوار نشین و هۆز و خێڵ بەرهەویڵیان ئەکەوێ و پادشایش یەکەمجار ئەبێ لە شارستانی و نیعمەت دائەبڕێت لە خێڵێکی رەوتەنیدا چاویان بە پیاویەکی نەزان و زۆر گەوج ئەکەوێ، تەنها شکل و دیمەنی لە ئادەمیزاد ئەچێت پادشا بەسەرو سیمایکەوە بانگی ئەکات و لێی ئەپرسێت:

کابرا تۆ چیت و چ کارەیت و بەچییەوە خەریکیت؟! ئەویش ئەڵێت: جا تۆ چ کارێکت هەیە بەمن ئەم پرسیارە ئەیکەیت؟! ئەم پیاوە لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بوو زۆر نەزان و گەلحۆ ئەبێ لە منالییەوە هەر بەرخەوان و شوان و ئاژەڵ لەوەڕێن ئەبێ لە هۆزەکەی خۆی بەولاوە هیچی نەدیبوو. پادشا روو ئەکاتە وەزیری زاناو پێی ئەڵێ: وەزیری ژیر عەقڵ ئەیگرێت ئەم کابرایە ببێتە مرۆڤێکی کارامە و هۆشمەند و ژیر بێژەو وێژەو گفتوگۆی رێکو بەجێ بێ؟! ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێت بێگومان پادشا ئەڵێت بیسەلمێنەو تاقی بکەرەوە ئەم مرۆڤە زهنی رەپکەی کردووە هەرگیز فێر نابێت و تێناگات وەزیر ئەڵێت شا بەرقەرار بێت و رێگام بدات بۆ دوو ساڵێك (إثباتی ئەکەم)، جا کە دێنەوە پادشاو وەزیر، وەزیر چەند یاساولێك لەگەڵ خۆی ئەبات و ئەڕواتە لای سەرەك هۆز و خێڵ بە فەرمانی پادشا داوای ئەو پیاوەیان لێ ئەکات بە دەستەبەر بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەیهێنێت بۆ لای خۆی بەخۆیو گالۆکییەوە بەکەپەنکو پێتاڵییەوە، لەولایشەوە وەزیر عەرزی پادشا ئەکات کە سبەینێ ئێوارە پادشا تەشریف بەرێتە ناو باغی هەمیشە بەهار کە گوایە دووباری سەرنج بداتە هەمان پیاوی ناوبراو تا رادەی عەقڵ و ژیری گەوجی و نەفامی هەڵ سەنگێنێتەوە دووبارە و لەگەڵیشیا بدوێت بەیانی پادشا ئەچێتە ناو باغ و گوڵزاری هەمەرەنگ و رازاوە بەخۆیو کەنیزەکو نۆکەرەوە دائەنیشێت لەسەر تەختی جەواهیر و مرواری کابرای خێڵەکی ئەکەنە ژوورەوە بەخۆیو گالۆکەوە بەکەپەنکی شۆڕەوە کە ئەچێت و چاوی بە پادشا ئەکەوێ سەرسام ئەبێت ئەچێتە پێشەوە ئەڵێت سەلامون عەلەیك ئەی بینایی چاوان، پادشایش ئەڵێت: (أستغفرالله من خوا نیم) ئەویش ئەڵێت کەوای سەلامون عەلەیك ئەی پێغەمبەر ئەویش ئەڵێت: (أستغفرالله من محمد) نیم کابرای خێڵەکی ئەڵێت: تۆ خوا نیت و پێغەمبەر نیت ئەی چیت؟! کەوابوو تۆ شەیتانی گالۆکی لێ ئەبات بە ئاسمانا کە بێتە وێزەی لە پشتەوە ئەیگرن و دای ئەنێن بە کەنەفت کراوی. پادشا زۆر بیری لێ ئەکاتەوە بە وەحش و جانەوەری دێتە بەر چاو رووی تێ ئەکات و ئەڵێت تۆ چیت ئەڵێت: من خەڵقندە و ئافەریدی خوام ناوت چییە؟! ئەڵێت دەك فەساڵت

خواتەوە ئەی نازانی من ناوم پەهلووە؟! کارت چییە؟! بزگەل و ئاژەڵ بەخێو ئەکەم و شوانم هەمیشە پادشا ئەڵێت بۆ بەخێوی ئەکەیت؟! ئەڵێت کابرا بەخوا گەوج و دەم درێژی ئەی شوانی نەکەم چی بکەم و بە چی بژیم؟! پادشا ئەڵیٚ وەرە لای من ئەتکەم بە خزمەتکاری خۆم، من پادشام ببە بە پیاوی من ئەویش ئەڵێت: ئای خوا هەڵی تۆی نەگری پیاو وەکو سەگ پەتی بکەن ئەبیٚ بە پیاوی خەڵکی؟! کابرا تۆیش و هەرچیت هەیە ئەیکەم بە بەلاٚ گێڕی پارێنێك و بزنێکم با تۆ پادشای ئەم ولاتە بیت منیش پادشای ماڵی خۆم بەرم بدەن با بڕۆم بە کاری خۆمەوە. جا پادشا لە گەوجی و وشکی ئەم کابرایە سەری سوڕ ئەمێنیٚ و فەرمان ئەدات کە بیدەنە دەس وەزیری ژیر و بەڵێن دەر.. وەزیر فەرمانی ئەدات ببیەنە حەمام و جلوبەرگ و پۆشاکی جوان و چاکی نایابی بەبەرا بکرێت و رۆژ نا رۆژێك حەمام بکرێت و بگۆڕێت و سیٚ جەمە خواردنی تایبەتی بدرێتیٚ و گشت شتێکی لە ژێر چاودێری پزیشکا بێت و دوو مامۆستای فێرکەری بۆ تەرخان بکرێت شەو و رۆژ هەشت سەعاتێك لەگەڵیا خەریك بن، نەریت و رەوشت و ژیانی کۆشك و دواندن لەگەڵ گەورە پیاوانی فێرکەن و بتوانێت بدوێت لە کات و جێگەدا و هەر کەس لە پلەی خۆیدا هەمیشە ئارم و میهرەبان بێت تا ئەیخەنە سەر باری ژیانی تازە هەڵسان و دانیشتن و نوستنی بەکاتژمێر دائەنرێت و دیاری ئەکرێت رۆژ بە رۆژ بەرچاویان روون کردەوە لە پێگەیاندن و تێگەیاندنی چالاکی ئەکرا، ئەم پەروەردەیەی ساڵێك و چوار مانگی خایاند هەروا گشت هەفتەیەك وەزیر سەرپەرشتی ئەکرد و لەگەڵیا ئەدوا، و ئەیبرد لەگەڵ خۆیا بۆ سەیرن و گەڕان لە باوك و برا میهرەبان تر بوو لەگەڵیدا و دڵنەوایی ئەکرد کە پاش ماوەیەك ئەچێتەوە ناو خێزان و هۆزەکەی نەیان ئەهێشت دڵ گران بێت.

مامۆستاکانی هاتنە خزمەت وەزیر و وتیان: گەورەم لە پەروەردەکردن و گۆرانی رەوشت و رەفتار و شێوازی ئەو پەری ماندووبوونیان نواندووە و بەتەواوی کردوویانەتەوە بە مرۆڤێکی تازەی لێهاتووی کارامەو ژیر، ئەتوانیٚ لە گشت مەیدانێکدا بێژەری رەسەن و ناسك و رەسەن و ناسك و تەڕ رستەی جوان و جوانکاری ببێژیٚ و ئەتوانیٚ بەسەرکەوتوویی لەگەڵ پادشادا بدویٚ و هەڵە نەکات و نەشلەژێت و وەلاٚمی پرسیاری رێك و پێك بداتەوە، چونکە لە خۆرسکدا تا رادەێك رەوانبێژ و نەترس و لێهاتوویی تێدا هەبووە کە لێی دڵنیابوون عەرزی وەزیریان کرد ئێمە ئیتر کاری خۆمان بە ئەنجام گەیاندووە و توانیومانە لە ماوەیەکی کەمدا شایەنی ئەوە بێت بیگەیننە خزمەتی پادشا، بۆ سەلماندن و تاقیکردنەوەی بەکێنەکە بەراستی و دروستی و تا رادەیەکی باشیش دەماغی پاك کراوەتەوە و شۆراوەتەوە لە رەبکەی زهن و وشکی سروشتی. بەڵیٚ رۆژێك وەزیر عەرزی پادشای کرد: لام خۆشە خاوەن شکۆتان تەشریفی بەرێتە ناو گوڵزار و

باغی رابووردوو تا ئەو مرۆڤە گەوجەی پێشی بەچاوی خۆتان ببینن، و تاقی بکەنەوە تا چ رادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووە و پەروەردە کاری لێ کردووە؟!!

پادشا بەڵێنی دا لە دەرفەتی رۆژێکی هەینیدا ئەم تاقیکردنەوە بە ئەنجام بگا لە پاش نوێژی عەسرێ.

هەروا کابرای خێڵکیان نارده ناو باغ بۆ لای پادشا بینی پادشا دانیشتووە لە نێوان دەست و پێوەندی شاهانەی خۆیدا بە شەرمێکەوە چووە پێشەوە سەلامێکی داخست کە شایانی شان و شکۆی پادشا بێت لەولاوە بەرێزەوە وەستاو وتی پادشام بەرقەرار بێت هەتا هەتا ئەی سێبەری سەری هەژاران و بێ نەوایان دۆستی دڵسۆزی گەلی بێ پشت و پەنا، ئەی پارێزگاری ولات و مرۆڤ، دڵسۆزی بەرژەوەندی گشت لا بە یەکسانی خوا نەکات جەنابتان پەنادەری دزو درۆزن بن، لانەی و پشتیوانی زۆرداران و چەوسێنەران بن، ئاوەدان وێران نەکەن بەداد و یەکسانی ولات ئارامە پادشا داوای کرد دانیشە بەرانبەرم سوپاست ئەکەم مەبەستەکانت شیتاڵ بکەرەوە بێ هیچ ترس و سامێك وتی گەورەم خاوەن شکۆتان بپرسیت بەندەتان وەڵام ئەداتەوە.

پادشا وتی کۆمەڵە رستەی دوای سەلام دیار و ئاشکرایە کە پتر لە دوعاو نزای بەرقەراریمان بوو بۆ هەژار و خەڵکی رەشۆکی گەل و ولات و تێبینی بەرژەوەندی و یەکسانی، بەڵام لە بەشی رستەکانی دوایی برگەکانی ناوەخنیان هەیە مەبەستت چییە؟! وتی بەرێزتان ئەگەر چاو بپۆشن لە خزم و دۆست و پیاوانی ناو تەلار ئەوا ئیتر ئەبێتە کانی دزو درۆزن و بێ رەوشتی ولات سەرجەم بەرەو وێرانی ئەڕوات و بێ ئەوەی ئێوە پێ بزانن ئەبنە سەرکردە یان هەموویشی بە ناوی ئێوەوە ئەکرێت و ئەنجام ئەدرێت پادشا وتی زۆر راستە، ئەی مەبەستت لە پشتیوانی زۆرداران و چەوسێنەران چییە؟! کە خوا نەکا ئێمە وابین وتی گەورەم لە ناو کۆمەڵدا دەستەیەك هەن هەر شتێك بکەن هەر بە ناوی یاساو شەرعەوە ئەیکەن یا خاوەن ملك و زەوی و زاری باشن چۆنیان بوێ وا مامەڵە بە گیان و سامانی ژێر دەستەکانی خۆیان بکەن، تیکەی چەور ئەگلێنن، ئارەقێك نارژێن شەریکی دز و دۆستی ماڵ بڕاون فرمێسکی درۆ ئەرێژن هەزار فیتنە ئەنێژن وتی زۆر راستە پادشا وتی ئەی بە رای تۆ چ بکرێت چاکە؟! وتی پادشام هەرچیت ئەوێ بکرێت پێشەکی بەسەرخۆتا تاقیبکەرەوە دەرگا بخە سەر پشت بچۆ بە دەنگی گەلەوە سەرفی نەزەر لە هیچ کەس مەکە هەرچیت بەخۆت رەوابینی بۆ خەڵکیش رەوا ببینە، وەختێك خاوەن شکۆتان پادشان کە گەل هەبێ وەختی گەل ئەبێ کە داد هەبێ ئەمجا ولات ئاوەدانە، پادشا سەرنجی دا لەم کابرا خێڵەکییە هاتە سەر ئەو بڕوایە کە چاك پەروەردە کاری تێکردووە لەو

گەوجییە رزگاری بووە و شایەنی ئەوەیە سەرەك هۆز بێت و کاری گرینگیش پێ بسپێرێت، ودانی پیا نا کە وەزیر راستی کردووە هونەری نواندووە و پلەی شالیاری نەدۆراندووە مافی خۆیەتی ئەمجا هاتن کابرایان بە دۆستی و خۆشی و میهرەبانی و خەلات کراوی رەوانەی ناو هۆزەکەی خۆی کرایەوە و ئەمیش تا مابوو بووبوو بە نموونەیەکی خێر و بەرپرسیاری قەلەم رەوی ناوچەکەی خۆی و پادشاو وەزیریش سالە و سال سەردانیان ئەکرد لە بەرگی خەلکی ئاساییدا ماوەیێیەکیان لا بەسەر ئەبرد و بوو بە مرۆڤێکی مەردو هەلکەوتوو.

* * *

## کەم هەیە کاری مرۆڤایەتی وا بکات!!

کاتێکی زانی وا لە میوان خانەیەکدایە بۆیە لە پاش نیوەڕوان خزمەتی میوانەکانی میوانخانەکە ئەکات، ژوورەکان پاك ئەکاتەوە لەمزی رۆژانەیێکی کەم بژیت و نەمرێت، بەیانیان خێرا خۆی ئەپێچایەوە زرینگانە ئەڕۆیشت بۆ فێرگە لە پۆلی شەشدا بەردەوام بوو، دایکیشی هەر ئەو سالە بۆ یەکجاری سەر نایەوە ئەم کلۆکەیە تێر نەخوارد بوو لە دیداری باوکی، مندالەکانی ئارام و حەوانەوەی هەرگیز بەچاو نەدی سەربارەی هەژاری و کلۆلی و تێر نەخواردوو، باوکی ئەم کوڕە چەند سالێك بوو لە سێدارە ئاوەژوو کرابوو، واتە هەر یەکەم تاقم لەسەر ئاژاوەی کەرکوك گوایە بەراست یا بە درۆ لایەنگیری پەت لە مل خراوو راکێشراوەکان بووە، راستییەکەی ئەم کرێکاری شارەوانی بووە ئەوانەی شاردۆتەوە بە بارستەکراوی خوشکەکەی پێش مردنی دایکی بە سێچوار مانگێك چارەنووسی خۆی لای کرێکارێکی رۆژانە دۆزییەوە هەر ئەم نەی ئەزانی چی بکات و روو لە کێ بکات نەیئەگرتە خۆی؟!! وا نەبوو قۆل و بازوو قەوی مەچەك ئەستوور بتوانێ کرێکاری بکات و خۆی پێ بژێنێ، و دەرۆزە و مالان گەڕانی بەرەو نەئەزانی و ئەبوو بەلگەی رەش بۆ خێزانەکەیان بەتەنگ و سەر شۆری و سووکی ئەزانی بۆیە لە میوانخانەکە بوو گوێ رایەلی میوان و خاوەن میوان خانەکە بوو لە قوتابخانەیشدا کەوتنی بە خۆیەوە نەدیبوو بنەمالەی خێزانیان بە چاکە کردار و رەفتار ناوی دەرکردبوو، بەتایبەتی باوکی خوالێخۆشبووی، زۆریش ئەم مال و ئەو مالی کردبوو خزم و خۆیش، برادەرانی باوکی رەحمەتی تەنها ئەوانە سکیان پێ ئەسوتا کە لە بیرۆکەی باوکیا تواببوونەوە بۆچینە رەنج کێشەکەی و بۆ سەر گەردانی هەزارانی وەکو ئەم خێزانە، میوانێکی بەغدایی دائەبەزێت لەم میوانخانەیەدا گوایە هاتووە لیستەی ناو نووسی گشتی وەرگرێت مەزەنە لە کاتی خۆیدا لەم شارە مووچە خۆر بووە وتی: تۆ لێرە ئیش ئەکەیت؟! بۆیەیت؟! بەلێ وتی عارەبی ئەزانیت؟! وتی: بەلێ تا رادەیەك وتی باوکت هەیە؟! کاری چییە؟!

بە گریانەوە من لیٚ قەوماوم لە من مەپرسە باوکم چەند ساڵێك لەسەر ئاژاوەی کەرکوك و تەبەقچەلی ئەم شارە لە سێدارە دراوە، دایکیشم مێردی کردووە لە برسا، ئەوجا مرد خوشکیشم شووی کرد هەر من ماوم لە ناو خێزانەکەم لیٚ قەوماوم سەر شێواوم وێڵم نازانم چی ئەکەم چی بکەم؟! بە پاکوخاوێنی و بە سەربەرزی بژیم و پیٚ بگەم، و ڕێبازی باوکم بۆ تۆڵە سەندنەوە بگرم؟ ئەمەیش گوێی بە خەستی و بە سەختی بۆ گرتبوو نیشتەری وشەکانی لە ناخی کاری کردبوو ئاوی فرمێسك لە چاویا زابوو پەژمەردە و قەتیس مابوو.

وتی: ئایا ئەتوانی ببی بە کوڕی من، چاکتر و جێگیر تر؟! من لە باتی باوکت هەموو شتێکت بۆ فەراهەم دێنم لەنەبوون بۆت ئەخولقێنم خوا یارمەتی بدات، ئەو پەڕی یارمەتیت ئەدەم تا پیٚ ئەگەیت بە ناموس و شانازییەوە ئەتخەمە ناو خێزانی خۆم تەنها لەبەر خواو دڵنەوازی بۆ ئەو، چونکە منیش ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ بیری باوکی تۆدا ژیاوم بەو زانینە ڕوواوم زۆر سەیریشە ماوم هیچ دوو دڵیش مەبە لە پێش نیاز و نیازم بۆ یەکێکی وەکو تۆ ئاواتە خوازم. پێت بڵێم من لە ماڵەوە تەنها ژنێکم هەیە هەرچی ترم هەبیٚ قەل فڕی کردووە بەشی خۆی بردووە، ئەو ژنە ئەبێتە دایکت دوو کچیشم هەیە یەکێکیان پزیشکە شووی کردووە، ئەویتریان کارکێری قوتابخانەی ئامادەیی کچانە ئەمیش هەر شووی کردووە دوو کوڕیشم هەیە ماڵ و ژنیان هەیە، یەکەمیان کارگێڕی گەورەیە لە دادگای گشتیدا، ئەویتریشیان پارێزەرێکی دیاری ناسراوە، ئەمانە ئەبن بە براو خوشکت و چاکتریش ئەگەر بڕیار بدەی!! بەیانی ژوورەکانی پاك کردەوە و چی شت و مەکی هەبوو چایەوە، و زۆر چاك دڵنیای کرد ئۆتۆمبێلەکەی هێنا دوو بە دوو ڕۆیشتن بۆ ماڵی خوشکی پێی وت کچەکەم تۆ بە ماڵ و مێردی خۆت گەیشتوویت ئەم برایەت سەر گەردانە کەس نییە پەنای بۆ بەرێت، ئەنجامیش لە بێکەسی و هەژاری تووشی گاشێك ئەبێت، من ئەیبەمە لای خۆم بۆ بەغداد، ئەبێت بە کوڕی من بە جینسییە و بە دەفتەری نفووس و منیش پشت بە یەزدان درێخی لیٚ ناکەم. خوشکی لە پێشدا نارازی بوو، بەڵام توانی کاری تێبکات و بیسەلمێنیٚ کە نیاز پاکە لەم کارەی هیچ مەبەستێکی گلاوی نییە چاکە خوازی نەبیٚ. بە خوشکی کورەی وت: شەش مانگ جارێك ئەیهێنمەوە بۆ دیدەنیت، ئەگەر تۆیش بیٚ تاقەت بوویت بۆ براکەت وەرە بۆ لای ئەوەیش بزانە لە ژێر چاودێری ئێوە پەروەردە نابێت ئەم کوڕە من لەگەڵیا ئەڕۆم قابیلییەتی هەڵ ئەسەنگێنم بە چارەنووسی خۆی ئەرەخسێنم هەردووکیان سواری ئۆتۆمبێل بوون، کاتێك لەبەردەم مامۆستای خانەنشین

کراو خۆیان دۆزییەوە هەر خۆی دەرگای کردەوە بانگی دایکی منداڵەکانی کرد، ئا فلانە!! وەرە بۆ لای کوڕی تازەمان کە ناوی "فلانە" سەرخۆش و دڵگەش بە، ئەویش هەر لە دوورەوە سەری کێشا و هاتە دەرەوە دای لە هەڵ هەڵەو چەپڵە، وتی یاخوا بەخێر بێنەوە ئای!! چەند تاسەم ئەکردن زوو بێنەوە!! هاتە بەرەوە زۆر بە سۆزەوە باوەشی کرد بە کورەداو وتی "فدوە" بەقوربانت بم ئەوە بۆچی لە دایکی خۆت تۆراوی ئاشت نابیتەوە وا درەنگ هاتیتەوە؟! تێر ماچی کرد نووسانی بە سنگی خۆیەوە هەر ناو بە ناو تێی رائەما وەك یەکێك ئازیزێکی لێ دابڕێت و تازەی چاو پێ کەوتبێت، ئەمجا خێرا خواردنی بۆ سازکردن پاشان دەستی کورەی گرت و بردییە ناو گەرماوەکە چاك خۆت بشۆ خاوێن بەرەوە گشت شتێك والە بەردەستتایە، کە هاتییە تەواو بوون بانگی دایکی خۆت بکە با دەستێك لە پشتت بخەم ئا ئەوەیش پیجامە و سۆلی باوکتە بیپۆشە تا سبەی هی تازەت بۆ ئەکەم دڵ بەدایەکی تازەی خۆت بدە دایکی خوالێخۆشبووت لە بیر بچێتەوە بە خێر و دوعا ئەپرێتەوە خوالێی ببورێت، ئەمیش رۆیشت پاك خۆی شۆری و گۆڕی تا عەسرێکی کامڵ باوکی کورەی لەگەڵ خۆیا بردی بۆ بازاڕ بردی بۆ لای جل دوورێك دوو قات بیجامە و دیشداشەی بۆ رادان دا دوو جووت سۆل "نعل" دوو پێڵاوی چاکی بۆ کڕی هەر وا دوو قات چاکەت و پانتۆڵ چاکترین قوماشی، بەڵام بیجامەکەی ئەبێ دەست و بردی لێ بکرێت هەروا فانیلەو ژێر دەرپێ و بردی بۆ لای سەرتاش سەری پاك کردەوە رەنگی هاوردەوە پێکرا ئێوارە هاتنەوە پاش نان خواردن حەسانەوە و سەربووردەی ئەم کوڕەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە ئەویش بە پیرۆزی لێکردن وەڵامی دایەوە و پتر ورەی بەرزکردەوە، گەرمتری کردەوە ئافەرینی لێ کرد، بەیانی بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بردی بۆ قوتابخانە لە پۆلی خۆی دایمەزراند تا بڕوانامەی پێ ئەگات ئیتر ئەمەی پیشەبوو بەیانی و ئێوارەی هاتووچوو و هێنانەوە بۆ ماڵ هەر بە هەمان حاڵ. ئەکەم ئێوارە رووی هۆدەکانی شارەزا کرد چاکو خەراپی کاڵی کرد و دارایی و قەبارەی ژیانی پێ راگەیاند وتی: هەرچەند پارەت پێویست بوو شەرم مەکە داوا بکە، ئەمەیش سەرەڕای ئەوەی رۆژانە دینارێکی بۆ دانابوو و گشت شتێکی لە ماڵەوەیە و هەرچیش ئەو بیکات با پرس بکات، تەنها دەست و زووبانی و داوێکی پاك و خاوێن بێت لە هەرکوێدا بێت بەپەلە قاتەکانی پێ تەواو کردن تەلەفۆنی بۆ کچ و کوڕەکانی کرد، واتە باوك و دایکیان لەگەڵ باری تازەیاندا بۆ دیدارییان دێن دیدەنیان ئەکەن کە گەیشتنە ئەوێ هەر خوشکێکی هات بەو پەری رێزەوە دەستیان کردە

مل ماچیان کرد لەوانیش گەیەنرا کارێکی مرۆڤایەتی چاکە و بۆ هەتاهەتایش ئەکرێت بە برایان، بەلاّم هیچیان بەرچاو تەنگیان پێشان نەدا و هەر یەکەیان سەرو دیارییێکی چاکیان پێشکەش کرد خۆیانیان پیٚ ناسی و زوبانیان بە منداڵیان گـرت بـە خاڵـە فێرکـرد هەروایش بەمجۆرە کـاری لەگـەڵ کوڕەکـانی کـرد و لـە خوشـکەکانی چـاکتر و گـەرمترو دڵسۆزانەتر هاتنە پێشەوە وات ئەزانی هەرگیز لەم ماڵە دانەبڕاوە و لەویٚ چرۆی کردووە و خۆیشی ڕۆیشت بۆ کەرکوك بڕوانامەی بۆ هاورد، و نەقڵی خانەیشی بۆ کـرد هێنایەسـەر خانەی خۆی لە دادگادا کردی بە کوڕی خۆی، وەکو کوڕو کچەکانی میراتی لیٚ ئەگرن هیچ جیاوازییەك لەم بارەوە نییە، بەڵکو ئەم مافی زیاتری هەیە.

ساڵیٚ دووجار بـە دیـارییێکی زۆرەوە ئـەیبردەوە بـۆ لای خوشـکەکەی لـە کـەرکوك و ئەیهێنایەوە ئەمیش ئەوە لە تۆمارگەی مێشکدا سـرییەوە دایـك و بـاوکی ڕاستـەقینەی خۆی ئەمانی لە جێگەی ئەوان تۆمار کرد. لە ڕۆژا لـە کـاتی بـیٚ کـاری و حەسـانەوەدا ئەیبرد فێری شوفێری ئەکرد و بڕوانامەی بۆ وەرگرت بۆ بە کوڕی ئـەوان، هەرچـی خـزم و خوێش هەبوو هەمووی تیٚ گەیاندووە بە دەعوەت و ئاهەنگ بانگی کردن، وتی من و ئەم ژنە پیربووین خۆم ڕەبووم هەیە هەر کاتێك عمری ئەمانەتم لیٚ وەرگیرا، دایکیان ئـەمێنیٚ هەر با لای ئەم کوڕە بچکۆڵەیەم بمێنێتەوە تا ئەویش ئەگاتە ئاکامی خۆی، من ئەمەوێت سپاردەیەك ڕاگەێیـەنم هەرچـیم هەیـە ڕووەکـەم نییـە — وەکـو یـەك لـە نێـوان خۆیـان دابەشبکەن ئەم برایەکە وەکو ئەوان بیٚ کەم و بیٚ زیان، و ئەمەوێت لێـرەدا نووسـراوێك مۆر بکەن پەنجە و ئاکـاری خۆیـانی لیٚ دەن و گەردەنیـشم ئـازاد بکـەن بـەڵیٚ پاشـەڕۆژ ئەنجامی وابوو، ئەو خێزانە هەروا بەختیار بوون هەتا ئێستا وا ژیـابوون ئێـستا ئـەمیش خـاوەن مـاڵ و ئـەولاد و ژنـە، فەرمانبـەر و مووچـەخۆرە لـە ناویەکـدا لـە یەکـەم ڕۆژ خۆشەویسترن هەروا ئەمێنێتەوە تا ئەمرن.

* * *

### شیعری مەلا سید ڕەشید لە خانەقای بورهان:

دوو برا هەبوون لەو ماشایەتییە یەکێکیان بە نێوی یوسفی ئەویتریان بـە نێـوی یـەعقوبی ناکۆکی لە نێوانیاندا هەبوو یەعقوبییەکان چوونە لای ئاغاکانی مامش وایان لێکـرد جەریمـەی یوسفییەکان بکات، ئەمانیش چاریان نەبوو زوڵم لێکراوبون لـە دوولاوە مەغـدور، مـەلا سـید

رەشیدیش ئەچێتە لای میر و ئەم شیعرەی بۆ دەخوێنێتەوە لەسەر راسپاردەی شێخی بورهان بەڵکو وازیان لیَ بێنیَ: ئەویش ئەم شیعرەی بۆ دەڵێ:

ظاهیرا فەرموتە من سەردارم و ساحیب بەشم
گیرو دارم پیَ دەویَ من شێرە کوللەی مامەشم
لانی یوسف بەرمەدە بۆ خەر گەلی یەعقووبیان
بەردەدەی بە گونم چ کێرم پیَ دەچیَ من چاوەشم

تێبینی: سید رەشید خۆی ناز ناوی شیعری "چاوەش" بووە

* * *

## مەلا مارفی کۆکەیی لە مهاباد

سەرۆکی شارەوانی مهاباد مەلا مارفی خۆش نەئەویست و ژنێکی هەبوو ناوی غەزال بووە، خزمەتکارێکی ئەبێ ناوی ئەسەد ئەبێ گوایە حەزی لە غەزال کردووە وبەردەم خەڵکیش کەوتۆتەوە، ئەمیش لە نامەیەکدا ئەم شیعرەی بۆ ئەنێرێت و تۆڵەی خۆی لیَ ئەکاتەوە:

ئەی جەنابی ریاسەتی بەلەدی
هل تری ما یقال في البلد
قبل ان الغزال قد وقعت
بين ذراعی وجبهة الأسد

هەر هەمان مەلا مارف ئاگاداری رووداوێك ئەبێ ئەم سیَ مەلایانەی خوارەوە مەلا مارفیان خۆشناویَ ئەڵێن بە کەڵکی شاهیدی ناشێت و لێی وەرناگرین.

١. مەلا عبداللەی بورهان ژنی ناوی خورشیدە
٢. مەلا حوسەین مجدی ژنی ناوی زولیخایە
٣. مەلا حەسەنی فاضلی ژنی ناوی زارایە

ئەمیش ئەم شیعرەیان بۆ ئەنووسێت:

شاهیدی شەرعی لە ئەم شارە مەحاڵە و ممتنع
پێت ئەڵێم وەجهی چییە؟ یا ایها القاضی استمع

تاکو رەی خورشید و زەهراو زولەیخا جوش بین
جملة محمل المذاکیر أند و ئالەت مرتفع

آلت

* * *

## خۆیشم ئەدزن!!

پیاوێکی هەژاری کەم دونیا دیدە بزنێکی ئەبێ بەسواری گوێدرێژێك ئەیهێنێت بۆ شار تا بیفرۆشێت لە ڕێگا تووشی سێ جەردەی جامباز ئەبێت، یەکێکیان ئەڵێت کەیفم لێبێت ئەو بزنەی لێ ئەدزم، پەتەکەی لە مل دائەکەنم هیچ بە خۆی نەزانێ ئەویتریان ئەڵێت: منیش ئارەزوو بکەم کەرەکەی لێ ئەسێنم ئەویتریش ئەڵێت: رووت و قوتی ئەکەمەوە "کما خلقنی ربي" ئەڵێن با دەس بەکار بکەین لە یەکەمەوە:

ئەچێت پەتەکە لە ملی بزنەکە ئەکاتەوە ئەیبات و ئەڕوات یەکێ لە دزەکان روو بە رووی دێت و پێی ئەڵێت ماندوو نەبیت، ئەوە بۆ کوێ ئەڕۆیت؟! ئەڵێت ئەچم بۆ شارو ئەم بزنە ئەفرۆشم بۆ پێویستی خێزانەکەم ئەمیش پێی ئەڵێت: کوا بزنت لە کوێ بوو؟! کاتێ هەڵ ئەگەڕێتەوە بزن دیار نییە، تەماشای کرد دوورکەوتووەتەوە، بەحاڵ لە چاو دیارە پێڵاو دائەکەنێ و رائەکات بە دوای بزندا و کەرەکەی بەجێ دێڵێ. نایگاتێ ئەمیش سواری کەرەکەی ئەبێت و ئەڕوات، و بۆی دەرئەچێت ئەمیشی لە دەس ئەچێت ناچار ملی ڕێگا ئەگرێت و ئەڕوات لە ڕێگەیدا بیرێك ئەبێت دزی سێیەم لەوێدا ئەبێت، تەماشا ئەکات ئەگریەت و ئەبارێنێ ئەکێشێ بەسەری خۆیدا باوکە رۆ ئەکات رووی تێ ئەکات خاڵۆ گیان چارم بکە، ئەڵێت چیت لێ قەوماوە؟! ئەڵێت (١٥٠) لیرەم پێ بوو چوومە ناو ئەم بیرەوە ئاو بخۆمەوە لە گیرفانم کەوتە خوارەوە کەوتە ناو بیرەکە خۆیشم ترسنۆکم ناوێرم بچمە ناوی ئەخنکێم ئەگەر بچیتە ناوی بۆم دەربێنێ بە نیوەیی زۆر مەمنون ئەبم. ئەمیش بیر ئەکاتەوە ئەڵێت: کەر و بزنەکەم بیست لیرە ناکات وا چاکە بارتەقای بکەمەوە خۆی روت ئەکاتەوە هەرچی لەبەردا ئەبێت دای ئەکەنێ و ئەچێتە ناوی، خۆی بە قوتا ئەبات هەرچی هەوڵئەدات هیچ نادۆزێتەوە کە دێتە دەرەوە جلەکانیشی نەماوە ئەمجا بە دەوری خۆیدا خولی ئەخوارد هاوارە خۆیشم ئەدزن هاوارە بۆ کوێ بچم!!

* * *

## ئەمەویٚ شیٚتم بکەی

مەلا فایقی شیٚت هەبوو جارجار تیٚك ئەچوو، رەفتاری زۆر لـە سـاغ نەئەچـوو، خـۆی گیٚرایەوە وتی: جاریٚك شەو رۆیشتمەوە بۆ مزگەوت لە ریٚگە تووشـی یـەکیٚك بـووم زۆری خواردبووەوە لالامووی ئەکرد، بانگی کرد مەلا فـایق مـەرۆ وەرە شـیٚتم بکـە، وتم کـوڕە دایکت چاك باوکت چاك بۆ ئەتەویٚ شیٚت بیت من ناتوانم شیٚتت بکەم وتی هیچ چار نییە هەر ئەبیٚ شیٚتم بکەی منیش بیرم کردەوە خوایە چی بکەم، وتم وەرە دایکت دەگیٚم شەرتە وات شیٚت بکەم بگرە بە خۆیشم چاك نەبیتەوە دەسم گرت بردمـە بـەر دەرگایـك دام لـە جەرەس هاوارم کرد ئەمە دزە هەر دەرگایـەك جەرەسـی هەبوایـە لـیٚم ئـەداو رام ئـەکرد خەڵکی کەوتنە شویٚنمان کابراش لە ترسا رای ئەکرد، بەکورتی چوار بـاغ و سـەر کـاریٚزم نەبوارد ئەویش هاواری ئەکرد بۆ خاتری خوا چی بکەم وا شیٚت بووم واللە بمگرن ئەم کوژن چارم بکە مەلا فایق منیش وتم دایکت دەگیٚم ئەی ناتەویٚ شیٚت بیت؟! ئاوا شیٚتت ئەکـەم بۆ خۆراییە حیزباب شیٚتی هونەرە....

* * *

پیاویٚك دەستی پیاویٚکی گرت هیٚنای بۆ خزمەتی حەزرەتی "علی" وتی ئەم پیاوە ئەڵیٚت: لە خەوما زینام لەگەڵ دایکت کردووە ئەویش فەرمووی: بیبە بەر هەتاو رایگـرە (١٠٠) سـەد جەڵدە لە سیٚبەرەکەی بدە.

* * *

کچیٚك بە دایکی وت: دایە ئەم شەو لە خەومابوو کەوتمە ناو چاڵیٚك پڕ بوو لـە کیٚـر، وتـی رۆڵە خۆت بپاریٚزە نەچیتە حوجرەی فەقیٚیان.

* * *

پیاویٚك بیٚ دەنگ ئەرۆیشت بە دوای یەکیٚکدا ئەمی پیٚشەوە بایـەکی گـەورەی لیٚ بـەربوو وتی بەهارە بەهار نەختیٚکی تریش رۆیشت یەکیٚکیتری لیٚ بەربووەوە وتی بەهارە بـەهار تـاکو سیٚجار، هەڵگەڕایەوە کابرای بینی وتی لە کەیەوە وای بە دوامەوە؟ وتی سیٚ بەهارە.

* * *

کابرایەکی ملحد هەبوو زۆر خوێنەوار بوو بە تایبەتی لە عەرەبیدا گاڵتەی بە رەوا بێژو فصاحەتی قورئانی پیرۆز ئەهات، دایکێکی ناوازەی جوانی هەبوو جارێکیان ئەچێتە خزمەتی جەنابی مەلا (محمدی جەلی زادە) ئەڵێت قورئان زۆر زیادەرەوی تیایە چیرۆکەکانی پتر لە جارێك دووبارەکراوەتەوە هەروا شتی تریشی تێدایە جەنابی مەلایش فەرمووی وەکو چی؟! ئەویش وتی: قورئان ئەڵێت للذكر مثل حظ الأنثيين: ئەتوانێت کورتکرێتەوە بڵێت: للمرأة نصف الذكر جەنابی مەلایش ئەڵێت برۆ ماڵەوە لە دایکت بپرسە بزانە رازی ئەبێ بە نیوەی؟!!

* * *

لەو ناوچەیەی هەڵەبجە مەلایەك هەبوو زۆر قسە خۆش بوو فەقێیەکی نیوچە مەلای زۆر بەدین دێتە ئەوێ بخوێنن رۆژێك فەقێ هەر هاواری ئەکرد ئەپارایەوە ئەیوت خوا: تەوبەبێ گووم خوارد پەشیمانم، لێم ببوورە... تاد ئەویش وتی ئابرا نعوذ بالله تۆ کوڕی خوات کوشتووە؟! ماڵی خوات سوتاندووە؟! کام پێغەمبەرت کوشتووە وا پەشیمانی ئایا قنگ هەڵپچڕاوی وەکو تۆ ئەبێ چی کردبێ؟! بەسیە برا چیت کردبێ من کە فیلم تا دۆزەخ گەیاندنت.

* * *

فەقێیەك چووە لای مەلایەك ئەیخوێند پاش هەفتەیەك رۆیشت پێیان وت بۆچی رۆیشتی؟! وتی والله مەلای چاکە، بەڵام بە ئیعترافی خۆی فاسق و بێ دینە وتیان چۆن وتی: هەر ئەپارایەوە: خوا من گوناهبارم، فاسقم، بێدینم، روو رەشم، تاوانبارم، عەفوم بکە دیارە ئەم پیاوە ئیعتراف ئەکات فاسق و بێدینە منیش لای پیاوی فاسق و تاوانبار ناخوێنم.

* * *

ساڵێکیان هەر باران ئەباری و خۆشی نەئەکردەوە خەڵکی وەڕەس بوو بوون لە گیانی خۆیان، ئەحەی جاویش هەبوو شێت بوو جارجار ئەیاندوان وەڵامی نەستەقی ئەدایەوە وتیان مام ئەحمەد ئەمە چییە ئەم بارانە؟!! مەلائیکەتەکان لە ئاسمان هەموویان دەسیان کردووە بە جل شۆرین و چلکاوەکەی ئەکەن لەسەر ئێمەدا..

* * *

## هەنارانم بۆ داناگرێ

مامۆستا مەلا عیسی فتاح گەورەی هەرتەل فەقێ ئەبێ و ئەخوێنێ لە بەغداد لەلای مفتی زەهاوی. زۆر مەیەلایەکی زۆر چاك و زاناو تێگەیشتوو ئەبێ و جەنابی مفتی زەهاوی زۆر لێی رازی ئەبێ ئەمیش کچێکی ئەبێ زۆر رەوشت جوان و دیندار ئەبێ هەر وایش تا بڵێی زاناو خوێنەوار و جوان و ناسك ئەبێ، مفتی لە دڵی خۆیدا ئەڵێ ئەم کچەم بۆ مەلا فتاح باشە ئەیدەمێ رۆژێك مفتی پێی ئەڵێت و ئەیدرکێنێ ئەویش ئەڵێت بابیری لێ بکەمەوە ئەمشە و ماوە و دەرفەتم بدە!! بەیانی کە ئەچێت بۆ دەرس خوێندن ئەڵێت ها!! بیرت لێ کردەوە؟! وەلآمی ئەداتەوە بەڵێ نامەوێت، مفتیش لای سەیر ئەبێ و قسەکەی شکاند سەربارەی ئەوەی وەزیر و پیاو ماقولاَن مەمنونی ئەبن کە ئەم کچەیان بداتێ و ببن بە زاوای ئەمیش تێ ئەگات کە مامۆستای پێی دڵ گران ئەبێ ئەڵێت گەورەم زویر مەبە، چونکە هەنارانم لۆ ناکاتەوە من ئەبێ بیبەم لەگەڵ خۆمدا بۆ خۆشناوەتی و بۆ ناو باخ ئەویش رانەهاتووە سەرکەوێتە سەر دار و درەخت و فەرمان و ئیشی دەشت و لادێی و ناو باخی پێ ناکرێت ئەوسا کارەسات روودەدات.

* * *

## نیوەی ئیشەکە کزاوە!!

لە دوای نیوەی ساڵی (١٩٨٤) خەڵکی کوردستان وەرس بووبوون لە دەنگوباسی وتووێژی نێوان یەکێتی نیشتیمانی و میری، بەواتەی خۆیان هەر هیچ شتێك لە ناوا نەماوە وسنووریشیان دابینکردوە خەڵکیش هەر چاوەڕێی کرد ئەمڕۆ سبەی بەیان ئەخوێنرێتەوە دونیا ئیتر ئەبێ بە زەمانی (محمدی مهدی) گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو ئەخۆنەوە مەجلیس گیراوە خەڵکیش دانیشتووە دەنگ و باس گەرمە هەر یەکێك ئاوازێك ئەخوێنێ گشت کەس تینووە بۆ دەنگوباسی پاشەرۆژی ولآت و کورد و باری درێژواری کۆر و کۆمەڵە و پارتەکان یەکێك پرسیاریکرد مافی کورد و یەکیەتی نیشتیمانی بوو بەچی؟! یەکێك وەلآمی داوە:

کوڕە کەچەڵێك هەبوو زۆر هەژار و ناشرین بوو جارێك چاوی بە کچی کارگوزاری ولآت ئەکەوێ — پادشا — دایکی هەڵ ئەپێچێ بچێتە داخوازی بۆی، دایکی ئەڵێت ئێمە و ئەوان کوجا مەرحەبا، ئەو کچە پادشا زادەیە نایدەن بە تۆ پەڵپی لێ ئەگرێت هەر بچێت، دایکیشی هەڵ ئەسێت و ئەڕوات نۆکەر و دەرگەوان پێی ئەزانن هەموو گیانی دارکاری ئەکەن و

ئەیشکێنن بە دڵی شکاو دێتەوە لە ناو دۆست و برادەرانی کوڕە کەچەڵدا بڵاو ئەبێتەوە ئەم هەواڵە لێی ئەپرسن ئیشەکەت بەچی گەیشت؟! ئەویش وەڵام ئەداتەوە نیوەی تەواو بووە نیوەی ماوە ئەم کارە لە نێوان دوو لاماندایە لەلایەن ئێمەوە رازین هەرچۆنێك بێت ئەوان بانارازی بن نیوەی تەواوە جا وتی ئەمیش وەکو ئەو وایە بێ پیاهەڵواسین، یا پاشبەند..

* * *

وا ئەگێڕنەوە: گوایا محمود پادشا سەر کۆماری گشتی هۆزی جاف لە هەڵەبجە لە زەمانی وەسمان پاشای باوکیدا ئەڕواتە ناو بازاڕ ئەمیش لە تافی جوانی و هەرزەکاریدا ئەبێ، ئەبینێ یەکێك کابرایەکی هێناوەتە گاز و گیر، داوای (٢٠) لیرەی لێ ئەکات کە قەرزارەو ئەبێ هەر دەسبەجێ بیداتەوە کابرای قەرزار زۆر بیچم و شەیتان ئەبێ (محمود) پادشایش کە چاوی پێ ئەکەوێت و هانای بۆ دێنێ ئەڵێت من بۆت ئەدەمەوە، بەڵام کەی ئەیدەیتەوە؟! ئەویش ئەڵێت لە پاش ساڵێکی تر ئەمڕۆ رۆژ و مانگ و ساڵ ئەڕوات هەر گوێی ناداتێ کاتێك تووشی پادشا ئەبێت و ئەمر ئەکات ئەیگرن ئەیباتەوە، ئەیکەنە ژوورێکەوە نزیکی ژوورەکەی خۆی کە تیا ئەنوێت هیچ لە بیری نامێنێ ئەم کابرایەی گرتووە، شەو کە کاتی نووستن دێت داوا لە ژنەکەی ئەکات کە خەلیفە داخلی بەغد بکات و راببوێرن دێت لە ناوکی گیر ئەکات، ژنەکەی ئەڵێت ئەوە چی ئەکەیت؟! ئەڵێت ئەمەوێت کونێکی تازە لێرە بکەم، کابرایش لەو هۆدەکەی ترەوە گوێی لێ ئەبێت ئەڵێت قوربان کونەکە بە من ببەخشن بە کەڵکی ئێوە ناشێت ئەمیش دێتە وێزەی کە لێی بدات دەنگە دەنگ و ئاژاوە و پێکەنین پەیدا ئەبێت، وەسمان پاشا پێی ئەزانێت بانگی ئەکات بە زۆر پێی ئەگێڕێتەوە، ئەمیش هیچ تێك ناچێت ئەڵێت حەقی خۆیەتی کابرا بەرەڵڵا ئەکات و پارەکەی بۆ ئەدات و بە پێکەنینەوە ئەڵێت دیارە ئەوان ئەوەندە بەخشندە نین کۆنە کونیکت بدەنێ خوات لەگەڵ بڕۆ!!!!!

* * *

## وتە لە جێگەی خۆیدا بێ لە وێژەی بێ پەردەدا هەر خۆشە..

جارێکیان سەرۆکی تەندروستی پارێزگەی سلێمانی داوا لە خاتوونە ئەکات کە بچێت میوە دەستنیشان بکات بۆ کڕین لە بەڵێندەری ئازووخەی نەخۆشخانە، لەو کاتەدا خاتوونە بەرپرسیاری برینپێچەکانی ئافرەتان ئەبێ، ئەچێت هیچ دەست ناکەوێت لە بازاڕدا تەنها گێزەر

ئەبێ دێتەوە بە سەرۆکی تەندروستی ئەڵێت هەر ئەوە هەبوو ناچار ماین بیکڕین ئەویش ئەڵێت: دیارە خۆیشت هەر حەزت لە گێزەرە ئێستایش!! ئەمیش بێ پێچ و پەنا وەڵام ئەداتەوە: قوربان خۆیشتان هەر لە منداڵییەوە تا ئێستایش بە چاکی ئەزانن و دەس بەرداری نەبوون بۆ ئەبێ هەر منی پێ تاوانبار ببم!!؟ سەربارەی ئەوەیش چاو بەهێز و سروشت نەرم ئەکات ئیتر ئەبێ بە پێکەنین بێ دڵگیرییێك..

* * *

کاتێك مامۆستا بووم لە دێیەك لەو ناوچەی کوردستانەدا بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان کارگێڕێکی زۆر سەیربوو قوتابییێکمان هەبوو هیچ فێر نەئەبوو، مامۆستایش کە بەڕێوەبەر بوو بڕیاریدا بێنێتەوە ئەو ساڵە ساڵی داهاتوویش هەر دەرنەچوو مایەوە قەراریدا کە پۆلێکی بێنێتە خوارەوە ساڵی داهاتوویش هەر پۆلێکی تری هێنایە خوارەوە ئەمجا ساڵی چوارەم باوکیان بانگ کرد کە هیچ فێر نابێ، باوکی وتی: قوربان مامۆستا گیان لام وایە ساڵێکی تر ئەبێ بڕیار بدەن بیکەنەوە بە قوزی دایکیا، ئەگەر هەروا کار بڕوات؟! بەڵام داخ ئەوەیە جێگەی نابێت، چونکە یەکێکی وەکو خۆی تێدایە ئەگینا هەر ئێستا ئەمرت بفەرموایە..

* * *

## گوو ئەبارێت!!

کابرایەك ئەچێتە لای سەرتاشێك، بەڵام زۆر تەنگەتاو ئەبێ باوبڕی زۆری پێ دێنێ، لەولایشەوە وا لە ژێر برینگەدایە بە سەرتاشەکە ئەڵێت: رەحمەتی خوا لە باوکت سەیرێکی ئاسمانم بۆ بکە بزانە لە باراندایە یان ناء؟! ئەویش ئەچێتە دەرەوە تا دێتەوە ئەم خۆی رزگار ئەکا کاتێك دێتەوە ئەپرسێت ئاسمان چۆنە؟! ئەویش کە دێتە ژوورەوە ئەڵێت ئەگەر هەر وا بڕوات ئەم شەو گوو ئەبارێت.

* * *

## پادشا پادشای فەقێیان

بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەنووسم پادشا پادشای فەقێیان ..

ئەمەی کە ئێستا خوێنەری بەڕێز ئەیخوێنێتەوە، شانۆیەکی سەیرە پڕە لە پەندو ئامۆژگارییە هەر وا یادگار و زیندووکردنەوەی ڕووداوێکی ڕاستییە، زۆر نەریت و کەلەپووری

گرتووەتە خۆی یا فەراهەم هێنانی فۆلکلۆری نەتەوایەتی دێرینی کۆنی کوردمانە جا منیش بۆیە ئەینووسم، چونکە رووداوێك بوو لەبەر چاوی خۆم سازکرا و زۆر بەتام و چێژ بوو، بۆ ئەوەی ئەمیش گوم نەبێ، وەکو هەزاران شتی بەنرخ، کە رۆژگار لوولی نەداو بیپێچێتەوە بە تۆمار نەکراوی و بیخاتە پشتی پەردەی نهێنی و شاراوە، هەر جارێك بێت و بەس، کەس جارێکیتر گەشە بە خۆیەوە نەبینێ.

ئەم باسە جارێتر بە پێنووسێکی بە پێزو فراوان، و بەپاراوتر نووسیبووم، بەلاّم دەرفەتێك نەبوو بلاّوبکرێتەوە هەر بۆ یادگار.

جارێك خۆم ناردم بۆ بەرێز مامۆستا گیو لە هەولێر، تا بلاّوی بکاتەوە لە گۆڤاری هەتاوی ئەو کاتە، یا لە هەر شتێکی تر کاتێك لە هەولێر بینیمەوە، رەزامەندییەکی زۆری پێشاندا لە نووسراوەکە و بەلایەوە پەسەندبوو وتی: نەموێراوە بلاّوی بکەمەوە، بەتایبەتی خاوەنی ئیمتیاز سڵی زۆری لێ کردەوە، گوایە رژێمی ئەو سەردەمەی ئەو کاتە زۆر بەوردی شیتاڵی ئەکاتەوە و بە تەشەر و توانجی لە پێنووسی ئەدا. بە زەقی پەلاری ئاراستەبووە بۆ قەوارەی دەسەلاّتی رژێم و زۆریان کاربەدەستان ئەنگێوێت و ئەیگرێتەوە و ئەبوو بەمایەی دەردی سەریمان و لە ئەنجامدا هەروا مایەوە نوسخەی دووهەمی لای خۆم تا ساڵی (١٩٦٣) کە ئەو ساڵە ساڵی نەگبەتی کەساسی کورد بوو، کە هێرشی بێ بەزەیی سووپا هێنرایە سەر کوردستان و کردی بە خۆڵەمێشی ئاگری جەنگی رەگەزپەرستی کە بۆچورکو دووکەڵی ماڵ و حاڵ ئاسمانی ئەگرت، ئەو نووسینەی منیشە، بوو بە خۆراکی ئەو ئاگرە لە ترسی پەلپ و بیانوو گرتن لەگەڵ زۆر کتێبی بەهادار و بەنرخ، کە مرۆڤی رۆشنبیر ئەکرد و لە تاریکی ئەیبردە رووناکی بەناچاری وا دووبارە نووسیمەوە، هەرچیم لە یاد بێت با ببێت لە رۆژگار بۆ یادگار هیوام وایە رۆژی لە رۆژان کەڵکێکی ببێ..

* * *

لە ساڵی (١٩٤٨)ز فەقێ بووم ئەمخوێند لەو خۆشناوەتییە لە دێی بالیسان وا رێکەوت مەلا..... ئەبوایە ئیجازەی عیلمی وەربگرتایە، ئیجازەی مەلایەتی ئەمەیش وەختێ ئەکرا — بە پێی باوی کوردەواری — هەر مەلایەك خوێندنی تەواو بکردایە و بیتوانیایە ببێ بە مەلا ئەبوایە بڕوانامەی هەبوایە، تا خەلکی بڕوای پێ بکردایە بە تایبەتی کاتێك ئەو مەلایە هەژار بوایە بۆ ئەوەی بتوانن کەمێك سەرمایەی بۆ پەیا بکەن و ماڵێکی بۆ پێکەوە بنێن و ماوەیەك بۆ خۆی بژییت ئەمەیان بۆ ئەکرد یارمەتی و کۆمەکی باشیان ئەکرد لەم

ڕێگەوە، واتە شای و زەماوەند و پادشا پادشایەتی بۆ کردنی، هەروا ئەمە هەڵنانێك و هاندانێك بوو بۆ ڕێزلێنان لە پێشەوا ئایینییەکان لەلایەن میر و پیاوە ناودارەکانی ئەو سەردەمە لەو ناوچەیە هەروایش ئاهەنگێکی زۆر جوان بوو بۆ نیشاندانی بیروباوەڕو گاڵتە و گەپ لە دەمەلاسێیی کردنەوە، لە شانۆی ژێر ئاسمانی بێ سام و ترس لە کوردستانی زانا پەروەر کاتێك بڕیاری تەواو وەرگیرا کە ئەم ئاهەنگە هەر بکرێت؟ من و مامۆستا پێکەوە ڕۆیشتین بۆلای چەند پیاوێکی ناوو خاوەن دەسەلات لە ناوچەکە، نزیکی (١٠) دینارێك پارەمان دەسگیر بوو ئەمە بوو بە بۆجەی دانانی بنچینەی هەڵسوڕانی جیفاتی ئاهەنگی کۆبوونەوەکە و ڕازانەوەی زەماوەندەکە، و توانرا چەند شتێکی پێ بکرێت. لەوەدووا نامە نێردرا بۆ مەلا و فەقێ و میر و بەگی ناوچەکە جا پتر لە پێنج سەد کەسێك لەو هەرێمە هاتن بە دەنگمانەوە، ئەوانەی بلیمەت کار دیدە بوون لەم گۆبەندەدا، لێهاتوویی خۆیان بەکارهێنا، ئێمە وامان لێهات هەرچییان بوتایە لەسەرمان بوو جێ بەجێی بکەین و ئەمانرووانی بە دەمی ئەواندا، تا بزانین ئەنجامی بە چی ئەگات؟! هەی ئافەرین بۆ کورد بۆ خۆیو ڕۆڵەی بلیمەتیی لە هەموو مەیدانێکدا و لە گشت زەمانێکدا بە توێشەو زەخیرەی لەبن نەهاتووی خۆی هەیە. لە پێشەوە سێ ڕۆژ خەریکی تفاق خستن بوون، وە بەرنامەی کاریان نووسی و پرۆگرامیان بە وردی بۆ سازدا، بڕیاردرا پادشا و حەوت وەزیر دەستنیشان بکرێن، هەر کەسە بە جل و بەرگی تایبەتی خۆیەوە دێنە سەر شانۆی گۆڕەپان لە بەردەمی جەماوەری وڵات، لە کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگ ئامادەکرا، سەربارەی تاجێکی درێژی قووچ بۆ پادشا قەرار دراوە بە جۆرەها پلە و پایەی بەرزی دەسکرد زێوەر کرا، داوەری گشتی لە ناو هەموویاندا دیاری تربوو، بە چەند ملهورێکی گەواهی دەری بێ دڵ و ویژدان بۆ پاکانەو داکۆکی کردن لە شەیتان، بە خۆیان و دەستەی سیخوری مل پان، مەلایەکی باڵا بەرزی جیهان دیدەیان دۆزییەوە کردیان بە پادشا بە وێنەی جارانی تری دانرا، جلوبەرگی پۆلیسیان خواستەوە تا زەماوەند وشکە مەلا تەواو ئەبێ و پەتی مەدیلی مەلا خنکێن لە گەردەن و ملی توووند ئەکرێت، و بانگی کلۆلی بە گوێدا ئەدرێت.

ئەمجا یاساوڵ و پیاوانی دەم ڕاستی میری دەستنیشان کران، واتە هەر کەس بە فەرمانی خۆی هەڵسێت و بەو پەڕی لێبوردن و وریایی پسپۆری خۆی بنوێنێ و فەرمانی بە ئەنجام بگەینێ. یەکێك دانرا بۆ یاوەرو پێ ڕاگەیدنی پادشا کە ئەمیش زۆر زوبان لووس و قاڵ و ڕەوانبێژ بوو، لەکاری ڕۆژانەی خۆیدا ئەگەر (١٠) کاتژمێر لەسەر یەك بدوایە دووبارەی

نەئەکردەوە گرەوی لە شەیتان ئەبردەوە گیر و گرفتەکانی جێگا ئەکردەوە گرێ کوێرەی رامیاری بە بلیمەتی خۆی ئەکردەوە هەڵپەرستی و دوو روویی دەسگردی بۆ خۆی کردبوو بە نەریت سەرت لێی سور ئەما کە ئەتوت دوو گەنجی فەقێی بالاّ بەرزی سووری چاوشین تێك سمڕاو کرابوون بە پزیشك دکتۆر یەکێکیان تایبەتی پادشاو دەست و پەیوەند بوو ئەویتریان هی گەل و خەڵکی ئاسایی بوو کەرەسەی پزیشکی و برین پێچیان بۆ ئامادەکرابوو بۆ دۆزینەوەی نەخۆشی درۆ لە راست ئەچوو، دۆ بە ماست ئەچوو پەمپێکی فوو تێکراو هێنرابوو بۆ رەچاوکردنی نەخۆش، هەژاری بێ پارەو پوول، بە خۆرایی بۆیان دانرابوو، لەوەدوا ناردیان بە دوای ئاغاو بەگە میری ناوچەکە داوات کران، هەروا دەوڵەمەند و دەستەلاّتدارو، ناسراو بانگە وێژەکە یان قەبووڵ کرد جا بەرنامەی رۆژەکەیان دابەش کرد، بەمجۆرەی خوارەوە دەستوبرد.

١. ئەبێ یاساوڵی تایبەتی پادشا لە (١٠) کەس کەمتر نەبێت هەموو رۆژێك لە پشتی سەریوە بن بە چاکیانەوە.

٢. هەرچییێك پادشای وەخت قبووڵی کرد لە پاش لێکۆڵینەوە هەڵوەشاندنی نییە ئەبێ جێ بەجێ بکرێت.

٣. ئاهەنگی شاهانە (٣) رۆژ ئەبێت، بە مەرجێك ئەو رۆژانە شایی و زەماوەندی تیا ئەبێ، و لەشەویشدا چیرۆکی کورت کورت لە شێوەی شانۆ و مەتەڵ و گاڵتە و گەپ ئەنوێنرێت و ئەکرێت بۆ گەشەپێدانی دڵی گەل و جەماوەر و خۆشکردنی کۆڕی میوان و سەیرکەران.

أ/ رۆژی یەکەم پەیامی شا ئەخوێنرێتەوە بۆ جەماوەر.

ب/ رۆژی دووەم دادگا دائەنرێت بۆ لێپرسینەوەی تاوان کاران، و بۆ ئەوانەی سەرپێچی ئەکەن و و یاخی ئەبن لە یاساو دەستوور و وەلاّمی ئەوانە ئەدرێتەوە کە رەخنە ئەگرن لەلایەن گەل و چینی خوارەوە.

ج/ سێیەم رۆژ گاڵتە و گەپ وپێچینەوەی بارگە و بنکەی شا و توانەوەی شێرە بەفرینە.. بەم جۆرە بڕیاردرا ئەم زەماوەندە بکرێت و ببرێتە سەر.

پانتایەکی پان و بەرین تەرخان کرا بۆ کۆبوونەوەی گشتی و پادشاو فەرمان رەوایان و دادوەرەکان و بۆ کاربەدەستانی وەختی، و مێز و کورسی و رایەخ راخرا، و هەر کەس بە پێی توانای کاری پێ سپێررا و ئیش و فەرمان دابەش کرا کۆڕی مۆسیقاو ئاهەنگ دانرا، مەجلیشی پادشا رازێنرایەوە، دەستەی جەریمە و کوشتن و بڕین رێکخرا کاتێك کاك مەلا بەرگی بەبەردا

کراو تاجی لەسەر نرا، بەبەرزترین پلەو پایە ماشاالله، لەراست ئەچوو زیاتر تا لە گەمە مـرۆڤ ترسی لێ ئەنیشت و زارەترك ئەبوو، پادشا بەخۆ و بـە تاجـەوە لـە مـاڵ هاتـەدەر، بـەوەزیرو سەرتیپ و یاساول بەدوایەوە لە ڕێگە پێشوازی لێکرا، تـۆپی لـە تەنەکـەو ئاسـن دروسـتکراو تفەنگ ئاگردرا و هەندێکیش بەچەکەوە بە سەلام قوت لـە پێـشەوە ئەڕۆیـشتن ڕێـك و پێـك، یاساوڵی تایبەتی شا لـە دوایـەوە، دەس بـە خەنجـەر و دەمانـچە لـە خزمـەتیا بـوون. ئـەمجا وەزیرەکان و پیاوانی ئایینی و سەرۆکی هەڵسووڕێنەری کاروباری وڵات لەگەڵ شاعیران و بوێژان و پیاو ماقووڵانی وڵات لە هەموو چینەکانی نیشتیمان و مۆسیقاو گۆرانی بێـژ و دەنگخـۆش، بە چەپڵە ڕێزان کەوتبوونە تەك پادشا ئەڕۆیشتن بە گۆرانی و سروودی نیشتیمانییەوە... پادشـا چاکەتێك و پانتۆڵی لەبەر کردبوو تا بڵێیت فەنتازبوو چـاویلکەیەکی لەچـاوکرابوو، مـرۆڤ بـە تەواوی سامی لێ ئەنیشت کە ئەیدیت، بەم جۆرە جەوهەر و شەوکەتی لێ ئەباری بە هـەنگاوی ورد ورد ڕۆیشت بە کەش و فشێکەوە تا چووە سەرتەختی شاهی لە یەکەم ڕۆژدا.

پاش بەجێهێنانی سەلامی شـاهانە یاوەرەکـەی هاتـە گـۆڕێ لـە مەیـدان و وتـی: پادشـا فەرمانی داوە کە گەل بکەوێتە خۆشی و ئاهەنگ و زەماوەند نیازی شـاهانەی وایـە خۆشـترین ژیانیان بۆ دێنمە کایەوەو فەراهەمی دێنم بۆیان، هەرچی چاکە و بەختەوەری بێـت بـۆ ئـەوانی ڕەوا ئەبینم و هەر بۆ ئەوانی ئەخوازم دونیا ئەکەمە بەهەشتێکی گوڵزاری لالە ڕەنگ بۆ گەل.

بەڵێ: دەستکرا بە زەماوەند و هەڵپەرکێ لایەك کچ و ژن تێکەڵ بووبوون لایەکی تریش جـوان و هەرزەکار لاوانی تازە پێگەیشتوو لایێ تریش فەقێکان هەر خۆیان هـەڵ ئەپـەڕین هەنـدێکجار لەسەر دەنگی ئاواز و جار جاریش لەسەر دەنگی شمشاڵ و چوزەلە بێجگە لـە ئـادەمیزاد مـەل و باڵندە و ئاسمانی هێنابووە جۆش و خرۆش لەلایەکی ترە دوو بەدوو بەرانبەر بەیەك گۆرانی و لاوك و حەیران ئەوترا ئەخوێنرایەوە بە شیعر و سۆزی هەمەرەنگ لەلایەن دەنگ خۆشەکانەوە، هەر لـە هەمانکاتدا گۆرانی گاڵتە و گەپ، بەجۆرێکی سەرسوڕهێنەر مەجلیسی هێنابووە فەڕ، بۆ گەشەو جووڵاندنی گوێ گران و بینەران وەختبوو بە پێکەنین خەڵکی بپڕوکێ.

* * *

### باسی جێگا و مەجلیسی پادشا:

باخێکی گەورە تەرخان کرابوو بۆ هاودەم و هانشینی پادشا هەتا نیوەڕۆ بە هیچ جۆر خۆرو هەتاو لێی نەئەدا تەنها مەگەر بەقەد پەنجافلسێك هەوایەکی شنە ئاسـا دەم و چـاوی خـەڵکی ئەخوراند و فێنکی ئەکردەوە بە دارمێو دەوری گیرابوو، دارتووەکان سـەریان یـەك گرتبـوو لـە

کەشکەلانی ئاسمان باوەشیان بەیەکدا ئەکرد سەرەتاتکێیان لەگەڵ ئەستێرەکاندا ئەکرد و دار هەنارەکان بە وێنەی کچان مەمکی هەناریان پێدا هاتبووە خوارێ لە هەندێك جێگەدا گوڵی هەنار سەرو پۆپی دارەکانیان رازاندبووەوە ئەتوت کیژی تازەو نەشمیلەی تازە بزە تێکەوتووە گەرم و گوڕی پیا هەڵچووە، خۆی لە سروشتی خەڵکەکە هەڵ نەبواردووەوە هاژە هاژی چڕی رووبارەکان و جۆگەلەکان، بەم دیو و ئەو دیوی باخەکەدا بە ساردی و خێرایی ئەهاتە خوارێ بە خوڕ ئەتووت عاشقە و تازە هەڵی دەستکەوتووە بچێت بۆ لای دڵداری پەیمان پێ دراو، ئەچێت و دواکەوتووە، پادشا لەسەرووی مەجلیسەوە دانیشتبوو لەسەر کورسییێك چاویلکەی لە چاودا بوو فەرمانی کردن و نەکردنی ئەدا بکوژ و ببڕ دەستەوکەمەر چاوەڕوانی فەرمانی ئەکرد ئەمیش دەماری نەئەهێنا لەگەڵ کەسدا بدوێت یا روو لە کەس بکات ئەی وت خۆم هەم، هەموو شتێکم کەس بە هیچ نازانم.!! دەمە نا دەمێك چایەکی بۆ ئەهێنرا یەك قومی لێ ئەداو بەس جگارەیێکی پاکەتی غازی یا لۆکسیی بۆ دائەگیرسا یەکمژی لێ ئەدا، واتە نەفەسێکی لێ ئەداو فرێی ئەدا، شەربەتێکی دۆشاوی ترێی بە ئاوی رووبی هەنارەوە نۆش ئەکرد بێژەو وشەیەك لەدەمی نەئەهاتە دەرەوە پێکەنینێکی لە دەم و لێوی نەئەبینرا، ئەم هەموو گاڵتە و گەپە، فشقیات و سەیرانە بزەیێکی لە روخساردا دروست نەئەکرد دڵ رەق و بەفیز، بێ بەزەیی مەنگ و ترش و تاڵی مەگەر هەر خۆی بە هۆی بێت، یاوەرێکی هەبوو بۆی دانرابوو لە نهێنیدا سەر بەچینی گەل و بە ئاشکرا پیاوی دەم راستی پادشا بوو زۆر زووبان لووسی چاپووك بوو، رەوانبێژ و زانا، لە وتوووێژا بە توانا، دوانێکی پاراوی ساکار لەگەڵ پادشادا بە زوبانێك ئەدوا، ئەیتوانی بەردی رەق نەرم بکات بەقسەی خۆش و ئاوی زەهر و ناساز دەرخواردی ئادەمیزاد بدات لەگەڵ ئەوەیشا لە ژێرەوە لەگەڵ بەرەی گەل بوو دژی شاو دام دەزگای چەپەڵ بوو بە نهێنی شتە شاراوەکانی ئەگەیاند بە دیموکراتییەکان، بە نوێنەرەکان سروشت و کرداری بۆ گەیاندنی بەو پەڕی تواناوە روونی ئەکردەوە و ئەیزراندەوە بەلەبلەبانی خۆی، بە چاو و بە دەس هێمای ئەکرد، لە تەلی کەوانی خواستەکانی گەلی ئەدا، ئەیزرینگاندەوە لە گوێیاندا دڵی دائەخوریان، حەقیقەتی روون و ئاشکرا ئەکرد بۆ خەڵکی دەس نیشان ئەکرد، دەسگای شاو فەرمانبەرانی وڵات و چڵکاو خۆرەکانی بۆ گەل روت ئەکردەوە ئەوانەی دەسنیشان ئەکرد کە دژی خێر و بەختەوەری نەتەوەن و ئاسوودەگی و خۆشگوزەرانی لە وڵات ئەتارێنن هەرگیزاو هەرگیز رووناکی نابینن، بە چاو و بە دڵ هەرەشی بینن هەر دڵ بە قینن. کە چاو جگەرەو قاوە بۆ پادشا ئەهات: رووی ئەکردە ئەو جەماوەرە و ئەیوت: چونکە خۆی پێوە ماندوو نابێ و ئارەقە ناکات پشتی پێیەوە نایەشێت وەك بە سندان و زەهری ئەوە بێت ماڵی خەڵکی بە سفت

ئەوانی و بە سووکی ئەیخوات، کە چایەکی بۆنەهات، دوو قـوومی لیٚ ئـەدا ئـەی وت تەماشـا بکەن ئەم فیز و دەمارە ئاخۆسکی بـە کـیٚ بـسوتی؟؟ ئەمـە خـویٚنی گەلـە ئەیـمژیٚت و نـۆش ئەکات.... رۆژی یەکەم پەیامی پادشا بلاّوکرایەوە ئەمە دەستووری ولاّت بـوو ئـەبیٚ پـەیرە و بکریٚت پیٚش نیوەڕۆ ئەم نومایش و شتانەمان بینی کرا کەوا دیٚت:

کوریٚکی فەقیٚ بووبوو بە کچ یەکیٚکی تر بووبوو بە دایکی گوایە کـچە خـەوی دیـوە و بـۆ دایکی ئەگیٚریٚتەوە و دایکیشی وەلاّمی ئەداتەوە خەونەکەی بـۆ لیٚـك ئەداتـەوە، واتـە خـەوی دیوە، شووی کردووە بـە کوریٚـك و دراوە پیٚـی و لـە راستیـشدا شـتیٚکی وای لـە خەیالاّیـە و ئەیەویٚت تیٚی بگات شوو چییە و قۆناخەکانی و پیٚویستی ژن و میٚرد چییە؟! کچ ئـەلیٚت دایـە خەونم دیوە دەس پیٚ ئەکات بەم جۆرەی خوارەوە بۆی ئەسیٚنیٚتەوە و لیٚکی ئەداتەوە:

کچ: خەونم دیوە چیم لیٚ دەکەن چیم لیٚ دەکەن.

دایك: یا خوا بیٚت لۆت چا دەکەن لۆت چا دەکەن.

کچ: یەك کوڕم دیت هات بەلاما هات بەلاما دەستی دەبرد لۆ شەمامە لۆ شەمامە.

دایك: هەروا دەکەن هەروا دەبیٚ هەروا دەبیٚ خیٚرو خۆشیت پەیدا دەبیٚ پەیدا دەبیٚ.

کچ: دەستە خوشك کیژی کەرەك کیژی کەرەك تیٚکەلٚ دەبوون بە رەشبەلەك بە رەشبەلەك.

دایك: کاك و بابت خۆشبن لە ناو جاحیٚلان دیٚن دەکەن سلاّو دەکەن سەلاّو.

کچ: ئەریٚ دایە سلاّو چیت بیستووە چیت بیـستووە؟! تـۆیش وەك کیـژان چـیت کـردووە چیت کردوە؟!

دایك: ئەمن و بابت رامان دەبوارد رامان دەبوارد هەرچی ما بە تۆمان سپارد تۆمان سپارد

کچ: وەکی دەلیٚی من وا بکەم من وا بکەم؟ لەگەلٚ کوڕان سەودا بکەم سەودا بکەم

دایك: ئەدی کیژم ناتکەم لۆمە ناتکەم لۆمە؟ دلّداری و حەز پیشەی خۆمە پیشەی خۆمـە ئەتۆش کیژم میٚردی دەکەی میٚردی دەکەی

مالۆچکەیەکی لۆ خۆت دەکەی لۆ خۆت دەکەی.

کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن: چیم لیٚ دەکەن؟! وەك تۆ دەلیٚی لۆ کویٚم دەبەن لۆ کویٚم دەبەن.

دایك: گازی مەلاو کویٚخای دەکەن، کویٚخـای دەکـەن؟! بـەڕیت دەکـەن ئـەمجا مالّـەبڕیت دەکەن، بڕیت دەکەن.

کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن چیم لیٚ دەکەن؟!

دایك: ئەمن و بابت لۆ شار دەبەن لۆ شار دەبەن.

کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن، چیم لیٚ دەکەن.
دایك: زەماوەند و شاییت دەکەن شایت دەکەن.
کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن، چیم لیٚ دەکەن.
دایك: سواری ماینیٚ بۆرەت دەکەن بۆرەت دەکەن؟!
کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن، چیم لیٚ دەکەن؟
دایك: لە بۆ مالّی میٚردت دەبەن میٚردت دەبەن.
کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن، چیم لیٚ دەکەن؟
دایك: شەوی زاوات لە کن دەکەن لەکن دەکەن.
کچ: ئەمجا دایە چیم لیٚ دەکەن، چیم لیٚ دەکەن؟
دایك: بە حەیتەیەکی رازیت دەکەن رازیت دەکەن.

هەر لە دوای ئەو کۆرسە بۆ ماوەی چەند چرکەیەك دەستەیەکی تر هاتە پیٚشەوە بە دوو دارو تەپلّەوە یەکیٚك ئەیوت ئەوانیتر ئەیان سەندەوە، لەسەر ئاواز و چرکەیان، ئەکیٚشرا بە تەپلّەکەدا ناوی گۆرانییەکە جۆلاٚ جۆلاٚیە، گوایە کچیٚك ئەدریٚت بە کابرایەکی جۆلاٚ داوا لە دایکی ئەکات پاش گەز ببنەوە نەیدەن بە کابرای جۆلاٚ، چونکە دلّی پیٚوە نییە.

ئەمەیش گۆرانییە فۆلکلۆرییەکەیە:

دایە مەمدەن بە جۆلاٚ
باوە مەمدەن بە جۆلاٚ
دایە مەمدەن بە جۆلاٚ
رەش و پیسە و ناقۆلاٚ

چاوم کەوت بە کیٚری
کافر نەبیٚ بە ژنی
پیٚچ پیٚچ وەك شاخی نیٚری
دەك قور بەسەری من

جۆلاٚ خۆیو میوانی
جۆلاٚ خۆیو مەکۆکەی
جۆلاٚ داوی بپسیٚ
جۆلاٚ واهات لەولاوا
دایە مەمدەن بە جۆلاٚ
کیٚری رەشە و ناقۆلاٚ
گووم کردە نیٚوچەوانی
گووم کردە سەر سەکۆکەی
وەکی دەلّەك ئەفسیٚ
لەعنەتی وا لە چاوا
بابە مەمدەن بە جۆلاٚ
گونی وەك شوتییە کۆلاٚ

جۆلاّ دلّ پیسەو نابار — لە قسەی خۆی نایێتە خوار
ئەمکوژێ بەقین بەقار — بۆ دکتۆر نامبا بۆ شار
چاوم کەوت بە کێری — پێچ پێچ وەك شاخە نێری
گاور نەکەوتە ژێری — بمرم مۆم نەکا خێری

چاوم کەوتە بەرانی — وەك خەراری سەپانی
ملهور ناکات گەمانی — بمرم نابمە خێزانی

ئەمانەیش رۆیشتن تاقمێکی تر هاتنەکایەوە دوو دوو ئەیان وت گۆرانی بێوەژن:

ئاخ لە بێوەژن داخ لە بێوەژن
داخ لە دەس شێخ ژن ئۆف لە کوێخا ژن
بێوەژن دەڵێ من شوو ناکەم
داك و باب و کەس ریش بە گووناکەم
بەمەکر بێوەژن چویتە سەر داری
هەر لە من دەگری توانج و پەلاری
بێوەژن ئەڵێ ئەڕۆم هەر ئەڕۆم
یەکێ پەیداکەم بۆ شەوچەرەی خۆم
ولاّت تەی ئەکەم تا ئەچمە بازاڕ
یەکێ پەیداکەم مل وەکو هەوجار
لە پێناوی من ماڵ و گیانی خۆی
لەلا هەرزان بێ شەوی هام و شۆی
بێوەژن مەکر و ناز و نووکی ئەو
تەڵە تەقێنە بەرۆژ و بەشەو

ئەمجا کابرایەکی کولەبنەی شایەریان هێنایە پێشەوە کە گوایە بەیتی دەولەمەندی رەزیـل و پیسکە بلێ، ئەویش جوان هات بە تانوپۆی پیاوی رەزیل و پیسکەدا، ئەوەی ئەیوت دووبـارەی نەئەکردەوە: ئەوانیش دەستی شاییان گرت:

خزمینە گوێم لێ بگرن — هەستن دەستانیش بگرن

رەزیلێکم بۆ بێنن لەگەڵ سەگی رابگرن
هاوملی بەرازی کەن بەتف بە شەق رازی کەن
قەت رەحمانی پێ مەکەن وەك گول لە دیی دەربکەن
رەزیل وەکی ولاخە بێ نرخە بێ دەماغە
ئەگەر نانێکی بخورێ لۆ خۆی لە داخا دەمرێ
خێرو ئیحسانی ناکا فلسێ بەبابی نادا
تا بلێن پیاوی خوایە دائیم لە مزگەوتایە
سەد فاتحە و سەلاوات بە ریاو بە درۆ لێ دەدات
پشتی مەلا بەرنادا عز و ناموس بەلادا
ئەچێ بۆ خزمەتی شێخ مل ناکا لە مار و مێخ
ماڵی دزی حەل دەکا قووتی دەدا وەك حەلوا
زەکات و شیربایی خۆر بە مێرد دەدا کچ بەزۆر
سیواك و مێزەری پان بەرماڵ ئەپێچێ لەشان
تەسبیح درێژ سەد دانە دزی بۆ کلکە وانە
پێست و خوری مرداری ئەو ئەفرۆشێ لە شاری
گەوادی شێخ و بەگلەر ماکو هەوێنی سەد شەڕ
جاسووس و پیس و بەدکار خۆیشی نابینێ یەکجار
ماڵ و منداڵی بێ تووك روت و قوت برسی مەهنوك
بەخوا هەرکەس وەهایە هەرگیز نەیێ لەکایە

پاش نیوەڕۆ {راوێژگەر} هاتەوە رووی مەیدان رۆیشتە سەر بەرزاییێك لەبەردەم شاوە رووی کردە گوێگران وتی بەناوی پادشاوە بۆتان ئەدوێم و گوێم لێ بگرن:

خەڵکینە: بەناوی خوای میهرەبان، ئێمە کە شاری ولاتی کوردەوارین ئەم سفاریشە رائەگەینین بە گەورەو بچووك تکامان وایە هەموو لایەك پەسندی بکات و پەیڕەو بکرێت.

١. ئەبێ داد و دادگاو پەرەپێدانی و بەراورد کردنی پێویستی سەرشانی گشت کوردێك بێت دوور بێت لە دەستێوەردانی ئەم و ئەو.

٢. پادشایش بەرپرسیارە لە کار و فەرمانی خۆی و سەرۆك و بەڕێوەبەرانی ولات و زیادەرۆیشتنی خودی شا ئەبێتە هۆی بەر کەناری و بردنی بۆ بەردەمی دادگا، و هەرچیشی

هەبێ لە دارایی و پارەو پوول لە ئێستاوە دەستی بەسەرا ئەگیرێت و مولکی دەوڵەتە بۆ ئەوەی لە سنووری خۆیدا خەرج بکات و زیادەی نەبێ ملك و ماڵ پێکەوە بنێت و خانەوادەکەیشی وەها ئەبێ.

٣. خوێندن و خوێنەواری مولکی گەلە و ئەبێ سەرجەمی خوێنەوار بێت بە خۆرایی.

٤. ئافرەت تەنها لە فێرگە و پزیشکیدا وەرئەگیرێن و رۆڵی خۆیان ئەبینن بە جل و بەرگی پۆشاکی کوردایەتییەوە.

٥. میری بەرپرسیارە لە دروستکردنی خێزان و ژن هێنان و بەشوودان بەرەزامەندی هەردوولا و یاسا ئەیبڕێتەوە لە سەرانسەری وڵاتا.

٦. زەوی و زار بە گشتی مولکی دەوڵەتە، وەی ئەو کەسە ئەبێ بیهێنێتە بەرهەم، وچەوسانەوە بە هیچ جۆرێك نییە و نابێ: گەل گشتیان یەکسانن و بەرێزن لە بەرانبەری یاسادا و گەل بۆی هەیە رەخنە بگرێت لە بالاترین کارگێڕ دەوڵەت بەرپرسیارە لە کار دۆزینەوە بۆ بێ کارو بێ ئیش و بۆ نیشتەجێکردنی ئەوانەی بێ خان و بەرەن لە یەکەم رۆژی دروستکردنی خێزانەوە.

٧. بەبێ رۆژانی هەینی و جەژن تەنها دوو رۆژ هەیە بۆ شاهەنگێڕانی گشتی، نەورۆزو رۆژی سەرکەوتنی شۆڕشی گەل ئەویتر بە وتارێکی یادکردنەوە لە دوای نیوەڕۆ کۆتایی پێ دێت.

٨. بیرو باوەڕ بلاوکردنەوە رەوایە بۆ دیراسە و وانەکردن و رۆشنبیری کردن لە زانستگاکاندا و بۆ نوێنەری گشت کۆڕ و کۆمەڵێك هەیە بێتە مەیدانی وتووێژکردن لە گەڵمان بۆ وەرگرتنی بیروڕای پەسندیان و بۆ چارەسەری گیروگرفتی وڵات.

٩. تەکیە و خاناقا ئەکرێن بە مزگەوت یا بە قوتابخانە و خاوەنەکانیان ئەخرێنە کار بۆ کارکردن و بەخێوکردنی ماڵ و خێزانی خۆیان، لە عیلم و زانیاری بەولاوە تێکۆشین قەدەغەیە بە کۆمەڵ.

١٠. چاوپۆشی ناکرێت لە بستێك زەوی نیشتیمان بە پێی جوغرافیا و مێژووی کۆن، بێ گوێدانە جیاوازی ئایینی و مەزهەبی. هەموو کوردێك بۆی هەیە بگەڕێتەوە وڵاتی کوردستانی خۆی، تا بەشداری بکات لە جێگیرکردنی نەتەوایەتی کوردی و دامەزراندنی و چەسپانی رژێمی دادپەروەری نموونەیی کوردایەتی و ئەبێ گشت نیشتەجێکی تا کورد بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی پشتی سنووری کوردستان مەگەر هاوکاری و بەشداری کردبێت لە شۆڕشی دادپەروەری نەتەوایەتیمان و برایەتی سەلماندبێ بە کردەوە لەگەڵمان.

١١. دۆستی هەموو گەلێکین بەتایبەتی گەلە ئیسلامەکان و بەبرای خۆمانی ئەزانین ئەگەر دۆستایەتیمان بکەن.

١٢. ئایینـەکانی ئاسمـانی لامـان پـیرۆزە و رێـزی لێ ئـەگرین نـەك کوێرانـە، دروشمـی ئێمە دادپەروەرییە.

١٣. پەرلەمان بە هەڵبژاردنی ئازاد ئەبێ بە پێی یاساو بەرپرسیاریشە هـەر یەکـەیان لـە ئـێش و ئـازار کۆڵینـەوەی یەکـە یەکـەی گـەل و رەخنـە گەیانـدنی گـەل بـە دەوڵـەت و ئاگادارکردنەوەی مەجلیسی پەرلەمان و بنکەیەکی سەربەخۆ ئەبێت لە ناو گەلدا تا چوار ساڵ

١٤. خواردنەوەی سەرخۆشی، گشت جۆرەکانی قومـار، جاسووسـی بێگانـە، زینـاکردن و لیوات، کوشتنی ئەنقەست، دزی کردن سەنگو تەرازو گـۆڕین تـا چـوار سـاڵ پاداشـتی تـەنها هەڵواسینە و مل قرتاندن.

ئەمەیە کاری دەوڵەت لە رۆژێکی تەنگی وەکو ئیمرۆمان لەشەوی یەکەمدا، گەنج و لاوو جوان دەستیان کرد بە شایی و هەڵپەرکێ لە سێچوارلاوە ئەمجا مەجلیس رازایەوە بە گـۆرانی و حەیران و لاووك، ئەمە لە کاتێکـدا وابـوو کـە پادشـا بـەرگی مەلایـەتی ئاسـایی خـۆی لەبەرکردبوو هەر تەنها ئاهەنگ بـوو پاشـان دەسـتکرا بـە گێڕانـەوەی چیرۆك و مەتـەڵ و سەربووردی کوردان، لە هی خۆماڵی و هەندەران تا شەو راشکاو ئەستێرەکانیش وەکـو ئـەم حەشاماتە چاویان چووە خەو.

بۆ رۆژی دوایی کە بەیانی گزنگی دا: هەر کەس لە خەو رابوو بە نوێژەوە خـەریکبوون و بەرچاییان خوارد، دیسان جەنابی مەلایان کردەوە بە پادشا، هەروایش وەزیر و کاربەدەسـتان و بەرنامە پێشکەشکەر بە خۆیان و یاساوەڵەکانەوە کەوتنە رێگا بە سـروودی نیـشتیمانی و چەپڵە لێدان بەرەو گۆرەپانی دوێنێی رابووردو ئینسان سامی لێ ئەنیشت لە شـان و شـکۆی پادشای کوردان، هەر دڵێك سەد ئاواتی ئەخواست ئەیان وت کاشـکی ئـەم درۆیـە بەراسـت بگەڕایە کە ئەتبینی ئەم جەماوەرە بەم زۆرییە ملکەچی ئەم دام و دەزگایەیە کەس دەنگـی سەرپێچی لێوە نایەت.

بەڵام بە جۆرێکی ترو رەنگ و روخسارێکی گرژ و مۆن پادشا دانیشت و یاوەر دەستی کرد بە دواندن لەسەر پێو و شوێنی دوو روویی خۆی، رووێکی لەگـەڵ پادشـاو دام و دەزگایـەتی ئـەویتر لەگەڵ بەرەی گەلدا بوو گوایە دڵسۆزی گەلە و بەرژەوەندی گەلی مەبەستە. جگەرەیەکی داگیرسان بۆ پادشا قومێکی لێدا یان دوومژ بە فیزێکـەوە فرێیـدا، بـەڵام بەدەسـتی راوێـژکار وتـی پێـی

ناخوریت تەماشاکەن یەشتا جگەرەکە هەرتەواوە باوکم حەقیەتی خۆ حەمالّی نەکردووە؟ بەرەنجی شان بیکریت دەك لەبەر بینی گیر بێت و نیشانی خەلکەکەی ئەدا چای داواکرد، بۆی هێنا دوو قومی لێدا پیالّەکەی هەلگرت یەشتا سێبەشی تیامابوو رووی کردە جەماوەر ئەمە پادشایە وا ئەژیت کێ هەیە دەنگ بکات دەك بە زەهری بێت کەی ئەمە چای خواردنە؟!

پادشا پارچەیەك کاغەزی دەرهێناو دای بەراوێژکار بۆ خەلکی بخوێنێتەوە ئیتر بێ ئەوەی پرسیار بکات لە پیاوانی دەولّەت و کاربەدەستان و وەزیرەکان ئەمیش وەریگرت هاتە ناو جەماوەرەکەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی:

وتار خوێن وتی: پادشا فەرمانیداوە ئەم راگەیدیانە بۆ گەلی کورد بخوێنرێتەوە ئەلّێت ئێمە کە پادشای ولاّتی کوردەوارین ئەم راگەیدنەمان مۆر کرد.

١. بۆ دامەزراندن و جێگیربوونی ئاسایش لە ولاّتا پێویستە گەل هۆشیار بێت، ئەو پێنووسەی لە دژی ئێمە بنووسێت ئەشکێنرێت ئەو چاوەی حەق ببینێ هەلّی ئەکۆلّین و دەری ئەهێنین ئەو گوێیەی راستی ببیستێ کەڕ ئەکرێت، بە قورقوشم پڕ ئەکرێتەوە ئەو زوبانەی راستی بلّێت و بدوێت لەبن قت ئەکرێت و ئەبڕێت ئەو مێشك و دەماغەی بیری سەر پێچی و یاخی گەری بکات: ئەی پژێنین و لە لەشی جیا ئەکرێتەوە سەربەستی درۆیە لە دونیادا نییە ئەبێ پێشێل بکرێت داری ئازادی لەبن ئەبڕم نووسەر و رۆشنبیر جێگەیان بەندیخانەیە سەری بەرز و گەرم سارد و نەوی ئەکەم ملی پێ شۆر ئەکەم و دای ئەنوێنم، گۆرانی سرود بێجگە لە خۆم و دام و دەسگای شایەتی، تاوانی بێ لێخۆشبوونە میهرەبانی و دلّسۆزی درۆیە تەونی بێ پۆیە، بێ تاوان ئەلکێنم بە تاواندارا، ئاسمانی هیوا بە خوێنی گەل ئەنەخشێنم زیندوو بە مردوو مۆر ئەکەم، هەرچی خۆمان نەیبەخشین کەس خاوەنی شت نییە دەستی سیخور و پۆلیسم بەرەلّلاّ کردووە مافی خۆیانە هەرچی بکەن بێ پرسینەوەیە.

٢. لەباتی ئەم مەجلیس و وزەرایانە کۆمەلّێك دانراوە کە پیاوی دلّسۆزی خۆمانە و هەرچیم بوێ بۆمانی ئەکەن یاسا بە پێی بەرژەوەندی رۆژانە دەسکاری ئەکرێت هەرچی بگونجێ لەگەلّ باوەڕی ئێمە ئەوە جێگیر ئەکرێت کەس خۆی بە چاك و بی لایەن نەزانی، زوبانی لە پشت ملیەوە دەردێنم. حەقی پێ ئەسەلمێنم خێزان و خزم و خوێشێك لە تاوانی یەکێکدا زیندە بە چالّ ئەکەم.

٣. ئەوا بڕیارماندا لە ئێستاوە دادگای کاتی بکەوێتە کارەوە بۆ پاکودانی ئەو مێشکانەی وەکو کالّەکی بلّیان لێهاتووە با لەلەش بکرێنەوە، و سەرمایەدارەکان بخرێنە بەر جەریمەوە بودجەی دەولّەت پیر بکرێتەوە بەوان.

٤. ئاغا و دەوڵەمەند و پارەدارەکان هەروەك خۆیان ئەمێننەوە تا یاسایان بۆ تێبینی ئەکرێت.

٥. هەموو کەسێك ئەبێ ناوی ئێمە بنووسێت و هەڵی بگرێت بۆ پیرۆزی و ئەبێ رۆژی پێنج جار لە مزگەوتا دوعام بۆ بکەن و بپارێنەوە دروشمی ئێمە وەکو نوێژ فەرزە.

٦. هەموو شت گومرگ و دەیەکی لەسەرە، ئەبێ بدرێت.

٧. خۆمان ئەزانین چۆن وڵات بەرێوە ئەبەین کەس مافی رەخنە سازی نییە و پێویستمان بە رێگە پێشاندان نییە لەلایەن کەسەوە.

هەر لە ئێستاوە ئەم یاسا کاتییە جێ بەجێ ئەکرێت بێ چەند و چوون.

ئەمجا (یاوەر) وانە راوێژکار رووی کردە خەڵکە وتی ئێوەش خۆتان ئامادەبکەن بۆ رۆژی رەش، ژیانی تاڵ هیوای قەرەم خوێن و بەندیخانە، قورپێوان ئەمەیە شای ئاخرزەمان. خوادەستی نەدا، ئەگەر ئێوەیش سەری خۆتان شۆر بکەن خۆی ئەکات بە بت و ئەبێ کڕنووشی بۆ بەرن، و رزگاربوونتان نییە بە فریای خۆتان بکەون، تا تۆزێ نەرەویوەتەوە کۆر و کۆمەڵە و گروپ بۆ خۆتان بنیاتبنێن ئەگینا مەرگ چاوەرێتانە، نامووس و شەرەفتان پایە ماڵ ئەکات، بنکە و بارەگای شاخەکان جێ مەهێڵن تێکی مەدەن با پەرەبسێنێ یەشتا قاڵی سەربەستی و ئازادی نەبوون ئەگەر قازی مهابادی وای بکردایە ئاخەکانی چۆڵ نەکردایە، شای ئێران ئەو ئازادیخوازانەی کوردیانی بە دارانەئەکرد، ئێمە رێگەمان یەجگار دووره ئەبێ خائنانی ناو خۆو چلکاو خۆرەکان گەمارۆ بدرێن و پەرووباڵ بکرێن. ئەمجا هاتەوە خزمەت پادشا وتی قوربان فەرمایشتان راگەیەنرا و لەلایەن گەلەوە پەسندکرا و گەل بەگوێدا درا راست ئەفەرموون جەنابتان ئەم رەش و رووتانە بۆ خزمەتکاری نەبێ بە کەڵك هیچ نایەن هەرچی سەری ببزوێت ملی بقرتێنە ئەمجا قاپی دادگا کرایە، داوەرەکان کەوتنە نوێژکردن کە چۆن برۆن لەگەڵ مەرام و ئارەزووی پادشاو قبووڵیان کرد ئەمانە هەموو شتێك ئەکەن لە پێناو مانەوەی خۆیاندا.

١. یەکێکیان هێنایە پای دادگا تاوانی نەکردبوو تەنها ئەوەندە نەبێ لووتی گەورەو فش بوو لەواشەیێکیان دا لە لووت و قەپۆزی هاوارو باوکەرۆی ئەگەیشتە ئاسمانی بەرین ناچار دینارێکی جەزا داو بەرەڵلا کرا.

٢. یەکێتریان هێنا قۆچ و درێژ بوو دایان بە ئەرزاو رایان کێشا مشاریان هێنا قاچی ببرنەوە هاوار و پاڕانەوە بێ کەڵك بوو (٢) دیناریان جەریمە کرد.

کابرایەکی نەخۆشیان هێنا گوایە هەم دزەو هەم نەخۆشە ئەبێ چاکبکرێتەوە و مەحکەمە بکرێت رایان کێشاو چاك پشکنیان دکتۆر وتی تاو لەرزی پێستی قەرسە قولێکیان لە ماست هەڵکێشا خستیانە دەمیەوە و بە جامانەکەی توند شەتەکیان داو نیو دیناریان جەریمە کرد

یەکیتریان هێنا بە پاڵپەستۆی سیخورەکان و پۆلیسی تایبەتی تاواندۆزەرەوە کە گوایە لە دژی میری دواوە سەرۆکی دادگا لێی پرسی گوێتان لێ بوو قسە بکات لە دژی رژێم؟! هەموو پێکرا وتیان ئەشهەدوو...... وتوویە رۆژێکی هەڕاپە ئاخرزەمانە مەبەستی ئەم پادشایە بووە کابرایش هاواری ئەکرد قوربان من لەسەر کێلکەی خۆم دابووم بە تەنها، کاتێکم زانیوە منیان راپێچ کرد بۆ ئێرە هیچم نەوتووە. حاکم ئەمری کرد بیکەن بە دارا بۆ چاو شکاندنی خەڵکی تر.

دارتوویەکی بەرز لەوێدا بوو، دووپەتی پیا هەڵخرابوو ملی کابرایان پیاکرد لاشەی هاتوو چۆی ئەکرد بە ئاسمانەوە ئەمجا (٥) دینار لە خزم و کەسی کابرایان سەند بە تاوانی ئەو، پاش سەعاتێك دایانگرت. سەیر ئەوەبوو قەرارو بڕیاری حوکم راوێژکار ئەیخوێندەوە و گشت جارێك لە چەپڵە ئەدرا بژی پادشای کوردان ئەمەیە دادپەروەری!!

❖ یاساوڵ و سیخورەکان جوولەکەیەکیان پەت کردبوو بە دوای کەرێکەوە کێشیان کردوو هێنایان هاواری ئەکرد بەخودا بە مووسا پێغەمبەر، بە عیسا، بە محمد، هیچی خەراپم نەکردووە تەنها بارەکەم لە گوێدرێژەکەم بارکردووە و سوواری بووم ئاگام لە هیچ شتێك نییە داوەر: وتی ئاخر بێ ئاگاداری میری کڕین و فرۆشتن ئەکەیت، و جەریمەیەکی گەورەیشت کردووە کە سواری ئەو کەرە ئەبێ و باری گرانی لێ ئەنێیت ئەمیش وتی ئاخر خۆ ئێوە ئەم مەبەستەتان بلاۆنەکردۆتەوە من لە خۆمەوە بێم داوای چی بکەم؟! حاکم وتی دیارە ئەمانە هەر دەم درێژن دوو رێگا هەیە یا ئەبێ (٣) دینار جەریمە بدەیت یا ئەبێ ئەو کەرە لەبەر چاوی ئەم حەشامەتە بگێیت وتی سزای خۆم ئەدەم وتیان ئەبێ بەرەودوا سواری کەرەکە بکرێت تا ئەچێتەوە و دوعای خێریش بۆ پادشا بکات.

❖ هەر لە ناکاو: یاوەری راوێژکار سەری نایە بنگوێی پادشا هاتە دواوە وتی پادشا ئەمر ئەفەرموویێت کە گشت مەلاکان خەڵات بکرێن سەر و هەنارێکیان بدرێتێ، پاشان دوو دوو سەریان رووت بکەن و پشت بدەن بەیەکەوە وەکو راستی قسە لەگەڵ یەکبکەن نیو سەعات پاشان ئەبێ فتوا بدەن هەرچی پادشا ئەیکات راستەوخۆ پێی خۆشەو جێ نشینی پێغەمبەرە هەرکەس لە فەرمانی پادشا لابدات کافر ئەبێت ئەبێ سزا بدرێت بە بەند کردن و سزادانی بە پارەو خنکاندنی بەڵێ زۆر بە دڵفرەوانییەوە ئەمری پادشا پەسندکراو ئەنجامدرا.

❖ ئەمری کردەوە دووبارە ئەبێ پیاو ماقوولاّن خەڵات بکرێن هەریەکی قەرسەقولێکی دابوون بەدەستەوە گوایە ئەمە قەلنەی پادشایەو خەلاّتی ئەمانە پاشان ئەبێ هەرکەس بەخۆی و خێڵەکەیەوە ناونووس بکرێت ببێت بە پیاوی میری و بەرگری لەو رژێمە بکەن بە

مانگانەی دینارێك هەرچی نەیکرد ئەبێ سزای دەرکردنی بێ لە ولات دەبێ بە شبێت لە کارو فەرمان و بگوێزرێتەوە و ئەبێ هەر دەسبەجێ مۆریش بکات ئەگەر نەیکات بە فتوای ئەو عالمانە کافریش ئەبن خەلکی بمرێت پادشا بژیت پەرستگا ئەبێتە بتخانە، رەسمی شای تیا ئەپرسرێت. هەر ساتە نا ساتێك یاوەر ئەیکرد بە قالـە و گالـە و ئـەیوت ئەمەیـە رژێـم و عەدالەت دەك خوا وەریگێرێت تەخت و بەختی وەرگـەرێت مـالّ و منـدالّی ببـێ بـە کـۆی زووخالّ، خوا سەگی گولی بکات و خـوێری بێـت و تـرۆ بێـت، سـەیری بکـەن ئـا ئەمەیـە نەوشێرەوانی کوردستانی ئێمە، ئەمەیە رووی مێژووی کاربەدەستانی جیهانی سپی کـردووە، ماشاالله گورگ و مەڕ بەیەکەوە ئاو ئەخۆنەوە،

❖ ئەمجا خوێنەوارێك هات شیعرێکی بۆ پادشا خوێندەوە، ئەمری فەرموو (١٠) دیناری بدەنێ لە پاداشتی بەهرەی شیعرەکەی و ئەبێ (٢٠) دیناریشی لێ بسێنێ کە بۆچـی سوپاسـی ئێمەی تیا نەکردەوە:

لەسەر لوتکەی بلندی پیرەمەگروون — وەکو قەندیل و ئاکۆ دێنەدەرەوە
ئەبیسم نالە نالّ و شینی گەردوون — کە چەخماخە و تریشقەی تۆف و بەفرە
ئەبارێنێ تەمومژ رۆژ و شەو خەم — لە بۆ کوردی ستەمدیدە هەموو دەم
دەبا بولبول بپێوی قوڕ لە چیمەن — گولّی هیوا وەری ئێستا لە گولشەن
فریشتەی کورد هەمووی دێو و درنجە — بەگ و میریش لە ئێمەی کورد بەداغە
لەبێ ئیحساسییە وادیلی زنجە — دلّی زانا خەفەتبار و نەساغە
ئەبوو ریغال بە خائین دەرچوو ناوی — نەدەی زۆرە لە میکرۆبی گلاوی
وەکو تانجی ئەکەن راوی من و تۆ — وەکو زاری قومار بێ بارو بێ بوو
یەکێ گرت زۆلّ و خوێنرێژی جیهانی — لەگەلّ شێخ و بەگ و میر بە نیهائی
بە وێنەی داری ژالا زەهر و تالّی — هەموو میللەت فرۆش و قنگ بە فالّن
کە قازی هەلوەری خنکا حەیاتی — لە چلّ داکەوت گولّی رەنج و خەباتی
ئیتر کوردیش ئەبێ بڕوای بگۆڕێ — لەگەلّ دوژمن بجەنگێت و نەدۆڕێ
لە ئێراندا کەوا من کوردم بینی — خیانەت مەسنەدی عز و بەقایە
ئەلێم ئەندازە بۆ شا مەرگ و ژینی — هەلّستن نیوەرۆ وا وەختی چایە
کەچی ئێمەیش گوناهبار و خەریکین — لە بۆ یەکتر کوشندە و هەم تەریکین
کەلاکی کورد ئەوا غەربی غەنی کرد — ئەمیش وا هات بە ناپاکی شەنی کرد

ئیتر فەرمانگـە داخـرا، مەحکەمـە هـەڵگیرا، جەریـمە دواخـرا، دەسـتی زەماوەنـد و هەڵپەرکێ گیرایەوە تا شەو

❖ بەیانی ڕۆژی سێیەم کە گزنگی خۆر کەوتن دونیای روون کـردەوە قـاوەڵتی کـرا، وەکـو ڕۆژانی رابوردوو مەلا کرایەوە بە پادشا، هەرکـەس پۆشـاکی تایبـەتی پۆشـی بـەرەو گۆڕەپـانی سەیران و ئاهەنگ و جەریمە بە چەپڵە ڕێزان و چووزەلە و زورنا کەوتنە ڕێگا بەروو دوای پادشا بە یاساوڵ گیرا و هەر کەس لەسەر جێگەی تایبەتی خۆی بوو بە بزماری داکوتراو هەناسـەی لێـبڕا، پاوەر لە باتی پادشا و وەزیران سەلاَوی لە جەماوەر کردەوە وە رووی تێکردن و وتی ئەگەر ئەم دام و دەسگایە بەرقەرار بێت سزای ئـەژدادو بـاوك و بـاپیرانی رابـووردوویش لـە ئێـوە ئەسـێنێت و زەهراوی تاڵیش بەدەمتانا ئـەکات ڕۆژی فریاکەوتنـە هـا بـزانن!! بەچـاوی خۆتـان دوو پـەردەی ڕژێمکاریتان بینی هەریەك بە پێ و دانگی خۆی قور بەسەر ئەوەی تـێ ناگـات و چـڵکاو خـۆری ڕژێمێك بێت، بە ڕاستەوخۆ و بە ئاراستەوخۆ هەر بەشی لەناوچوونە، ئەبێ بۆ خۆی دابنێ دەویـتن و سەرشۆری دین و دونیا ڕوورەشی بەردەمی گەل، وا ئێستا دەس ئەکرێت بە محاکمە کردنی تـاوان دارانی بیانوو پێ گیراو... محکمە: داد هەی داد.... فـەریاد هـەی فـەریاد، بـە غـەیری خۆمـان دەنگمان بەکەس ناگات،،،، پادشا ئـەمری کـرد بەسـزادانی پیـاو مـاقوولاَن و جەریمـە کردنیـان هەندێکیان ببەسرێنەوە لەبەر هەتاودا و هەندێکیان لە گەورە پیاوان دوو داری فەلاقەبخرێتـە ژێـر چەناگەیان و بێ چاوتوورکاندن بڕوانن بە خۆردا.. گشتیان هاواریان لێ رابوو بە ناچاری بەسـەرانە رازی بوون یەکی (٥) دیناری ئەو وەختە ئاغایەك سەرپێچی کرد ویـستی نەیـدا ملیـان کـرد بـە سێدارەدا، بەو دارەتووەی کە پەتی پیاهەڵواسرابوو ئاغاکـان لـە نـاو خۆیـان ڕێککـەوتن بۆیانـدا پیاوێکی ئاغای رەزیل هەبوو، گۆیەندێکیان بۆ نایەوە پیرەژنێك هات بۆ پای دادی پادشای وەخـت هاواری کرد فلاَن هاتووە سەر جێگاکەی دەسبەجێ بەندکراو هێنرایە بەردەمی داوەران فەرمانـدرا بی پشکنێت پزیشك، ئەویش وتی تووشی سووزەنك بووە، تەنەکەیەك خۆڵەمێش و دۆیـان کـردە دەمەڵ قوپانەکەی و ئەشبێت دەسبکاتە ملی سەگ لەبـەر چـاوی خـەڵکی (١٠) دینـاریش سـزا بدات و (٣) مانگیش ئاوارە بکرێت لە ماڵ و خێزان داببرێت

* * *

پیاوێك لەو خۆشناوەتییە تفەنگێکی پڕ لە فیشەکی پێ ئەبێ تووشی جوولەکەیـەکی ریـش درێژ ئەبێ لە دەشتێکی چۆڵدا هەست ئەکات ئاوەدانی لێ نییە، تفەنگ لەسەر سینگی جـووە قایم ئەکات و ئەڵێت کافر: موسڵمان بە.. ئەویش ئەترسێت و ئەڵێت: بە قوربانت بم بڵێم چی؟!

ئەڵێت ها واللە ئەز هەم نزانم سەگباب بڕۆ پاشان موسوڵمان بە!!! جوولەکە هات شکاتی لێکرد، کابرایان گرت و هێنایان بۆ دادگا پرسیار: بۆچی ویستت موسوڵمانی بکەیت؟! وەڵام: چونکە جوولەکە ماك و میقرۆبی فیتنە و شەڕن لە جیهاندا ئەی بۆ ویستت بیکوژیت؟! خۆ ئەم کوشتووە نەء نیاوت کردووە؟! وانییە؟! چونکە ئاغا منی نارد روتی بکەمەوە بە زۆردانی پیانا لەسەر ئاغایەك ئەویش گیراو بە پارە تاوانباری لە کۆڵ کەوت ئەمجا بە کابرایان وت: بۆچی نەتزانی ڕێگای مووسڵمانی نیشان بدەیت؟! وتی خەتای باوکم بوو وتیان باوکی بگرن، باوکیان بانگ کرد بۆچی کوڕەکەی خۆتت فێری مووسڵمانی نەکردووە؟! وتی خەتای مەلا بوو؟ مەلایان گرت ئەویش وتی خەتای دایکی بوو وتیان بۆچی؟! وتی چونکە قەول وابوو من بیخوازم شووی پێ نەکردم دایکیان هێنا لێیان پرسی بۆچی شوت بەم مەلایە نەکردووە؟! وتی خەتای کوری خزمەتکاری میربوو هەڕەشەی لێکردم گوایە ئەیویست ئەو داخوازیم بکات و بمخوازێت ئەویشیان هێنا لێیان پرسی بۆچی نەتخواست؟! چونکە کوڕی میر دڵی پێوەبوو ئەویشیان هێناو لێیان پرسی بۆچی دەستی ئەم ژنەت بڕی و نەتخواست و نەتهێشت شوو بکات؟! چونکە لە ژوانێدا راویان نام و بازم داو قاچم شکا ئەی خەتای چی بوو؟! وتی خەتای تاوانی وەستاو بەنابوو وتیان بڕۆن شاگردو وەستا بێنن بۆ دادگا وتیان وەستا مردووە پادشا ئەمری کرد هەرچی وەستاو شاگرد هەیە لە ناوچەکە لەگەڵ ئەمانە گشتیان جەریمە بکەن و سەرانەیان لێ بسێنن، جوولەکەی سەگبابیش بەشەق موسوڵمان بکەن و (٧) جار لە حەوزی هەڵکێشن.

❖ کابرایەکیان گرت و هێنایان بۆ دادگا بە بەرچاوی پادشاوە گوایە تاوانی ئەوەیە دانەکانی زل و شاشن شایەنی ئەوەیە سزا بدرێت پزیشك بڕیاریدا دانەکانی هەڵکێشن هاواری مەحکەمەی کرد، وەڵامیان دایە: دیارە ئەمە دەم درێژی زۆر ئەکات، نەبادا میکرۆبی دیانی ئەم بچێت بۆیەکی ترو ببێت بەدرم، دکتۆر ئەبێ چاکتر دەس دابگرێت هێنایان پەپکەکەیەك لە دۆشاو و ماست دروستبکرێت و بگیرێتەوە سەری و دانەکانیشی دەربێنێ گازو چەکوشیان هێنا نیخە نیخ،، خەریکبوون دەریکێشن ئەویش بەسزادان رزگاری بوو.

❖ کابرایەکیان هێنا چاوێکی ئەیەشا نەختێ خۆییان کردە چاوەکەی تریش گوایە لارە سەنگ بووە ئەمجا چاك ئەبێتەوە.. بەم جۆرە هەزاران تاوانبار کرا، وسەرانەی لێ سەندرا و ناوبەناویش هەرچی شتی زۆر سەیر و قۆڕ بوو ئەوتراو ئەکرا، و کابرای یاوەریش راوێژکارو بەرپرسیار "تعلیق" پیاهەڵدان و پیا وتی بە مەعناو بەهێما چەسپی بۆشایی هەڵوێستەکانی ئەکرد، بانگی ئەکرد قەومی مووسا دەنگم نووسا، راچەنینێ راپەرینی دونیا چاوی کردەوە

گەوی لە خەڵك بردەوە. کاتێك ڕۆژ داشکا گەیشتە عەسر و ئێوارە نزیك ببووەوە جەماهیر گشتیان یەکیان گرتبوو بە بانگی بەرز بەرەو گۆڕەپانی پادشا هاتن تەخت و بەختی پادشایان وەرگێڕا، پادشاو پیاوەکانی بە قۆڵ بەسراوی ڕاپێچ کرد، لە مزگەوتیان توند کرد ئیتر دەنگی سزاو تاوانی بێ جێ مرد هاتینەوە سەر بەزمەکەی جارانی کورد.

الحمد لله: ئەمڕۆ ئیجازە ئەخوێنرێتەوە فەقێمانکرد بە مەلا پارەیەکی زۆرمان بۆ پەیاکرد، ماڵ و حاڵمان بۆ پێکەوە نا، ئیتر هەر کەس بلاوەی لێکرد کۆڵێك سەربووردی جوانی لەگەڵ خۆی برد بەرگی پۆلیسمان داوە کزەڵ بە کزەڵی ماوە ئەم بەسەرهاتەی جێماوە..

❋ ❋ ❋

## نووستنی موگناتیس:

جارێکیان منی کزەڵ لە خزمەت مامۆستای گەورە و بەڕێز مامۆستا (مەلا کەریم) دانیشتبووم لە بارەی زانیاری خەوتنی موگناتیسییەوە ئەدوام و کەلکی ئەم زانیارییەم باس ئەکرد کە لە ولاتە پێشکەوتووەکان بە کاری دێنن بۆ زۆر شتی بە کەڵك و پشکنینی نهێنییەکان و مەبەستی نیشتەگەری (جراحی) لە بیمارخانەکاندا گەورەترین نەشتەرگەری پێ ئەکەن، تا دەرمانی سڕ کردن بەکارنەهێنن و بێهۆشی بخەن و زۆر زۆر شتی وا گرینگ هەروا لە مێژوودا شتێکی وا لە حەزرەتی عەلی ئەگێرنەوە کە گوایە سەرەتیرێك لە جەنگا ئەچەقێت بە پاڵوویدا و زۆر بە ئازار ئەبێت هەرچەند هەوڵئەدەن ناوێرن دەری بێنن ئەویش ئەفەرمووێت با کاتی نوێژ بێت کە نوێژم دابەست ئەو کاتە دەری بێنن ئەو کاتە دەری ئەهێنین ئەمە بە زاراوەی (إصطلاح)ی موگناتیسی زاناکان پێی ئەڵێن لەش جێهێشتن {الطرح الجسمی} واتە ڕۆحەکە لەشی جێ دێڵێ و ئەمانیش کاری خۆیان ئەکەن... مامۆستای بەڕێز بەلایەوە پەسند بوو ئەم زانیارییە ئەگەر لێهاتوو بیزانی و بیکات و بۆ چاکە بەکاربێت، فەرمووی شێخ علاءالدین بیارە چەند جارێکی بۆ گێڕاومەتەوە کە حەزرەتی شێخ ضیاءالدین - ی باوکی:

جارێك ڕێگەی ئەکەوێتە دێیەك لەوبەری شارەزوورە لای مریدەکانی خۆی، سەری لە دۆستەکانی خۆی هەمیشە داوە، یەکێك لە مریدەکان هێسترێکی چەمووشی ئەبێت زۆر شێت و بەدرەفتار ئەبێت کابرا لای وا ئەبێت ئەگەر شێخ سواری ببێت نەختێك ئیتر چاك ئەبێت و ئەو شێتییەی نامێنێ دێت زینی ئەکات، بە شێخ ناڵێت ئەم وڵاخە شێت و هارە کە شێخ پێ ئەخاتە ئاو زەنگی، هێسترەکە تار ئەبێت و لە دەستیان دەر ئەچێت ئەیرفێنێ و ئەیدات بە شاخ و تاش و بەردا، پێیەکی لە ئاوزەنگی گیر ئەبێت و ڕای ئەکێشێت و لە کەلکی ئەخات خەڵکی

هەموو راتەکەن کاتێك ئەیدۆزنەوە، شێخ پەرێشانە لەشی تێکشکاوە لە چەند لایەکەوە شکاوی ئێستان هەیە جا ئەبیەنەوە ئەنێرن بە دوای کابرایەکی لێزان لەو هەورامانـەدا کـە بیگرێتـەوە هەرچەند هەوڵئەدات زات ناکات شێخ ئەفەرموێت کە نوێژی عیشا هـات (٣) ئیـشارەتان بـۆ ئەکەم کە تەواوبووم دەس پێ بکەن عیشا دادێت شت ئامادەکەن شێخ ئیشارەی یەکەم ئەدات، دووەم، سێیەم، چاو لێك ئەنێت تا بە ئارەزووی خۆیان بـە ئـەنجامی ئەگەیـەێنن و ئەیگرنـەوە منیش عەرزم کرد ئەمەیش هەر ئەو جۆرەی پێشەوەیە، وا چاکە کەرامەتی عوزو بەڵگەیەك لە یەکتر قۆڕترن، هەتا کەی ئەی کەنیشکە ئەراتان بگایم؟!

* * *

لەو ناو شوانی سەر خاسەیە دێیەك هەیە بە گەوجی بەناوبانگن، کوڕێك خەڵکی ئەم دێیـە دڵی ئەچێتە کچێك لە ئاوایێکی تری هاوسێیان خـەڵکو خـوا ئەچـن داوای ئەکـەن، ئـەوانیش ئەڵێن با کوڕەکە بێت بیبینین، چاومان پێی بکەوێت کوڕە ئەچێت و سـەڵاو ئـەکات ئـەوانیش لبادێکی بۆ دێنن کە دانیشێت لەسەری کابرا ئـەڵێت تویـك قـنگم خۆشـبێت رایـەخم ناوێـت هەرچی هەوڵئەدەن بێ کەڵك ئەبێت دایك و باوکی کچە تێ ئەگەن زۆر گەوجە ئەڕواتەوە باوکی دێت بۆی ئەگێرنەوە کە ئەمە گوفتو و گۆیەتی، ئەویش ئەڵێت هەروا گەوجە ئەم هەتیوە سەگە دوێنێ من جاشێکم دەگاییی ئەچوو پخی لێ ئەکرد!! ئەویش رۆیشت دایکی هات وتـی ئـەرای چۆ ئەی کچە نێدەن بە کوڕەکەمان؟؟ ئەوانیش قسەکانیان بۆی گێڕایەوە وتی حەی حەی؟!! کوڕ گەلی ناروجە بەی کوزە خەنی بووگن ئەو ئەچێت جاشك دگایت؟!! دەك بە پەند بێت ئـەمیش ئەڕواتەوە شوانەکەیان دێتەوە ئەڵێ چیتان کردگە؟! بۆی ئەگێڕنەوە ئەویش ئەڵێت خـوا روویـان رەش کات من ئیمرۆ کوڕەم گا هیچ تویك بە قنگییەوە نەبوو، مـن نارووجـەیم هـەرجارێکیان دایکم گاوە درۆ ئەکات، بەلاّم بیدەنێ منیش نـێ تـوانم هـەتا کـەی ئـە یکەنیـشکە ئـەڕاتان بگایم؟!! دایکیشی ئەڵێت دەك خودا کوێرت کات ئەی ئەڕا جارێـك مـن نـەگاییت؟ چـەندجار بانگم کردی؟! ئاخر سەرت شین کەن مێردەکەت لـەو کاتـە منـی دەگـایی کـە بانگـت کـردم کابرایەکی هاوسێیان گوێی لەم قسە هەڵەت و پەڵەتە ئەبێت بانگی شوانە ئـەکات: وەرە بێـژە کێ تۆی فێری ئەم ئیشە قۆڕە کرد؟!! ئەی نەتزانی گوناحە؟!! وتی منداڵبووم چوومە ماڵی شێخ بە قوربانی بم، بووم بە پیاویان هەموو جارێـك منـی دەگـا لەبـەر چـاوی شـێخ ژن کـە شـێخ ئەرۆیشتە دیوەخان شێخ ژنیش خۆی بە من ئەگا گشت جارێك هیچ گوناح نەبوو.

* * *

## کاك وریا ئەم چیرۆکانەی بۆ ناردووم زۆر سوپاسی ئەکەم

**أ/ من شێت نیم، ب/ بەتەمای میراتەکەمە،**
**ج/ کامیان دایکی خۆیەتی:**

### ١ / چیرۆکی من شێت نیم:

ئەگێڕنەوە مەلا فایقی رەحمەتی لە ساڵێکدا دووجارشێتییەکەی لێ دیاری ئەدا لە کاتی گەرمەی پاقلە و گەرمەی تەماتەدا مەلا فایق خۆی لە خۆیا شێت بووە، بەڵام لەو دووکاتەدا زیاتر ساڵێك لە هاتی بەهاردا لە کاتێکدا بازاڕ پڕ ئەبێ لە پاقلە و مەلا فایق حاڵەتی بەتەواوی تێکئەچێت و هەموو کەسێك هەستی پێ ئەکات، کەلە سەرباری پێشووی نەماوە و خراپتر بووە، بەڵام مەلا فایق لەبەر ئەوەی لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا پەروەردە بوو بوو لە هەموو کاتێکدا رێزی دینەکەی بزر نەئەکردووە بەزۆری زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخی هەرکردووە. بەیانییەك هەر کە گوێی لە بانگ ئەبێ بۆ مزگەوتی گەورە ئەچێت، پاش دەسنوێژ گرتن و نوێژی بەیانی کردنی ئەچێت بۆ زیارەتی مەرقەدی کاك ئەحمەدی شێخ و دەست ئەکات بە پارانەوەو دوعا خوێندن لەو کاتەدا کابرایەکی تریش هەر بۆ زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخ لەوێ ئەبێت وەکو مەلا فایق دوعا ئەکات و بە دەوری مەرقەدی شێخ دا ئەگەرێت لەو کاتەدا مەلا فایق ئەڵێت کاك ئەحمەد بە قوربانت بم من شێتم، هاتووم چاکم بکەرەوە کاك ئەحمەد من بەرگەی ئەم بارە گرانە ناگرم تۆ بەشاهید بە ئەوا من ئەم شێتییەی خۆمم دا بەم پیاوەی، لەگەڵمە وا ئەڵێت: دەستێك ئەدات بە ناوشانی کابراکەی کەوا خەریکی دوعا کردنە، هەر لەگەڵ چەپۆکەکەی مەلا فایق کابرا تێك ئەچێت و چاوی زەق ئەبێت و ئەڵێت من؟ من؟ نەء من شێت نیم، نەء من شێت نیم، ئیتر لەشی ئەکەوێتە لەرزین و دەست ئەکات بە هاوار کردن، ئەڵێت من شێت نیم من شێت نیم ئا بەم جۆرە ئەو کابرا هەژارە شێت بووە.

* * *

### چیرۆکی (بەتەمای میراتییە؟! لام وایە)

کابرایەکی بەساڵا چوو لەش و لارێکی قەبە، ریشێکی سپی سۆفییانە فەقێ سمێڵی سپی و ئەستوور چاکەتێکی فەردەو پانتۆڵێکی سەر ئەژنۆ چنراوی پۆشیبوو، فێستێکی سووری نابوو بە نووکی سەریەوە لەوەیش ئەچوو سەری بە گوێزان لووس کردبێ گۆچانێکی گرێ گرێی

ئەستووری بە دەستەوە هێواش هێواش ئەڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە بۆڵەی لێوە ئەهات. لەبەر خۆمەوە وتم لەوە ئەچێت ئەم داماوە بەم هەژارییە و بەم پیرییە تاسەیەك کەوتبێتە بەر ڕێبازی ژیانی و توانای سەرکەوتنی نەبێت بەسەریا، بۆیە لەبەر خۆیەوە کەوتووەتە پتو بۆڵە... چاك وایە لێی نزیك بکەومەوە، ئامادەیی خۆمی پێ ڕابگەیێنم تا بتوانم یارمەتی بدەم، هەر کۆسپێك کەوتبێتە سەرە ڕێگای ژیانی چەند بکەوێت لەسەرم تەختی بکەم نەك خوا نەکردە ئەم پیاوە هەژارە پیرە بێت و منداڵان شوێنی بکەون بەم نیهادە خاوێنەوە لێی چوومە پێشەوەو سەلاوم لێکرد و وتم: خاڵە گیان ماوەیەکە لە دواتەوەم هەست ئەکەم پەژارەیەکت هەیە ئامادەم یارمەتیت بدەم، تکات لێ دەکەم دەست مەنێ بە ڕوومەوە، من دانێ بە ئەولادی خۆت کەوام وت: ئەو پیرە مێردە قیژانی بەسەرماو تۆ چیت لێم ئەوێ؟! ئەتەوێ تۆیش بڵێیت: کوڕی تۆم؟! هەر بە زۆر بمکەیت بە باوکی خۆت؟! لاچۆ با داخی ئەویشت پێ نەرێژم، ون بە ون. بەلاّم لەوە ئەترسام کە ئەم پیرەمێردە داماوەم بە گیر هێناوە خەریکە ئەعسابی برووخێ بۆیە خێرا خێرا ئەم گوت تۆ باوکمی تۆ رووح و گیانمی، با دەستت ماچ بکەم هەرچەند وام بگوتایە ئەو شێت گیر تر ئەبوو خەڵکیش سەری سوڕمابوو لەمن و لە ئەو، هەر چۆنی بوو خاوم کردەوە، بردم سەرو چامان لە چایخانە خواردەوە، بەلای یەکەوە دانیشتین هۆگری یەکتری بووین ئەوسا وتم تکا ئەکەم لێم ببوورە گەردنت ئازاد بێت لە گرژی و تووڕەیت، من خراپم وت: من بە کوڕی خۆت دانێ؟! هیچ خراپەیەکی تێدایە؟! وتی ئەی چۆن؟! تۆیش ئەتەوێ میراتم بگریت ئەمجا زانیم ئەمە لەلایەکی ترەوە سەغڵەت کراوە وا چاکە تێی بگەم ئاڵۆزی لە چییە؟! وتم خاڵە گیان یەکەمجارە تۆم دیوە، من موسوڵمانم، بەرەحمم هەستم کرد ئاڵۆز کراوی، تێم بگەینە.

ئەویش چاوەکانی گەش بوونەوە، لێوە وشك و کرژەکانی کرانەوە بە پێکەنینەوە وتی: لە دەرەجە سێی شەمەندەفەری کەرکوکەوە بەرەو بەغدا کەوتبوومە رێ، بۆ ماڵی غەریبی کوڕم شەو نیوەی بووبوو، بلیت بڕێك هات و بەلاما چەمایەوە وتی: بلیتەکەتم بدەرێ! دامە دەستی و چرپانییە گوێماو وتی تۆ خەڵکی کوێیت؟!

وتم خەڵکی سلێمانی وتی ناوت چییە؟

وتم عەباس وتی عباس کەریم ئەحمەد؟! وتم هەتیو تۆ چۆن ناوی باوك و باپیری منت زانی؟! خۆ تۆ لە پێشا ناوی خۆمت نەئەزانی؟! وتی باشە ماڵتان لە گەڕەکی گوێژەیە؟! لە نزیکی سەراوەیە؟! لەسەر جادەی سابوونکەرانە؟! وتم: هەتیو تۆ ماڵی ئێمەت چۆن پێ زانیوە؟! وتی تۆ بێگومان خانەنشینی بەرکەنار کراوی؟! وتم بەڵێ وایە. وتی تۆ ئەفسەری دەوڵەتی عوسمانی

نەبووبیت، لە کاتی خۆیدا؟! گورج دەستم کرد بە باخەڵماو هەویەکەی تەقاویتم بەسەر کردەوە ترسام، وامزانی لێم کەوتووە ئەم هەتیوە دۆزیویەتەوە، بەڵام زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە هەویەکەم هەر لە گیرفانما مابوو وتم: بەڵێ ئەفسەری حکوومەتی ئەفسەری بووم و ئێستا تەقاویتم وتی: باشە تۆ دایکت ناوی ئامینەی کچی حەلاوە خانە؟! وتم: وا دیارە تۆ من باش ئەناسیت، بەڵام من تۆ ناناسم؟! لەوە ئەچێت لە کاتی منداڵیتا باوکت رەفیقی من بووەو لەگەڵ باوکتا منت دیوە، بەڵام ئەوسا تۆ منداڵ بوویت و دیارە بیری منالّی تیژە تۆ من ئەناسیتەوە، بەڵام من تۆ ناناسم.

وتی: لە کاتی جەنگی جیهانی تۆ لەگەڵ لیواکەت لە سولەیمانییەوە چویتە کەرکوك و سێ مانگ لە کەرکوك مایتەوە؟! وتم: بەڵێ وایە راستە وتی لە کەرکوك لە گەڕەکی قۆریە ژنت هێناوە؟! ناوی فەخری بوو پێی؟ وتم هەتیوو ئەمەیان چۆن ئەزانی؟! ئەمەیش هەر باوکت بۆی گێڕاویتەوە؟! کەوام وت: کاتێکم زانی پەلاماری دەستی دام و ماچی کردو وتی: باوکم بۆم ئەگێڕێتەوە!! باوکم ئەی ئەوەتا تۆ بۆم ئەگێڕیتەوە، تۆ باوکمیت ئۆخەی بابە گیان ئۆخەی نەمردم باوکی خۆمم دۆزییەوە وتم: من تۆ ناناسم؟ بڕۆ باوکی خۆت بدۆزەرەوە وتی: قەسەم بەخوا لەسەر ئەو ناونیشانانەی کە دایکم باسی بۆ کردوم تۆ باوکی منیت. وتم: ئەی هاوار خەڵکینە ئەم هەتیوە ئەیەوێ بلۆفم لێ بدات. کوڕەکە تۆزێك بێ دەنگ بوو! و نەختێ گرژ بوو ئەمجا دەستی دایە پەلم و وتی هەستە گورج هەستام و تۆزێکیش ترسام لە دڵی خۆمدا ئەم وت! ئەم هەتیوە تووشی گێچەڵێکم ئەکات؟! وتم بەڵێ وتی هەڵی گری. دەستم دا جانتا دڵیشم وەکو بەزینی بۆق لێ ئەدات، کاتێك پەلاماری جانتاکەی داو وەکو هەڵۆ لە چنگی دەرهێنام، وتی پێشم کەوە... پێشی کەوتم توند دەستیشی گرتووم، لەبەردەم ژوورێکا راوێستا، تەماشای سەر قاپی ژوورەکەم کرد نووسرابوو، دەرەجەی یەك ئیتر منی بردە ژوورەوە لەسەر کورسی بە ئیسراحەت دانام و وتی: بابە گیان تۆ ئەم شەو لێرەدا بنوو تا بەیانی، ئەمەی وت و رۆیشتە دەرەوە منیش تەماشام کرد شوێنێکی خۆش ژوورێکی رێکی نوستن بێ دەنگ هەر خۆم بووم زۆرم پێ خۆش بوو بە ئارەزوو شانم لێ داوە و راکشام، بەڵام لە پەژارەدا خەوم لێ نەئەکەوت، ئەم وت ئەم هەتیوە منی بۆچی هێناوەتەوە ئێرە؟! تۆ بڵێی کرێی ئەم ژوورە چەند بێت بەخوا پوولێکی نادەمێ، من داوای ئێرەم نەکردووە، بە زۆر هێناومی بۆ ئێرە. لەم قسانەدا بووم کاتێکم زانی خۆی کرد بە ژوورا، لەسەفەر تاسێکدا شلەو برنج و مریشکی سوورەوەکراو، لە تەرموزەیەکدا چای گەرمی لەبەردەستمدا داناو گوتی بابە گیان تێر بخۆ وتم برسیم نییە، داوای

هیچم نەکردووە ئەم شتانەم بۆچی بۆ ئەکڕیت؟! پێکەنی وتی باوکە من پارەم پێ نەداوە، ئەمە بەشی خۆمە، فەرموو نانی خۆت بخۆ، تێر چای بخۆرەوە، پاشان سەرت لێ ئەدەمەوە ئەمەی وت و رۆی منیش تێر نان و چام خوارد بە کورتی ئەو شەوە لە دەرەجەیەك مامەوە بەیانی قیتار گەیشتە بەغداد. کاتێکم زانی دیسان لێم پەیدا بوەوە وتی بابە گیان فەرموو دابەزە لە دڵی خۆمدا ئەم وت: هەتیو تۆ حەقی منت چییە؟ من خۆم ئەزانم دابەزم و ئەزانم بۆ کوێ ئەچم و بڕۆ لە کوڵم بەرەوە، دیسان پەلاماری دەستی دام جانتاکەی هەڵگرتو فەرمووی لێکردم، من پیر و ئەویش گەنج و بەکار ناچار لەگەڵیا دابەزیم هەر ئەوەندەم زانی تەکسی بانگ کرد، بێ معاملە منی فرێدایە ناوی، جانتاکەی لەبەردەم خۆیا داناو گوتی بابە گیان بۆ کوێ بچین؟ وتم بۆ ماڵی غەریبی کورم وتی لە کام گەرەکە؟وتم وەزیرییە کە گەیشتینە ئەوێ ئەم لا ئەولا ئەو کۆڵان وتم ئەم دەرگا شینە خۆیەتی ئۆتۆمبیلەکەی وێستان، پارەکەیشی دایە، دای لە دەرگا، کرایەوە، غەریب خۆی بوو هەر ئەوەندەم زانی پەلاماری غەریبی داو دەستی ماچ کرد!! ئەم لاو ئەولای یەکیان ماچ کرد، وتی سوپاس بۆ خوا برای خۆمم دۆزییەوە هەروایش باوکم غەریب وتی بابە ئەمە چۆنە؟! وتم رۆڵە منیش سەرمسووڕماوە دەریشی ئەکەم لێم دوور ناکەوێتەوە ئەڵێی توتکە شوێنم کەوتووە، نازانم چی بڵێم؟! کەچی غەریبی کوڕم لەباتی ئەوەی ئەویش بکەوێتە گومانەوە وتی بابە گیان لەوە ناچێت درۆ بکات منیش قیژاندم هەتیو تۆ چی ئەڵێیت؟! رەنگە ئەم هەتیوە درۆ بکات ساختەچی بێت ئۆینێکی لەژێر سەردا بێت تەماعێکی بە میراتەکەم هەبێت کە ئەم قسانەم کرد غەریب پێکەنی وتی بابە وانییە، ئەویش وتی: من چاوم لە خانووی تۆ نییە من خانووی دوو قاتم هەیە دووکانی زۆر و ئوتێلم هەیە من چاوم لە ماڵی تۆ نییە.

ئیتر دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی بەسەرهاتی، کە منداڵێکی بێ باوك بووە لە کەرکوك و دایکی بۆی گێڕاوەتەوە کە باوکی زابتی حکوومەتی عوسمانی بووە، لە کەرکوك سێ مانگ یا چوار ماوەتەوە و هەر لەوێ دایکی ئەمی مارە کردووە، دایکی ناوی (فخرییە) سێ مانگ لەگەڵیا ماوەتەوە کە عەباس کەرکوکی بەجێ هێشتووە بەرەو ئەستەمبوڵ رۆیشتووە دایکم دووگیان بووە لەو ساوە دایکم باوکمی نەدیوەتەوە، و ناونیشانی تەواوی و گەرەك و جێگاو باو باپیری پێم وتووە و نیشانەیەك بە قۆڵی باوکمەوە هەیە کە لە شەڕدا تەنگێوراوە و بە دوورو درێژی ناوی کەسەکانی باوکم بەدەس خەتی خۆی نووسراوە لای دایکم تەسلیم بە من کراوە ئیتر بابە بۆ حاشام لێ ئەکەیت؟! فەرموو ئەگەر وا نییە؟

که ئەم قسانەی کرد غەریبی کوڕم هەستا و باوەشی پیا کرد و ماچی کرد، وتی بابە گیان ئەمە برای منە و کوڕی تۆیە هەندێك مایەوە هەڵساو ڕۆیشت پاش نیوەڕۆ خۆی کردەوە بە ماڵی غەریبی کوڕماو، ژنەکە بو چوار پێنج کورو کچی هێنابوو، هەموویان کەوتنە ماچ کردنی من و غەریبی کوڕم هەر وەخت بوو شێت بم، بابە گەورە گیان بابە گەورە گیان کەی نێر نەی ئەکێشا ئەو کوڕەم ناوی لێنرابوو عوسمان، گوایە دایکی لە سوێی شەڕی عوسمانلی ناوی ناوە عوسمان چونکە بە خەیاڵی خۆی مێردەکەی لە شەڕی عوسمانیدا نەماوە ئیتر عوسمان ڕووی تێکردین و وتی: بەیانی دێم بە شوێنتانا یەکدوو ڕۆژ بەخۆشی لە ماڵی ئێمەدا ڕائەبوێرین، جێی خۆیەتی ئاهەنگ بگێڕم ئەم هەتیوە ڕاستی کرد خانووی باشی هەبوو، ئوتێل و دووکانی نیشاندام یەکدووێك، کە وەختی غەریبی کوڕم ئەوەی دی، وتی بابە گیان بۆت دەرکەوت کە عوسمان ڕاست ئەکات و برای ڕاستەقینەی منە؟ وتم: نازانم بڵێم چی؟! خۆ بەخوا ناونیشانەکانی هەمووی ڕاستە.

ئائەمەیە ئاڵۆزی یەکەم، کە ئێستایش هەر لە دڵمایە.

* * *

### الله يساعدك، الله يساعدك

واتە خوا یارمەتیت بدات

کابرایەکی عەرەب ئەچێتە مزگەوتێك لە موسل ڕۆژی جومعە کە نوێژی جومعە بکات، بەرانبەر خطیب دائەنیشێت کە وتار بێژ ئەڕواتە سەر منبەرو دەس ئەکات بەوتار دان، هەر دەستەیەك ئەڵێت کابرای عەرەب ئەڵێت: الله يساعدك، هەر ئەیڵێت و ئەیڵێتەوە: الله يساعدك، کە نوێژ ئەکرێت و تەواو ئەبێت کابرای خەتیب دەستی کابرای عەرەب ئەگرێت و ئەیباتە هۆدەکەی خۆی لێی ئەپرسێت بۆچی ئەتوت: الله يساعدك؟!

ئەویش ئەڵێت من منداڵ بووم نامیانە بەر خوێندن لای میرزا مەلایەك ڕۆژێ ئایەتێکی فێر ئەکردم جارێکیش ئەگام هەر ئەوەندە توانیم تا سوورەی أخلاس "قل هو الله احد..." بخوێنم، ئێستا تۆ ئەوەندە فێر بوویت کە یەکجار زۆرە، هەر ئەبێ بڵێم:! الله يساعدك چۆن بەرگەت گرتووە.

* * *

### ئەبێتە دیگونە چارە گونت ئەکەوێتە ناو چەوانت:

ئەگێڕنەوە کابرایەکی زۆر ناشرین و عەقڵ سووك ڕێگەی ئەکەوێتە لای کابرایەکی کەوش درووە، تەماشا ئەکات سەری کەوشێك ئەدورێت ناشرینە، بەلاَم هەڵیگێرایەوە زۆر جوان و ڕێك ئەبێت بەرۆکی کابرا ئەگرێت منیش هەڵگێرەوە با نەختێ جوان بم، چونکە من ناشرینم هەرچی هەوڵ ئەدات تێبگا بێ کەڵك ئەبێ و یەخەی بەرنادا ئەویش ئەڵێت برا: ئەم کارە زۆر سانایا لای من، بەلاَم هەڵت بگێڕمەوە گونت ئەکەوێتە ناو چەوانت لە ناو گەڵتا نامێنێت ئەجا کابرا قەناعەت ئەکات و یەخەی بەرئەدات.

* * *

## لە چیرۆکەکانی لای وریا

### کامیان دایکی خۆیەتی؟!

عوسمان باوکی ناوی ئەحمەدە دایکی ناوی ئامەیە خوشکەکەی ناوی فاتەیە، مامی ناوی ئیبراهیمە عوسمان ئەحمەد هەژار لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا بوو، کە وازی لە شوانی مامی پوولەکی یەکەی هێناو دەستی فاتەی خوشکی چواردە ساڵەکەی گرتو لەلادێوە رووی کردە شاری سلێمانی. عوسمان لە تەمەنی شەش ساڵیدا بوو، کە باوکی بوو بە خۆراکی شەڕی یەکەمی جیهانی و دایکیشی شووی کردەوە بە کابرایەکی بیر هەڵکەن کوڕ و کچەی دایەوە بەسەر مامەکەیا عوسمانی هەژار هەر لەو کاتەی شوانی ماڵاتەکەی مامی بوو تا ئەو رۆژەی رووی کردە شار عوسمان مامەکەی جێهێشت، حەوت هەشت ساڵێك لە سلێمانی بە کرێکاری خوشکەکەی بەخێو ئەکرد زۆر بەسەر بەرزی هەرچی خەمەنە ییوو، تەنیا ئەو خەمە نەبێ کە:

رۆژێك مامی هاتە سلێمانی و بە پرسیار عوسمان دۆزییەوە ئەو شەوە لە ماڵی عوسمانی برازای رۆژی کردەوە، بەلاَم ئەوەی کە عوسمانی خستە دەریای بیرکردنەوە و پەژارەوە ئەو کاغەزە بوو کە مامی بۆی هێنابوو!!

کاغەزەکە بەم جۆرە نووسرابوو:! بۆ برای گەورەی خۆم عوسمان هەر لە منالییەوە دایکم بەم چیرۆکە گوێچکەی پڕ کردووم بۆی گێڕاومەتەوە کە لە یەکێك لە لادێیەکانی سلێمانی بەر لە باوکم ژنی پیاوێك بووە کە ناوی ئەحمەد بووە لە ئەحمەد ناوە کوڕ و کچێکی بووە کوڕەکە

عوسمان کچەکە فاتەی ناو بووە مێردی پێشووی لەشەڕی عوسمانی کوژراوە دایکیشم کە ناوی ئامەیە کوڕو کچەکەی داوەتەوە بەسەر حەقدارا کە مامەکەیەتی و خۆی شووی کردۆتەوە بە باوکم منیش لەو کاتەوە کە هۆشم پەیدا کردووە بە دوای هەواڵی ئەو براو خوشکی خۆما لە پرس و خواسام تا خوا بۆی کردم و سۆراخم کردیت و بیستوومە کە تۆ لە ماڵی مامە برایمتا شوانی ماڵاتی ئەوا ئەم نووسراوەم بۆ ناردیت کە لەسەر ئەم ناونیشانەیە وەرە بۆ کەرکوك بەرانبەر پۆلیسخانەی قۆرییە ماڵی مام کەریمی بیر هەڵکەند ئەمدۆزیتەوە منیش ناوم محمودە. عوسمانی هەژار بەم نووسراوە زۆر شەکەت ئەبێت هەر چۆنێك ئەبێت بڕوات بە شوێن چارەنووسی ئەو نووسراوەدا و برا بدۆزێتەوە پاش ماوەی یەکدوو ڕۆژێك دوعا خوازی لە خوشکەکەی کرد و بەرەو کەرکوك کەوتە ڕێ پۆلیسخانەی گەڕەکی قۆرییەی بەئاسانی دۆزییەوە هەروایش ماڵی مام کەریمی بیر هەڵکەن قاپی درا قاپی کرایەوە کوڕێکی گەنجی چاوشین مووزەرد دەرگای کردەوە کە پرسیاری ماڵی مام کەریمی بیر هەڵکەنم لێ کرد پەلاماری داو توند گوشیمی بەخۆیەوە کەوتە ماچ کردنم وتی بە قوربانت بم کاکە گیان ئەوە تۆ ئەحمەدی برای منیت؟! ئەمیش ماچی کردو بە خۆیەوە نووساند و خۆی پێ ناسین لەگەڵ دایکیا کە دایکی مەحمودیش بوو ماچ و مۆچێکی گەرمیان کرد ماوەی سێ ڕۆژێك لەوێ مایەوەو دواجار گەڕایەوە بۆ سلێمانی و چۆنییەتی دیدەنییەکەی بۆ خوشکەکەی گێرایەوە ئەویش داوای لێکرد کە بنێرێت بە دوایانا، بەڵکو سەرێکیان لێ بدەن، بەلام پێویستی بە نووسراو ئەکرد دوای حەفتەیەك دایکم و مەحمودی برام خۆیان کرد بە ماڵاو چەند ڕۆژێك لامان مانەوە داوام لێکرد کە مەحمود بێت بۆ سلێمانی کە لێرە کرێکاری زۆرە بە کورتی مانگێك تێ نەپەڕی کە محمودی برام بە ئێکجاری هات بۆ سلێمانی و دایکی لە کەرکوك بەجێهێشت و زۆری نەخایاند دایکمان مرد و ڕۆیشتە بازاری خوا چەند دڵخۆش بووم کە ماوەی سێ ساڵ زۆر بە خۆشی بەیەکەوە ئەژیاین هەموو بەیانییەك بەیەکەوە ئەچوون بۆ کرێکاری خۆشتر ئەوەبوو پارەی کرێکاری خۆی دائەنا بۆ خەرجی و مەسرەف، بەلام ڕۆژانەکەی مەحمود لای خۆی کۆ ئەکاتەوە تا ماوەی دوو ساڵ تقدیری خوا وا ئەبێت لەو ماوەیە دایکیان ئەمرێت و بەرەحمەتی خوا ئەڕوات، وا دایکی دوو کوڕ و کچێکە لەو دونیاش دوای دوو ساڵ مەحمود پەلپ ئەگرێت بە عوسمان ئەبێ ژن بێنێت عوسمان ئەڵێت برا گیان من خاوەنی هەر هیچ پارەیەك نیم مەحمود وتی کاکە من دوو ساڵە پارە کۆئەکەمەوە بۆ تۆمە و بۆ ئەو کارە خێرەم داناوە ژن بهێنی بەلێ ژنی پێ هاورد دوو منداڵیان بوو کەوتنە

گرو گاڵ ماوەی چوار ساڵی خایاند ئەم کەین و بەینە و لە ژوورێکدا ئەم جوتە برا پێکەوە زۆر بە خۆشی گوزەراندیان، بەلاّم بەلاری ڕێکەوت چلۆنە!! و چەند ناخۆشە.

عوسمان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت: ئێوارەیەك من و مەحمودی برام لە ئیش گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، چیمان بیستبوو؟ چیمان دی!! پیرەژنێك و کوڕێکی گەنج لە تەمەنی مەحمودا بوو، لە ماڵی ئێمە دانیشتبوون بەخێر هاتنم کردن تەماشا ئەکەم کار تەنها لە تەماشا کردنا نییە کوڕە گەنجەکە دەستی ماچ کردم وتی ئۆخەی شوکور براکەمم دۆزییەوە! پیرەژنیش ئەملاو ئەولای ماچ کردم وتی ئۆخەی ئەحمەد گیان نەمردم چاوم پێت کەوتەوە لە دڵی خۆمدا هەزار کسون و قوژبنم ئەپشکنی وتم هەڵبەت محمود شتێك ئەزانی لای من ئاشکرای نەکردووە وتم برا ئەوە چییە؟ وتی نازانم، ونایان ناسم، رووم تێکردن وتم بەسەرسوڕمانەوە من دایکی خۆمم دۆزییەوە ناوی ئامە بوو لە کەرکوك وەبە رەحمەتی خوا چوو، ئەوەیش براکەمە مەحموده و خوا شوکور بەیەك شادبووینەوە چوار پێنج ساڵێکە ئیتر ئێوە نیازی چیتان پێمانە؟! فەرموون ئەم شەو لێرە پشووی خۆتان بدەن و بەیانی لە کوێوە هاتوون بگەڕێنەوە نەخێر کار بەوەوە نەوەستا چوار پێنج شەوی تریش لامان مانەوە و لەسەر قسەی خۆیان سوور بوون دوواجار کار گەیشتە ئەوەی کە ناردم بە شوێن مامماو هات و لەگەڵ پیرەژنا کەوتنە قسە زۆر بە ئاسانی یەکیان ناسییەوە و مامم گوتی ئەم پیرێژنە ئامەی دایکتە راست ئەکات کە ئەو پیرێژنە ئامەی دایکم بێت کەوابوو ئەو کوڕە گەنجەیش کە لە گەڵیایە برامە.. دە فەرموو لێرەدا سەرت نەتەقێ کە ئەو کوڕە گەنجە برای من بێت.؟ ئەی گوایا مەحمودی قوڕ بەسەر کە چوار ساڵە لە گەڵمایە رەنجم بۆ ئەدات و ژنی بۆ هێناوم چی منە؟! زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە مەحمود وتی کاکە گیان مادام وای لێ هات ئەمانە دایك و برای تۆن من ئیتر لێرە نامێنم، چونکە لەوە ئەچێ کە من برات نەبم لەگەڵ مامما بڕیارمان دا کە فاتەی خوشکمی بدەمێ و نەیەڵم لێم دوور بکەوێتەوە، بەلاّم مەحمود وتی کاکە گیان تۆ هەر برای منی و فاتەش خوشکمە من چۆن شتی وا ئەکەم؟! چۆن قبوولی ئەکەم؟! من چوار ساڵە لە ژوورێکا خوشك و برا پێکەوە نووستووین لە بیرتە کە وەختێ من هاتم ئێوە تەنیا یەك لێفەتان هەبوو کە هەرسێکمان لە ژێر ئەو لێفەیەدا ئەنووستین؟! لە بیرتە کە سێ قۆڵی بەژێر ئەو لێفەیە زرمە زلێمان ئەکرد و نوقورچکمان لەیەك ئەگرت ئەمان ماڵی بەپشت ملی یەکترا؟ من کە چوار ساڵ لە ژێر لێفەیەکا لەگەڵ فاتەدا نوستبم ئێستا چۆن کاری وا ئەکەم؟! هەر ئەوەی وت، هەستایە سەر پێ و وتی بەدوعا ئەو رۆیشتنە رۆی نەگەڕایەوە بەدوایا وێڵم

* * *

## له نێوان دوو هەوێدا!!!!

کابرایەك هەبوو دوو ژنی هەبوو ژنی بچووکیان زۆر ستێزە و بەدرەوشت بوو لە خوا نەئەترسا ژیانی بە خێزانەکە تاڵ کردبوو ژنی گەورەی بێ دەنگ و هەژار و بەستەزمان بوو هەوێی بچووك لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە پەنێك و کەتنێك بە هەوێکەی بدات بەیەکجاری رزگاری ببێ لێی هەریکەیان کوڕێکی بەبەرەوە بوو ژنی بچووك هات مەمکی نایە دەم کوڕەکەی، پاشان رایکرد چەقۆیەکی هێنا ملی کوڕەی هەڵ هێنایەوە و چەقۆکەی لەسەر دڵی دانا دەست و پەلی خۆی شۆری رۆیشتە دەرەوە کاتێك هەوێی گەورە هاتەوە لە کانی و ئاو ئەمیش بەدوایەوە خۆی کرد بە ژوورا و کردی بە فیزاح و خۆکوشتن و قژ رنینەوە هەیرۆ باوکەرۆ برارۆ کوڕەکەم سەربڕاوە... خەڵکی لە خۆی کۆکردەوە ژنی گەورەیش واقی ورما هەرچی پاکانەی کرد و سوێندی خوارد کەڵکی نەگرت رۆیشتەوە بۆ ماڵی باوکی پەنای بدەن بیپارێزن کاتێك مێردەکەی پێی زانی و قسەیان بۆ کرد!! وتی بڕواناکەم ئەوەی کرد بێت، خۆم چاکی ئەناسم، بەڵام کارەساتیش رووی داوە ئاژاوە کەوتە نێوان هەردوو بەرەکەوە.

ئەنجام..... گەواهی دەرنییە! "شاهید" و تاوان ساغ نەبووەتەوە لەسەر کەس تەنها گومان ژنی گەورە ئەگرێتەوەو بەس هەڵسان رۆیشتن بۆ لای کابرایەکی زاناو تێگەیشتوو بەیانیان بکات و ساغی بکاتەوە هەردوو ژنەیان برد لەگەڵ خۆیاندا زانا لێی پرسین و بیری لێکردەوە رووی کردە ژنەکە گەورەکە وتی تۆ ئەبێ بچیتە ئەو ماڵە کراسەکەت بەبێ دەرپێ هەڵکەیت تا ئەگاتە بەر مەمك و سینگت، بەرەو ئەم مەجلیسە بێیت هیچ شتێك بەخۆتەوە نەگریت! ئەگەر راست ئەکەیت تۆ راست و پاکیت؟ ئەگینا ئەم چەقۆیە ئەدەمە دەس هەوێکەت بەبەرچاوی خۆتەوە کوڕەکەت سەربڕێت وتی شتی واناکەم و نەم کردووە باسەری ببڕێت و خۆیشم بکوژن رازیم چی هەوڵیان دابێ کەڵك بوو دەستی کرد بە گریان و وتی خوایە خۆت ئاگاداری پەناهم بدەیت لە تاوانی نەکردوو...

رووی کردە ژنی بچووك وتی: تۆ ئەبێت بچیت خۆت واڵێ بکەیت دەرپێت لەپێ نەبێت کراسەکەت هەڵکەیت بەرەو ئەم پیاوانە بێیت! جا کە هاتیتەوە بەردەم ئەم پیاوانە، بە چەقۆ کوڕەکەی سەر ببڕە لەباتی کوڕەکەی خۆت و مێردەکەشت ئەو تەڵاق ئەدات و ئەبێ باوك و برای ئەم ژنە ئەم ئافرەتە بکوژن، با عالەم پەند گیر بێت خێرا وتی باشە بێ سێ و دووکردن خێرا رۆیشت مێردەکەیشی بەدوایەوە هەروای کرد!! ئەوەڵ کراسەکەی داکەند مێردەکەی توند دەستی گرت و هێنایەوە بۆ ناو پیاوەکان،، کابرای زانا بڕیاریدا کە خۆی کوڕەکەی خۆی سەربڕیوە ئەم

هەوێیە گەورەیەی ئاگای لێی نییە بە هیچ جۆرێك ئەویش ئەنجام بەسزای رەوای خۆی گەیشت و سەرنگون کرا و ژنە گەورەکەیشی بردەوە.

| | |
|---|---|
| تۆبە لە هەویٚ ساری | لە فیتنە و نالەباری |
| لە ئاژاوەی ناو ماڵ | لە ترپ و چۆپی خرخاڵ |
| لە کوڕ و لە کچ لە منداڵ | لە ژینی ناخۆش و تاڵ |

❋ ❋ ❋

## دوژمنی دوژمنم دۆستمە!!

کابرایەك پرسی، خالۆ شێخ..... ئەوە تۆ کورەزاکانت زۆر خۆش ئەویٚ؟! بۆچی وایە، هەر لە ئەندازە بەدەرە؟ وەڵامی دایەوە: بەڵێ چۆنی بفەرموویت وایە، چونکە خوا لە قورئانی پیرۆزدا ماڵ و ئەولادی بە دوژمن داناوە هەتا بفەرموویت کورەکانم نارەسەنن بەدرەفتارن بە گوێم ناکەن حەز ئەکەن کوێر بن، بەڵام من نەبینن و ئەو کوڕە زایانەم، چونکە وەك باوکیان ئەبن و ئەبن بە دوژمنی ئەوان ئەوا خۆشم ئەون، چونکە دوژمنی دوژمنم دۆستمە....

❋ ❋ ❋

## جوامێری و چاکە کردن هەروا ئەبێت!!

ئێوارە وەخت بوو پیاوێکی دەستە خۆی کرد بە ژووری مزگەوتا لە دێی..... کەوانێکی هەڵاجی بە شانەوە بوو لەگەڵ دەفرێکی بچووکدا. سەلامی لە دانیشتوان کرد و لە ریزی پێشەوە ئارام بوو. بەخێر هاتن کرا لەلایەن نوێژ کەرانەوە و کەوتنە دواندن لە گەڵیا وتی من بەرەگن ئەکەمەوە، بە لبادو فەرەنجی و.... تاد. حۆقەی بە......... دینارشی ئەکەمەوە، و خاوەنی ئەبیٚ بیسووێتەوە لەبەر ئەوەی گەورە دیٚ بوو و خاوەنی ئاژەڵ و گۆتاڵ بوون رێککەوتن لەسەر نرخێك و ئێوارە حاجییەك بردییەوە بۆ شام کردن، شەویش بۆ نووستن لە مزگەوتا گوزەراندی، بەیانی لە حوجرەی مزگەوت دەستی کرد بە کار. رژێمێکی بۆ خۆی دانابوو، شەبەقی هەڵئەستا نوێژی ئەکرد دەستی بە ئیش ئەکرد تا ئەگەیشتە چێشتەنگاو بەرچای ئەکرد، ئەمجا تا نیوەرۆ نوێژی ئەکرد قاوەڵتی ئەکرد، سەعاتێك پشووی ئەداو ئەحەسایەوە هەلاجی ئەکردو شی ئەکرد لە مەغریب بە دواوە رایئەخست زۆر کەمیش ئەدوا وەختی خۆی بەفیرۆ و بەزایە نەئەدا نوێژی عیشای ئەکردو ئەنووست... لەسەر کارکردن بەردەوام بوو منیش دەستم کرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵیا تا رادەیەك، وەکو ئاشنایەکی

دێرینە هۆگری یەك بووین لێم پرسی ماڵ و منداڵ و خێزانت هەیە؟ وتی نەخێر دڵم شکاوە کچی مام سەعیدی برادەرم دڵخواز و خۆشەویستم بوو یەکجار زۆر و بەبڕیاری دایك و باوك و گشت کەسەکانی رۆژی بێ ئەو نەئەژیام هەرچەند چاوم پێ ئەکەوت ئەگەشامەوە خۆشی و گەشەی سەراپا وجودی دائەگرتم هەموو گیانم ئەکەوتە شنە، بزە، پێکەنین، وەکو تەوژمی کارەبا بەباری خۆشیدا ئەیگرتم هیچ بڕوام وانەبوو لەوەبەر تامی ئەوین وایە کە رۆیشتم فرمێسك ئەزایە چاوەکانم دڵم دەستی ئەکرد بە تەپە تەپ ئەتوت مریشکی سەربڕاوە هەڵ ئەپەڕی وکچەکەیش ئەو لەوانەبوو بێهۆش ئەبوو بۆ ماوەیەك ئەمە بە ئاگاداری دایك و باوکیشی بوو ئێمە وابووین ئەوانیش زۆر هەردووکمانیان ئامۆژگاری ئەکرد بێ کەڵك بوو و هیچ کۆسپێکیش لە رێگەی گواستنەوەدا نەبوو بەیەکیشەوە خەڵوەتیمانیش ئەبوو دائەنیشتین و چاومان لە یەکتر ئەبڕی جۆرێکی سەیری هەرگیز نەبینراو بوو.

جارێکیان رۆیشتم بۆ کارو ئیش کردن کڕین و فرۆشتن لەو ناوچە رەواندوزە چەند رۆژێکم پێ چوو کاتێك پیاویان نارد بە دواما ناڕاو پێی راگەیاندم کە حاجی خەزوورم ئەڵێت زۆر بە پەلە بگاتەوە هەولێر و خۆی بگەیێنێتە خەستەخانە؟! کە خۆم گەیاندە لای بینیم کەوتبوو هیلاك بوو دەردی کاری بوو کە چاوی پێم کەوت راستەوە بوو، باوەشی کردەوە دەستم کردە ملی و دەمم نایە ناو دەمی وەخت بوو گیانم دەرچێت چاوم بڕییە چاوەکانی پاشی نەختێك شل و خاو بوو بە دەستمەوە گیانی بە یەزدان سپارد و باوکی دەستی گرتم هێنامیە دواوە منیش بێهۆش کەوتم... ئۆی چ ئازار و دڵ شکانێك بوو تەلی کارەبای ئەوین و خۆشەویستی گرتمی و دامیە بەر تەزووودان و راچەنین زۆری لەسەر نەرۆین لەوە دوا ئیتر بە هیچ ئافرەتێك سوکناییم نایەت هەرچی ئەبینم تامی ئەو نادات هەمیشە لایەکم چۆڵە بەشەو و بە رۆژ لەگەڵیا ئەدوێم کە تەنها بم، سیمای لەبەر چاومە هەرگیز گوم نابێت، و کە ئەنووم هەروابن پێکەوە هەرچیشم پێ بڵێت لە خەودا راست دەرئەچێت و ئاگاداریشم ئەکات و هەرچەند ئەچمەوە بۆ هەولێر ئەچمەوە لای خەزوورو خەسووم گوایە دیدەینیان ئەکەم تێر شیوەنی خۆم تازە ئەکەمەوە هەست بە کسپەو ئێش ئەکەم لە ناخ و دەروونم وەکو دووکەڵ بەرز ئەبێتەوە شەو دێتەوە خەووم پێم ئەڵێت لە گەڵتا بووم من لە تۆ زیاتر ئیتر ناتوانم ژن بێنم نەفسم تۆراوە بە کەسێکیتر هۆگر و ژیر نابم و دەستی هەر کچێکیش بگرم و بیهێنم لەگەڵیا ناژیم و خۆشم ناوێت و زوڵمی لێ ئەکەم و بەچاوی قین و بیانوو پیا ئەڕوانم جا ئیتر خێزان و ماڵ پێکەوە نان لەدەس من رۆیشتووە و ئەگەر هەروابم هەرگیز بیری لێ ناکەمەوە وتم هاوڕێی بەڕێز: ئەی هەژاری و دەرامەتت چۆنە؟! لە لات و نابوت و کەسیف ئەچێت؟! وتی من هەرگیز بە لات و هەژار مەزانە پێنج پیشە و

کار ئەزانم کە پێی ئەژیم هەر لەشم ساغ بێت پارە بەسەرما ئەبارێت. وتم هاورێیم ئەم پرسیارانە بۆیە ئەکەم تا تێبگەم ئەی دیمەنت شرۆڵ دێتە بەر چاوم بۆ؟! وتی بەڵێ وایە تازە لە گیراوخانە ئازاد بووم، دوو ساڵی تەواوە بەندکراوم یەکەندەر دوو لەوێوە خۆم گەیاندووەتە ئێرە من بازرگان بووم (١٢) ولاخی شارەویم هەبوو لە شۆڕشی کوردستانی ئێران و مهاباد بە بیانووی لایەنگری ئەو شۆڕشە و مەلا مستەفای بارزانی و یارمەتی گەیاندن بۆ ئەوان دەستی بەسەراگیراو خۆیشم بەندکرام و سزایەکی زۆرم درا بە سەرا، بەر حوکمی عەسکەری کەوتم و گیرام هەرچیشم هەبوو گشتی بوو بە قوربانی کوردایەتی و بارزانی وە لە کۆڕ و کۆمەڵەی کوردایەتیدا و لە شانە نهێنییەکانی دا زۆر بە دڵسۆزی ئیشم تیا کردووە و من لە بەرەی نیشتیمان پەروەری دا هەرگیز سڵ ناکەمەوە تا ئەگەمە مل قرتاندن لە داخی چەوسانەوەی ئەمریکای عالەم خۆرو دەریا لووشی لە دژی رژێمە چلکاو جۆرەکانی ئامێری دەستی بێگانە ئەوانەی بوونەتە چەکوشی دەستی ئیمپریالیستی ئەمریکی، و خۆی و بەرەو دەست و پێوەندی تا رۆژی مردن لە دژی ئەجەنەگم هەر نەبێ بۆ ئەوەی خەشی خۆم برێژم لەدوای پێنج فەرزە شتێك رەچاو ئەکەم و ناوی لێ ئەنێم ئیمپریالییەت و پیاوەکانی، تێر تفو نەفرەتیان لێ ئەکەم ئەگەر ماستاو فرۆشێك بێت یان سەرکۆمارێك لەعنتیان لێ بێت هەتا سەد پشتی نەوەی داهاتووە یان هەر لەعنەت بۆ ئەنێرم ئەم رستە و وشەیەم لا غەریب بوو ئیمپریالیزم شانە بەرەی نیشتیمانی پەروەردەی دەستی ئیستعمار بەرەی گەلانی ئازاد و سەربەست شۆشیالیست شۆرەوی قەلای ئازادی خوازان ئەمانە هیچ بە گوێم ئاشنا نەبوون کە ئەمانەم یەکەمجار لەو بیستبوو.

چەند مانگێك لەوێ مایەوە ئیشی ئەکرد هەموو سەری مانگێك ئەرۆیشت بۆ شار وتم ئەچیت بۆ شار ماڵ و منداڵت نییە، پارەیان بۆ ببەی یا بینێریت بۆچی ئەچیت؟! وتی لە بەندیخانە دووانی سیاسی گیراون زۆر مەرد و پاڵەوانن یەکێکیان ژنێك و سێ منداڵی هەیە و کەسی نییە بیان ژێنێت و زۆر ئازاو تێکۆشەر و چاکە شایستەی ئەوەیە رێزی بگیرێت ئەگەر رەمزیش بێت ئەویتریشیان ماڵ و خێزانی هەیە هەژاران دەرامەتیان کزە ماڵ و ئەولادی هەیە بریارم داوە لە بەندیخانە دەرچم هەرچیم دەس بکەوێت لە رەنجی شانی خۆم دەسگیرم بێت بیکەم بە سێ بەشەوە وەکو یەك خۆم و ئەو دوو برادەرەی گیراوخانەکە بۆیە گشت سەری مانگێك ئەچم بە پۆستەدا بۆیان ئەنێرم ونایشێڵم من ناردوومە بۆتان هەر تەنها دڵنیا بم لە پێگەیشتنیان ئیتر ئەوپەری ئاواتم ئەوەیە و هەتا بەرئەبن و بمێنم ئەمە هەر ئەکەم و مینەت و شانازی بەسەر خۆمدا ئەکەم نابێ کەسم لێ مەمنوون بێت سوپاسم ناوێت کەس بۆم بکات..

وتم لێت ئەبیستم ئیمریالیزمی ئەمریکی ئەمە چی کردووە؟! وتم ئەم گەلە پێکهاتووە لەبەدفەر جامترین مرۆڤ بە درێژی مێژوو هەموو (شزاز الأفاقن) لە خوا نەترس و بێ ویژدان و رەحم تاودەرو خەڵك کوژترینن لە جیهان ماکی هەموو شەڕێکن میلەتان ئەخۆن سەرۆکی دەسەلاتی حکوومەتان ئەکرِن و بەری ئەدەنە گیانی کەلەکەی خۆیان ژەهری کوشندەی بەدرەوشتی ئەرێژن ئابرووی مرۆڤایەتی پووچەڵ ئەکەنەوە نییانە برِوای بە چاکە ببێ هەرچی چووە ئەویێ بە پارەو بە ژن و ئارەق لە خشتەی ئەبەن ئەیکەن بە جاسووس چووبنە هەر ولاتێك بۆگەنیان کردووە هەر ئەم ئەمریکییانە بوون کە کۆچیان کرد بۆ کیشوەری ئەمریکاو زنجی یەکانیان کۆچ و رەق پێ کرد و قرِیان تێخستن و کردنیانە کۆیلە و بەندەی خۆیان و لە جێگەو نیشتیمانی باوك و باپیری خۆیان رەچەڵەکیان برِینەوە لەناکاو ئەیاندا بە سەریاندا ئەیانکوشتن و ژن و منداڵیان ئەبردن لە بازارِی کۆیلەدا ئەیان فرۆشتن و لە مۆڵگەدا گەمارۆیان ئەدان بە کۆمەڵ ئیش و کاریان پێ ئەکردن وەکو ئاژەڵ ئێستا ژمارەیەکی کەمیان ماوەتەوە بە ئینسانیان ناوانن قێزیان لێ ئەکەنەوە ئەمریکا دوژمنی ئادەمیزادە لە شەیتان بەوەڵەد بووە ئەمە جێگەی ئەوەیە لێیەوە فێری چاکە کردن بین، کە پارەی رەنج و ئارەقی ناوچاوی خۆی ئەنارد بۆ دوو خێزانی کەساس کراو کە تەنها لە گیراوخانەدا پیاوەکانیانی دیوە و خۆش هاتنیان کردووە هەی ئافەرم مرۆڤ دۆست و چاکە پەرست.

* * *

## پارچە شیعرێکی مەلا ئەحمەدی قسرت:

محبوبەیەك بوو کچ دەروێش قادر
خوازبێنیان کرد بۆ دەروێش نادر
پرچی درێژ بوو هەتا ناوشانی
ئادابی تەوبەی هیچ نەئەزانی
تەوبەیان پێ کرد هەر بە زۆرەملێ
هەر ژنێك جوان بوو، ئەیروانییە قولی
رۆژێ لە وەختی نیوەرۆیەکا
گەیشت بە کچێك لە ناو جۆیەکا
جۆ ئاوەنیا بوو وەختی قەف و گوڵ
لە سەحرای بەینی ئالان و حاسڵ

چوار دەوری روانی کەس دیار نییە

نەیزانی تەوبە و تەریقەت چییە؟

بەقین دروستە: مرشد مەیلی هەس

وەم ئاسانییە تۆم کەوتگیە دەس

وەختیَ کە بەدەست گرتی دەستی ژن

وتی تۆ لە عەرش و ریاگی و من

عەساکەی هەلگرت کردی وەپشتا

دەس هاورد وەبان عەسای سەرخشتا

تەزبیحی لوول کرد نایە باخەلی

یەك سوورە عەسای کوتا ناو گەلی

وەك سوورە ئەرخود هەرمیّی خەڕات تاش

چلمی فریّدا وەك لنگە کلاش

پرچی وەك یالی یا بووی عەجەمی

هاتوچۆی ئەکرد لە دەوری دەمی

وتیان تەوبەت کرد وەك کەر ئەتزەڕان

خاس نەتبردە سەر ظریفت پەڕان

دەرویّش وتی:

تەزبیح و عەسا، کەشکۆلَ و بەرمالَ

زیکر و ریازەت تەهلیلە و ئەحوالَ

هیچکامیان لەزەت ئەمیانە نییە

لەوەت ئەمەسا ئەومە بۆچییە

پرچم ئەتاشم لای ئەبەم لە بیّخ

بەرمالَ قەد ئەکەم ئەینیّرمۆ بۆ شیّخ

ئیتر ناچمە لای ئام و شۆی ناکەم

بەلکو بەدزی چیزیَ پەیاکەم

شیربایی تۆ بدەم هەر تۆم دەس کەویَ

ئەم شەرت و قەولە نەدەم لە زەوی

شاعیر ئەڵێت:

گەر درۆ بکەم برا مردوومبم

کەوای تووڵی سەوز لەبەر کردوومبم

* * *

کابرایەك ئەگاتە مەولەوی لەو مەریوانەدا ئەڵێت مامۆستا چی ئەکەیت؟! و خەریکی چیت؟! ئەویش ئەڵێت

گوریسی مەینەت ئەدەم بە شانا کێشەی غەم ئەکەم لە مەریوانا

* * *

خەستەخانە خرۆشا پزیشك داوای راپۆرتی پۆلیس ئەکات و هەر ئەیەوێت خەتای کەس نییە، خۆیان خۆیان لە ئوتۆمبیل فرێ داوە ئەمەیش کەتنەکەیە:

مردوویەك مردبوو لە کەرکوك شوفێری تیوتاکە ئەیباتەوە بۆ هەولێر لەوسەرەوە ئەگەڕێتەوە بارێك هەڵئەگرێت و تەختە شۆرەکەی لەسەر دائەنێ بە جاجم و لێفەو سەرین و دۆشەکەوە وردە وردە بارانیش دەس پێ ئەکات بەرەو کەرکوك ئەکەوێتە رێگا کە تێ ئەپەرێت لە قوشتەپە کابرایەك دەستی لێ رائەگرێت هەڵی ئەگرێت کابرایش دێتە خەیاڵی خۆی بکات بە جەنازەکەدا واتە ناو تەختە شۆرەکە تا باران تەڕی نەکات جێگاکەی.گەرم ئەبێت خەوی لێ ئەکەوێت هەندێك ئەڕوات دوو پیاوی تریش دەستی لێ رائەگرن و سوار ئەبن ئەندازەیەك رێگا ئەبڕن کابرای نووستووی ناو جەنازە تەختە شۆرەکە سەر راست ئەکاتەوە ئەڵێت: مەرحەباتان لێ بێت!! لەگەڵ ئەوە ئەبینن وا ئەزانن مردووەکەیە و لێیان راست ئەبێتەوە هەریەکە بە لایەکدا خۆیان هەڵئەدەنە خوارەوە و سیارەیش ئەڕوات و ئاگای لەم/کارەساتە نییە ئەوانیش سەرو دەست و پەراسوویان ئەشکێت چەند مانگێك لە بیمارخانەدا بۆی ئەکەون..

* * *

## بە دەهۆڵ و زورنا گورگ ئەکوژن:

چەندساڵێك لەمەوبەر ئەگەر دانیشتووانی لادێ کەیف و ئاهەنگیان بگێڕایە ئەچوون کۆمەڵێك چاوشیان ئەهێنا بە دەهۆڵ و زورناوە زەماوەندیان ئەکرد، لە دێیەك لەو ناوچەیەی دەوری کەرکوك واتە یایی چی هەندێك چاوش لەوێ نیشتەجێ بووبوون، بانگ

ئەکران بۆ ئاهەنگ گێڕان چەند سەرێك کاوڕ و گیسکیان وەرگرتبوو لە پاداشتی رەنج و دەهۆڵ و زورنا ژەندن.

شەو گورگ فێربوو بە کاورەکانیان هەر شەوێ یەکدوانێکی لێ ئەخوارد ئەمانیش کەوتنە ئێشك گرتنی، بەڵکو دەرفەتی لێ بێنن... پاش نوێژی عیشا گورگە خۆی کرد بە ژێرخانەکەدا ئەمانیش دەرگایان لێ داخست و کەوتە داوەوە خانووەکە چەند پەنجەرەیەکی بچووکی تێدابوو گەورەکەیان بانگی کرد وەستا ئەڵێ بێژە ئەو دەوڵە منیش زورنا ئەژەنم لەبەر دەم مام گورگ دەستیان پێ کرد گورگە ئەوەندەی غارغارێن کرد لەمسەر بۆ ئەو سەری ژوورەکە ئەمانیش هەر دەوڵ و زورنایان ئەژەند بێ وچان گورگە شێت بووبوو هەر رای ئەکرد ئەنجام بازی دایە سەرکەندوویەك چاوی لە زورنا ژەن و دەهۆڵ کوت تێ بریبوون، هەتا خۆرهەڵات هەر ئەیان کوتا کاتێ کەمێك دەرگایان کردەوە روانییان گورگە گیانی سپاردووە لە ترسی دەهۆڵ و زورنا..

مەلا عبداللە ی دووخ رێس هەبوو لە پێنجوێن لە زەمانی مەلای گەورە زۆر حەزی لە کەباب ئەبێ ئەم شیعرە ئەڵێ بە تێکەلاوی کوردی و عارەبی بۆ مامۆستای ئەنێرێت.

وللأستاذ (مِن) فیة ثواب

كثير الخير بۆ من داك و بابن

لە ژێر پێیدا ئەمن هەر وەك ترابٌ

لَهُ لي كُلَّ يوم "چوار کەبابون"

پەوابێکی ئەوەندە لا حسابٌ

* * *

دوو پیاو هەردووکیان سەروو باوەشێن ئەکرن، ئەو کاتە پانکە دانەهاتبوو پاشی سێچوار یەکێکیان ئەڕوات دیدەنی ئەویتریان ئەکات داوا ئەکات باوەشێنێکی بۆ بێنێ خۆی پێ فێنك بکاتەوە، کە ئەیهێنێ دڕاو ئەبێت لێی ئەپرسێت بۆچی دڕاوە؟ ئەویش لە وەلامدا ئەڵێت چوار دەورم گرت و نەخشاندم زۆر چاك بەلاّم هەر دڕا... ئەویش وتی دیارە تۆ مسریفی، زۆر ئەیخەیتە بەردەست چۆن وا زوو نادڕێت؟ واللە سامن دامناوە لەسەر رەفەکەی ماڵ هەر کە ویستم فێنك بەوە ئەڕۆمە بەردەمی سەرم خول و با ئەدەم لەبەردەمیا وازوو نایەڵم بفەوتێ و بدڕێت.

* * *

## ئەی بڕن ئەمجا ئەیبژێرن!!

داد و دادوەری حزبی کاربەدەست لەم رۆدا وایە!! پیاوێك رای ئەکرد زۆر بەپەلە بوو، لە بەغداوە ئەرۆیشت بۆ بەسراو لەوێوە کە بڕوات بۆ سعودییە لێیان پرسی بۆچی وا تەنگاوی، واترساوی وا سەری خۆت هەڵئەگریت؟!

وتی کاکە ئێوە نازانن لە بەغدا چی روویداوە؟! بە فەرمانی میری هەر کەسێك (٣) گونی هەبێت قتی ئەکەن ئەیبڕن پێیان وت خۆ تۆ سێ گونت نییە بۆچی ئەترسیت؟!! ئەویش وڵامی دانەوە: وتی ئاخر لە پێشا ئەیبڕن ئەمجا ئەیژمێرن ئەگەر لە پێشا بیژمێرن دوایی بیبڕن من خۆم تەرە نەئەکردو وانەئەترسام ئەمە هیچی تێدا نییە ئیجتهادە ئیجتهادیش خێری یان دوانی هەر هەیە.

* * *

## من بۆ باوکی مردووی خەڵك باوکە رۆناکەم:

کاتێك مەلیك غازی بە هەر ئۆینێك بوو کوژرا خەڵکی سادەی عێراق کورد و عەرەبی بۆی ئەگریان رێکەوت وابوو کابرایەکی کەڕ و لاڵیش باوکی ئەمرێت هەرچی ئەبینێت ئەگریەت وا ئەزانێ بۆ باوکی ئەم ئەگرین لەوانیش وایە بۆ مەلیك ئەگریەت زانایەك دێتە وەڵام هەر بژی کەڕ ولاڵ کە بۆ باوکی خەڵکی باوکە رۆ ناکات، کە من خۆم ماڵم وێرانە بەمن چی ئاوەدانی خەڵك لەلام ئاشووبی دەورانە کە پەرژین کەم نەمامی پەڵك.

* * *

## کەربە!!

لەگەڵ ئەو دوو نەزانەی وا ئەزانن

لەگەوجیدا کە هەر زانای جیهانن

کەر بە لە کەر خەستی ئەوانە

کەر نەبی جا بەکافریشت ئەزانن

مامۆستای فەیلەسووف بۆی گێڕامەوە سەربووردی بەسەرهاتی کۆلکە مەلایەك با بڵێین ناوی مەلا سالحە

وتی واتە مەلا سالح ئەرۆیشتم لە کەرکوك بیرم ئەکردەوە ژنێك بخوازم بە مرازی خۆم بێت لەو خەیاڵەدا بووم ژنێکی زۆر جوان کەوتە بەر سەرنجم چۆن مەیل بکەیت وابوو

منیش ناو بەناو تێم ئەڕوانی و سەرنجم لێ ئەگرت و کەوتمە شوێنی تا لە پردی خاسە پەڕینەوە ئەویش زۆر تر خۆی نیشان دام و دڵی بردم ئەمجا رووی کردە بەر قەڵاو لای کردەوە وتی مەلا خۆت ماندوو مەکە من بۆ تۆ نابم و پێکەوە ناگونجێین وتم بۆچی؟ وتی وەرە پێشەوە باراستت پێ بڵێم وتم خۆ من بە شەرع و بە سوونەتی پێغەمبەر تۆم ئەوێ ئەگەر دەست بدات وتی ئاخر من لە رەگەزی ئادەمی و ئینس نیم، من جنم جنۆکەم وتم جا قەیناکات ئەگەر راستم لەگەڵ بکەیت موسوڵمانیش بیت وتی واللە ئیسلامم هەر ئارەزوویشتە وەرە بەدواماماڵمان لە دەواردایە لەوپەڕی شار لەودیوی زێویە بەڵێ کەوتە دوای بە شوێنیا تا لە ملەیەك سەرکەوت کۆمەڵە رەشماڵێك دەرکەوت گەیشتنە ئەوێ ژنەکە رۆیشتە ژوورەوە فەرموو لەمیش کراو جێگە داخرابوو بەکاوەخۆ دانیشت و خێر هاتن کرا زۆر بەرێز و میهرەبانی چاو و قاوەی بۆ هێنرا ژنەکە هاتە پێشەوە رووی کردە باوکی وتی باوکە ئەم مەلایە دڵی لە من چووە حەز ئەکات شووی پێ بکەم وپێیشم وتووە کە من جنی مووسڵمانم رەنگە لەگەڵ یەك نەسازێین باوکی وتی مەلا ئێستا تێگەیشتوویت و نایش ترسێیت ئەمە کچمە و شووی نەکردووە ئەگەر ئەتەوێت فەرموو با لێت مارە بکەم!! ئەمیش وتی زۆرم لا خۆشە بسم اللە......... پیرۆز بێت دەستی ژنی خۆت بگرەو برۆن بەڵێ پێکەوە دێنەوە.. پاشی یەك دوو رۆژێك کەس نازانێ ژنی هێناوە وکەس نایبینێت ئەڵێت ژنەکەی ئەو ژێرخانە پاك بکەرەوە لەوی پێکەوە ئەبین ئەمیش ئەڵێت بۆچی ئەڵێت ئەی گەورەیەو چاکە (زۆریشی خۆش ئەوێت) بەڵێ ماڵ و منداڵ ئەروانن ژێرخانەکە زۆر پاکو خاوێنە، بەلام ئەم لەسەر زەوی رووت دائەنیشێت پێی ئەڵێن کابرا بۆچی رایەخێك لەژێر خۆت راناخەیت؟! وەلامیان ئەداتەوە من لەسەر مافوور دانیشتووم بۆ ئێوە نابینن؟! مەلا ساڵح خۆی ئەیگێڕایەوە لەمەودوا ئەیوت زۆر بەختەوەر بووم هەموو شتێك ئامادەبوو پێویستم بە هیچ شتێك نەبوو من خۆم بە ئاسایی ئەزانی..
و لەوپەڕی خۆشیدا بووم کەچی براکانم کاتێکم زانی پەل بەستیان کردم بۆ لای شێخ ساڵح هەر لە دوورەوە وتی جین گۆریویانە ژنی لێیان خواستووە بەستمیانەوە دارکارییان کردم نان و ئاویان لێ بڕیم دوعایەکیشی نووسی ژنەکەم لە دوورەوە هاواری ئەکرد و ئەگریا و ئەیوت من نەم وت پێکەوە ئیدارە ناکەین شێخ ساڵح بەزۆر پێی تەلاق دام ئێستاکەیش کسپەم لێوە دێت بۆی..

من کە کزەڵم ئەم شیعرەم بۆی هۆنییەوە:

ئینسی خۆی بکوژیت کاری جین ناکات
راستی و راستگۆیی هیچ کەڵکی نادات

بۆ سەرما و گەرما خۆیان چار ئەکەن
لەکەر و شێتی ئێمەی بار ئەکەن

دەڵە دێوی پێش حەزرەتی ئادەم
خۆی ئەکات بە کچ تازە و گوڵبەدەم

تۆیش شێت و ریپاڵ لەکووچەی شاردا
هەڵقرچێ و کزبە لەلای پاساردا

خەڵکیش پێت ئەڵێن چاوی کراوە
بووە بە وەلی لە لیتەو گواوە

دەك ماڵی کەرم وێران کرد لە جین
لە شێخ لە فاڵچی مەکرو رووتی ژن

عەقڵی خۆم نادەم بە جین و بەژن
گەر هەڵم واسن بۆ هەردوو بە گوێن

هەزار رووی هەیە خۆ باری ژیان
ئەمەیش بارێك بوو کە بۆمان نووان

* * *

## نووسەر ئەڵێت:

خوێنەری بەڕێز واللە باللە تاللە هیچ لە خەیاڵما نییە درۆی تیا بێت ئەم خەوە کە سەربووردەی خۆمە و دیومە بە چاوی خۆم لام خۆشە بۆیە ئەینووسمەوە، چونکە ئاوا دەست هەڵبەست ناکرێت بڕوات وابێ منیش سەرم سوڕماوە:

لە ساڵی کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم ئەم لە (گەرمك) ئەم خوێند کە دێیەکە لەلای تەقتەق ئێستا ناحیەیە مامۆستاکەم ناوی مەلا سدیق بوو بەلاتەنیشتی مزگەوتەکەوە حوجرەیەك هەبوو گەورە و درێژ بوو ئەو کاتەیش فانۆس نەبوو یان کەم بوو، شەوگار راشکا پاڵم دابوو بەسەرینەکەمەوە وەك خەو بمباتەوە بێهۆش بووم من ناوی لێ ئەنێم نووستبووم

بانگیان کردم رۆیشتمه دەرەوە دوو کوڕی نەوجەوانی تازە پێگەیشتوو راوێستابوون مەرحەبام کردن گەورەکەیان رووی تێکردم پێشەکی وتی مەترسە ئێمە هەردووکمان ئینس نین، بەلکو جنیین و ئیسلامین و ئەخوێنین گوێ گری دەرس و وانەکەی تۆ ئەکەین و ئەخلاق و رەوشتی تۆمان زۆر لا پەسندە..!

بەلاّم ئێمە خواهیشمان هەیە ئەگەر بڕیاری بدەی بەمەرامی خۆت هیچ ترس و زەبرو زەنگێك ئەوا زۆر سوپاست ئەکەین منیش وتم فەرموون تێم بگەینن لەوانەیە بڕیاری بدەم. وتیان ئێمە باوکمان پادشایە بە مەعلوماتی ئەو گوێ گری وانەی تۆ ئەکەین ئەمانەوێ سەیرانێکی دوور و درێژ سازبکەین، چونکە کەشی بەهارە گەرمیان و کوێستان لەبارە ئایا لەگەڵمان دێیت؟! وتم ئامادەم ئەویش دەستی بۆ راکێشام وتی بەو عەهد و میثاقەی لەلایەن خواوە جبرائیل هێنای بۆ حەزرەتی ئادەم لە نێوان ئێمە و ئێوەدا کافر بم و خوا غەزەبم لێ بگرێت ئەگەر خیانەت بکەم لە تۆ وا بە برا تۆمان قبووڵ کرد بڵێ قبوڵم کرد وتم قبووڵم کرد وتی بەو عەهد و میثاقەی هاتە خوارەوە لەلایەن خواوە جبرائیل هێنای بۆ ئیدریس فضبناکم ئەگەر خیانەت لە تۆ بکەم بڵێ قبووڵم کرد هەروا تا گەیشتە حەزرەتی سلیمان بە دوورو درێژی بە عەرەبی خوێندییەوە ئەمجا تا گەیشتە حەزرەتی پێغەمبەر (ص) دووردی خوای لێ بێت رووی تێکردم وتی جا دڵنیا بوویت؟! وتم بەڵێ وتی نەك هەر خۆت بۆ حەوت پشت و نەوەت عەهدو میثاقە ئێمە زیان بە تۆ نەگەیەنین و بۆمان بکرێت بتپارێزین لە ژیاندا بین. ئەمجا وتیان: ناومان سالارو سەمینە تا بمێنین دیدەنیت ئەکەین لەبەرگو شێوەی دۆست و ناسیاودا، بەلاّم بەزانینی ئێستامان نەء..... وتی تۆ زوبانی ئاخاوتنی ئێمە نازانیت دەمت بکەرەوە دەمم کردەوە تفییە ناو دەمم ئەمجا وتی چاویشت وەکو ئێمە نییە جەماعەتی ئێمە پێت ئەزانن ئەبێ چاوت بگۆڕین کلدانێکی دەرهێنا لە باخەڵیا هەردوو چاوی پێ رشتم وتی ئێستا تەواوە لە ئێمە ئەکەیت پێت نازانن وتیان با بڕۆین رۆیشتین، بەلاّم وەسفی ئەم رۆیشتنە چۆن بکەم... بەرزی لەبەر دەماندا نزم بوو رێك و راست بوو پەستی بەرز ئەوێستا لەبەر قاچماندا و هیچ هەستمان بەماندوو بوون نەئەکرد و وەکو با ئەرۆیشتین تیژو خێرا کاتێك رێمان کەوتە شاخێکی داتاشراوپرسیم ئێرە کوێیە؟ وتیان ئێرە بێستوونە پیاگەراین نەخش و نیگارمان بینی لەوێ رۆیشتین گەیشتینە جێگایەکی تر ئەویش داتاشراو بوو پرسیم ئێرە کوێیە؟ وتیان تەختی سلێمانە، بەلاّم ئافرەتی وای لێ دانیشتبوو زۆر عیملاق بوو، واتە (١٥)م ئەبوون پالّیان دابووەوە یەکجار زۆر درێژ بوون و هەندێکیشیان کورتە بالاّ بوون پرسیم ئەم جۆرە خەڵکەم لا

سەیرە وتیان دەنگ مەکە حەقت نەبێ ئەمانە لە تائیفەی ئێمەن جینن هەمانە وا گەورەیە هەیشە وا بچووکە، بەلاّم ئەم رۆیشتنەمان زۆر خۆشبوو هەر پێکەنین و گەشی بوو هەروایش جارجار هەستم بە بێهۆشییێك ئەکرد زۆر کەم بیرم ئەکردەوە رەنگە ئاسایی نەبم، خێرا لێیان ئەزانی و دڵیان ئەدامەوە و منیش ئەم زانی ئاسایی نیم بە تەواوی.

کاتێك ئەرۆیشتین زۆر گەڕاین ڕێمان کەوتە سەر شاخێکی زۆر بەرز بینیمان تەیارە ئەفرێت هەرچەند بەرز ئەبێتەوە ناگاتە ناو قەدی شاخەکە وتم بۆچی وایە؟ وتیان ئەوە فرۆکەی ئێوەی ئادەمیزادە هەر ئەوەندە ئەتوانێ بەرزبێتەوە.

وتم ئایا چەند رۆژە ئێمە هاتووین؟! پێکەنین وتیان پێنج سەد ساڵە سەرم سوڕما، وتم چی وتیان وایە وتم جا من پیرەژنێکی دایکم هەیە خۆ دیدار ئاخرەت بووم و محرووم بووم لە بینینی و لە خزمەت و عەوێز دانەوەی خۆ ئێستا مردووە!! وتیان ئەم کات و ساڵە بۆ ئێمەیە بۆ تۆ نییە دڵتەنگ مەبە بێ کەڵك بوو باری غەم دایگرتم گرژی و عەبووسی لە روخسارم ئەباری کە زانیان وایە وتیان ئێمە عەهد و میثاقمان لەگەڵ تۆ کردووە فەرموو با بڕۆینەوە بتبەینەوە بۆ حوجرەکەت کاتێك گەیشتینە بەر قاپی مزگەوت وتیان راوێستە کلدانێکی دەرهێنا لە گیرفانی تریا چاوی دووبارە پێ رشتم وتی ئێستا وا هاتیتەوە سەرباری خۆت بێ کەم و زیاد و تۆ لات وایە نووستیت، بەلاّم ئەم حاڵەت و گەردوشە خەو نییە و سەریشت لێ ئەدەین، بەلاّم نامان ناسیت و پێت ناڵێین ئەم لاو ئەولایان ماچ کردم.

کاتێکم زانی وام لەسەر جێگاکەی خۆم، زۆرم بیر ئەکردن بەو شەوە دەستم کرد بە بانگ کردنیان هیچ بێ کەڵك بوو، سەرم سوڕ مابوو بەیانیش هەر بیرم لەو جێگایانە ئەکردەوە کە رۆیشتبووین بۆی و دیبوومان و ئێستا لە یادم نییە خواردنمان خواردبێت یان رووداوی تر بە درێژی، چونکە چل ساڵێك ئەبێت تا ئێستا بۆ خوێنەر سەیرو خۆشە و هیچم پێوە نەناوە کە زۆریشی هەیە لە یادم نەماوە بەزاتی خوا بۆم دروست نەکردووە!! ئیتر سالار و سەمینم نەدیتوەتەوە تا حاڵی حازر.

* * *

جارێکیان کابرایەکی سادە دێتە خزمەتی شێخ کاك ئەحمەد لە سلێمانی ئەویش ئیرشادی ئەکات و پێی ئەڵێت (١٠٫٠٠٠) جار بلێ یا الله (٥٠٫٠٠٠) جار بلێ أستغفرالله (١٠٠٫٠٠٠) قل الله احد هەروا. ئەویش لە دوای ماوەیەك دێتەوە خزمەتی و ئەڵێت:

قوربان ئینسان ئەوەندە جارەی فەرمووت بلێت یا الله خوا تووڕە نابێت؟! ئەلێت نەء ئەلێت بیٚ قەزابیت تۆیش بی تووڕە ئەبیت وەلاٌمی ئەداتەوە وانییە؟ ئەلێت: کاك ئەحمەدی شێخ، کاك ئەحمەدی شێخ کاك ئەحمەدی شێخ و لەگەلێیا سەری ئەکات بەخولخولۆکە و بای ئەدات و بیی لیٚ ئەگرێت تا شێخ تووڕە ئەکات و دەری ئەکات.

* * *

ئەگێڕنەوە لە ئیمامی ئەبو حەنیفەوە: کە کۆمەلێك لە خزمەتیا ئەبێت لە سەفەری حەج و ئاویان لیٚ ئەبڕێت تا پەرێشانی تەماشا ئەکەن کابرایەکی عەرەب وا دێت حوشترێکی بار کردووە لە کوندە ئاو رووبەڕووی ئەوان رێگا ئەکات ئەمیش فەرمووی بچن لێی بکڕن کابرای عەرەب داوای قیمەتێکی خەیالی کرد مثلاً (٢٠) دینار هەرچی هەولیان دا وا نابیٚ زۆر گرانە گوناحە وتی مالی خۆمەو وای ئەفرۆشم ئەبوو حەنیفە فەرمووی پارەکەی بدەنیٚ چەند ئەلێت بەزیادەوە کە وەری ئەگرێت بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ دەعوەتی ئەکەن.

بەلیٚ لەو گشت چێشت و گۆشتە و سفرە رازاوەیە خۆی مرو مەست ئەکات کە لە ماوەی ژیانیدا نەیدیوە و نەیخواردووە پاش ماوەیەك تینووی ئەبێت داوای ئاو ئەکات بیخواتەوە ئەلێن ئێمە ئەیفرۆشین، واتە بە سیعری ئاوەکەی کە فرۆشتوویەتی هەرچەند ئەلێت دروست نییە پێی ئەلێن مالی خۆمانەو وای ئەفرۆشین ئێمە هەر بۆ خواردن دەعوەتمان کردوویت بۆ ئاو دەعوەتمان نەکردوویت کابرای عارەب ناچار ئەبێت هەمووی بە چەند فرۆشتووە بەوەندی خۆی تێر ئاو بکات {جێگەی مست پیٚ لەقەیە}.

* * *

## خەلیفەیەکی عەباسییەکان سوێند ئەخوات:

بەتەلاٌق کە ژنەکەی لە مانگ جوانترە پاشان پرسی مەلاکان ئەکات پێی ئەلێن تەلاٌقی کەوتووە ناچار لیژنەیەك دروستئەکەن بۆ لێکۆلێنەوە و چارەکردنی کەس توانای نەکەوتنی نابێت. گوایە حەزرەتی شافعی مندالٌ ئەبێت ئەلێت من وەلاٌمی راستەقینە ئەدەمەوە لە رۆژی دیاریکراودا بانگی ئەکەن ئەمیش بزنێك لەسەر پشتی حوشترێك قایم ئەکات و ئەڕواتە پێشەوە مەلاو زانای وەخت بە چاوی سووکەوە بەم مندالەدا ئەڕوانن ئەویش ئەلێت ئەگەر بە ریش ئەیکەن لەو بزنە بپرسن؟! ئەگەر بە جەستە و ئەستووری ئەیکەن لەو حوشترە بپرسن لە ولاٌتی ئێمە لەمەی بەرجەستەتر تیا نییە؟! ئەگەر لە عیلم و زانین ئەپرسن من ئەیزانم لە من بپرسن

که پێی ئەڵێن ئەڵێت جەنابی خەلیفە تەلاقت نەکەوتووە، چونکە ژنی ئێوە لە مانگ گەلێك جوانترە خوا لە قورئاندا فەرموویەتی:
(لقد خلقنا الأنسان في احسن تقويم، ولقد كرمنا بني آدم....) جا تەلاقی ئێوە ناکەوێت بەو جۆرە کۆتایی پێ دێت.

* * *

## لە میانەی کێشە و وەلامدانەوەدا!

مامۆستا (خ) دائەنیشێت لە ناو کۆمەڵێك دۆست و ناسیاوی عەرەب، بەم ئەڵێن برا کوردەکان لە رادەبەدەر رەگەز پەرستن کوردایەتی ئەکەن و داوای ئەکەن، گەیشتوونەتە رەگەز پەرستی.
کورد پیاو کوژن ، خوانەترسن خەراپەکارن ئەویش ئەڵێت زۆر راستە لە ساڵی (١٩٦٣) تاوەکو (١٩٦٨) هەر ئەمان بوون دێهاتی عەرەبیان سوتاند و وێران کرد، رێگەیان لێ بەربەست کردن کچیان فەساد کرد منداڵی بچووکیان لە خانوویان سوتاند خانوویان روخان بەسەر برای عەرەبدا خەڵکیان دەسرێژ ئەکرد لەبەردەم کەس و کاریان زیندەبەچاڵیان ئەکرد جاسووسیان لە ناوتاندا دروست ئەکرد کۆڕ و گرووپیان بە کارتۆنی و بە پارە ئافەریدە ئەکرد جەنگ و شەڕیان بەرپاکرد بۆیە خوا لە قورئاندا ئەفەرموێت دەربارەیان (الأكراد أشدَ كفراً ونفاقا... البعث خير أمة أخرجت للناس) وهكذا...
وتیان خوا وای نەفەرمووە حدیسیش وا ناڵێت ئەویش ئەڵێت کەوابوو ئێوەن تا لێتان بپارێتەوە کەساس پتر شێتگیرو ئازار دارتری ئەکەن کلیم ئەڵێ:

اظهار عجزيش ستمكار أبلهيست
أشك كباب باعثى طغيام أتشست

* * *

لە زەمانی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر سنووری ئیسلام کابرایەك لە شام بەولاوە هەر رای ئەکرد بەرەو "حلب " و "ليبيا" ئەرۆیشت وتیان کابرا ماندوو نەبی بۆ کوێ ئەڕۆیت؟! وچیت بیستووە؟! وا تەنگە تاوی؟! وتی لە ترسی مەغۆلەکان و هێرشی جەنگیزییەکان رائەکەم لە وڵات دەرئەچم وتیان وەرە بیگرێرەوە بزانین چیت دیوە یان کردووتە؟!

وتی هیچ نازانم ئەوەندە هەیە لە شاری خەزنە دیتم کابرایەکی تەتەری مەغۆلی هیچ چەك و سیلاحی پیّ نەبوو ئەو خەڵکەی ریز کردبوو یەك یەك لە ماڵ ئەیهێنایە دەر جەلەی ئەکرد منیش یەکێك بووم لەوانە بە کابرایەکی وت بڕۆ چەقۆیەك لە ماڵەوە بێنە ئەمانەی پێ سەرئەبڕم ئەویش چوو هاتەوە چەقۆیەکی تیژی بۆ هێنا بە یەکێکیانی وت بیکە بە سکی ئەویترا، کردی بەیەکێ تریشی وت لێی وەربگرە بیکە بە سکی ئەمدا هەروا تا سەرە گەیشتە من (٣٠) کەسێك بەیەکتری کوژران چەقۆی دایە من کە هاورێکەم بکوژم منیش لێم وەرگرت کردم بە سکی خۆیدا لە قاقای پێکەنیم خست و گیانی دەرچوو هەر یەکە بۆی دەرچوو منیش بۆیە رامکرد، چونکە هەر ئەوانەی لە مردن رزگاریان بووە لەوانەیە گەواهیم لێ بدەن و بمدەنە دەس تەتەرەکان لایان وایە خۆیان پێ رزگار ئەبێت ناتوانێت خۆیشی لەگەڵ من ئەکوژن. و ئەگەر هەر یەکەم کەس وەکو منی بکردایە گشتمان رزگار ئەبووین لە کوشتنی، چونکە تەنها هەر خۆی مابوو لە شارەکە و کەسی نەئەناسی!!!!

* * *

ژنێك چووبووە سەر دارێك مێردەکەی قینی لێ هەڵسا پێی وت: (أنت طالق ان بقيت هكذا، وانت طالق ان صعدت، وأنت طالق ان نزلت)

واتە تەلاقت کەوتبێ ئەگەر هەروا بمێنیتەوە، تەلاقت کەوتبێ ئەگەر سەر بکەویت و تەلاقتیشت بکەوێ ئەگەر بێیتە خوارەوە ژنە فێڵباز بوو خۆی بەلادا فرێدا و کەوت. مەلا وتی بە خوا باوکم بە هەر هەموو ئیمامەکان ناتوانن تەلاقی بخەن، و تەلاقی بدەن!!

* * *

کابرایەك هەبوو لەو ناوچەی هەڵەبجەیە دەم راست و کوێخا بوو، لە جەنگی گشتی دووەمدا کە باسیان ئەکرد ئەڵمانیا سەرکەوتووە، واتە هیتلەر بەسەر نەمساو فەرەنسا و رووسیاو ئینگلیزدا ، توورە ئەبوو چاوی ئەپەرییە پشتی سەری و هەموو خەڵکی بەکەر ئەزانی ئەیوت ئەڵمان ئەڵمان، باسی چی ئەکەن!! ئینگلیز هەر خۆیەتی بووە بە دووبەش یەکەکەی تری ناو لێناوە ئەڵمانیا، ئینگلیز، تا لە ئێمە تێبگات و بزانێت کێ ئینگلیزی ناوێ و گەلانی جیهانی کردووە بە گژی یەکدا با یەکتر بکوژێت چی لەوە؟! بۆ ئەوەیش وا ئەکات هەموویان دامەنگیری بکەن و چەك و سیلاحیان پێ بفرۆشێت و هەرچیش ببات کەس دەنگ نەکات باوکم ناوی مەهێنن با شەڕێکمان بۆ دروستنەکات ماڵ و منداڵمان بە قر

نەدات!! ئینگلیز بێفەرە بێفەر ناوی مەبەن هەرچی ئەڵێت باوکم بە قسەی بکەن بەرد لە ئاسمان بکەوتایەتە، خوارەوە ئەیوت خەتای ئینگلیزە.

*　*　*

مەجلیسێکی گەورە گیراوە، جووتیار و پیاو ماقوولاًن دانیشتوون گوێ ئەگرن لە دیوەخانی حاجی شێخ قادر هەر یەکە قسەیەك ئەکات و ئەیگێڕێتەوە شێخ فەرمانیدا بچن مەلا حەسەنی کوێر لە فلاًنە دێدا بە ئوتۆمبێل بێنن بۆ ئێرە. کە هات هەموو لەبەر هەستان و راست بوونەوە و خێراتر کرا، کۆری دانیشتن گەرم بوو سەماوەر سازکرا ئەمیش لە هەزار وێنە پەند و قسەی نەستەق و سەربووردەی ئەگێڕایەوە مەجلیسی هێنابووە فەرَ یەکێك لێیان پرسی مامۆستا مەلا حەسەن بۆچی ژن ناهێنی؟! هەروا چۆن ژیان ئەبەیتە سەر؟ وتی من ژن ناهێنم چونکە ژنێکی وانییە بە دڵ و عەقڵی من بێت وتیان چۆن نییە؟ مەرجەکانی تۆ چییە؟!

وتی بزانن "بەبێ دەنگ" مەلا عەلی لێرە نییە یان لێرەیە؟ وتیان حازر لێرە دانەنیشتووە وتی باوکم من ئەمەوێت ژنێك بێنم بالاًی بەرز و رەنگی جوان و دەنگی ناسك بێت وەك مەلا عەلی، چونکە مەلا عەلی زۆر شەنگو شۆخ و بالاًی بەرز و دەنگی ناسك و خۆش بوو وەك ئەو وابێت ئەمەوێت لە پاك و خاوێنیدا وەك مەلا حەسەن وابێت چونکە کە رۆیشتە سەر ئاو دەست و قنگی بە سابوون ئەشوات و پاشان دەست و پلی نایەتەوە، ئەمەوێ ئەو ژنەی بیهێنم وا بێت و وەك مەلا عەزیز بێت لە رێکی و پێکی و بێ دەنگیدا، چونکە مەلا عەزیز هەرچی شتێك ئەکات رێکوپێکە و بیکوژە ورتەی لە دەم نایەتە دەرەوە نەچاك ئەدوێ نە خەراپ و ئەمەوێت وەك مەلا محمد وابێت لە رەزیلی و شت خەسار نەکردندا، چونکە فلسێك هەزارو یەکجار حیسابی بۆ ئەکات و هەمیشە ژنانییەو حەزی لێ ئەکات منیش ئەمەوێت وەك ئەم وابێت و وەك ئەم ئاڵۆ شاوی بێت. سواری ملی پیاو بێت جا ئیتر بوو بە پێکەنین و قاقاو بلاًوەی لێکرا.

*　*　*

کابرایەك هەبوو لە ئۆمەر بەگ، برادەرێکی خۆشەویستی خوێنەواری لا دانیشتبوو، لە بارەی ئەمەکداری و دڵسۆزی و رەنجی باوك و ئەولاوەوە ئەدوان:

کابرای یەکەم کورێکی جوانی منداڵی گرتبوو باوەشی خۆی دانیشتبوون لە ژێر دارتوویەکی زۆر گەورە سەری لە کەشکەلانی فەلەك قایم کردبوو بە تەوقە سەرەکەیەوە هێلانە لەقلەقێك لە دێر زەمانەوە لەو بڵندی و بەرزییەوە بە خەڵکیا ئەڕوانی و تەماشای کاروانی و رەوتەنی ئەکرد.

منداڵە بچکۆڵەکەیش هەر دەمە نا دەمێك ئەیوت باوە ئەوە چییە؟! باوکیشی ئەیوت رۆڵە گیان ئەوە هێلانە لەقلەقە تا پرسیارەکەی گەیشتە (٦٦) جار بێ وەرس بوون هیچ جارێك بە ناوی خۆیەوە وەڵامی نەدایەوە هەر ئەیوت رۆڵە گیان، باوکە گیان، بە قوربان، چاوەکەم، حەیاتم، ئەوە هێلانە لەقلەقە. باوکی بێزار نەبوو لە وەڵامدانەوە و شیکردنەوەی تا تێگەیشت تومەزچمەز کابرا لە تەنیشتییەوە گشت جارێك ئەینووسێت و وەڵام دانەوەکە گەیشتووەتە (٦٦) جار.. شەوگار و رۆژگار و زەمانە خۆی رێی خۆی ئەبڕێت و بە هەزاران مێژوو ئەگێڕێتەوە، بەسەر هاتەکان وەکو فلیم لێ ئەداتەوە تا مرۆڤ پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرێت.

هەر لە ژێر هەمان دارەتوەدا دوای (٢٥) ساڵێتر باوکە پیر ئەبێت لەگەڵ هەمان برادەرەکەی زووی دائەنیشن کوڕە بچکۆڵەکەیش ئەگاتە تەمەنی (٢٦) ساڵان باوکی بانگی ئەکات و لێی ئەپرسێت و دەسدرێژ ئەکات بۆ هێلانە لەقلەقەکە و ئەڵێت رۆڵە ئەوە چییە چاوم نابینێت؟! وەڵامی ئەداتەوە باوکە ئەوە هێلانە لەقلەقە دوای چەند پشوویەك دیسان پرسیارەکە دووپات ئەکاتەوە ئەڵێت: ئەوە هێلانە لەقلەقە بە توونديیەکەوە، ئەمجا پاش چارەکە سەعاتێك دیسان ئەپرسێت: ئەوە چییە؟! زۆر بە گرژی و تووڕەییەوە ئەڵێت باوکە ئەوە هێلانە لەقلەقە ئیتر بیبڕەوە چیت کرد؟! ئەم پرسیارە بێ جێگانە چییە ئەیکەیت؟!

باوکیشی پێی ئەڵێت: زۆر راستە (٢٥) ساڵ لەمەوبەر تۆ منداڵ بوویت ئەم برادەرە ئەزانێت تا (٦٦) جار ئەم پرسیارەت لەمن کرد وەرەست نەبوو لە وەڵامدانەوەی کەچی تۆ بە سێجار توند و قەرس بوویت، ئەمەیە ئەرکی باوك و دایك، و ئەوەیشە میهرەبانی ئەولاد ئەوا وس بووم، پەردەی بێدەنگیم دادایەوە!!!!

* * *

پیاوێکی دەوڵەمەندی هەرزەکار ئەڕوات بەلای تاقمێك کچدا گوێ ئەگرێت لێیان باسی یەکێك ئەکەن کە گوایە زۆر کەیبانووە ئەتوانێت بە تاقی تەنها هەشت نۆ میوان بەڕێ بکات، بە گورج و گۆڵی خۆی کچێکی مەکراوی شیتان لە ناویاندا ئەڵێت جا (١٠) میوان چییە؟! من بە مەنجەڵێك چێشت ئەتوانم تابوورێك سووپا بەڕێ بکەم و لێشیان بمێنێتەوە.

کابرا کە گوێی لەم ئاخاوتنە ئەبێت بە دڵیا ئەچێت و ئەنێرێتە خوازبێنی ئەو کچەیان، بە کورتی ئەیهێنێ. پاش ماوەیەك: میوانێکی زۆری دێت (٣٠-٤٠) سوارێك لە زەماوەند

ئەگەڕێنەوە ئەمیش خولکیان ئەکات و گلیان ئەداتەوە. بە ژنە ئەڵێت ئا بتبینم بزانم ئەمڕۆکە چۆن سەرم بەرز ئەکەیتەوە!!

ئەویش ئەڵێت بەسەرچاو خێرا مەنجەڵێك چێشت و شلە لێ ئەنێت، بەڵام پڕی ئەکات لە خوێ و ئەڵێت میوانەکان بکە بە سێ بەشەوە هەر جارەی با تاقمێك نان بخوات، و بۆیان ئەنێرێت هەر یەکەی بە هەزار حاڵ دوو لوقمەی بۆ ئەخورێت و دەس ئەگرنەوە، تاقمێك بەڕێ ئەبێت ئەوانی تریش بەو جۆرە و یەشتا مەنجەڵە چێشت هەروەك خۆی وا ئەبێت ئاوا دەس ئەنێت بە قنگیانەوە..

* * *

## لە نێوان زاوا و خەسو و کوردا:
## بادەمی چەور بێت فەقیرە!!

زاوایەك ئەڕوات بۆ ماڵی خەزووری، بۆ دیدەنی، ئێوارە نان دائەنرێت بۆ کوڕەکەی و زاواکەی پاش نەختێك خەسووەکەی دێت بەخوا بەشە گۆشتی تۆ کەم بوو، ها ئەم یەکدوو گرتکەیش بۆ تۆ بێت، لە دوای پشوویەك دێت بەردەمی زاواکەی چاڵ و خوار ئەکات، و کەوچێك ڕۆنی ئەکاتە بەردەم بەداخ کراوی و ئەڵێت بەردەمی تۆ وشکە!! کوڕەکەی ڕاست ئەبێتەوە. ئەچێت هیزەکە دێنێت ئەڵێت دەمت بکەرەوە بەخوا ئەیکەم بە دەمتا با قوڕگت چەور بێت. بە دایکی ئەڵێت: با دەمی چەور بێت ئەم فەقیرە!! ئێمە هەموو ڕۆن چاوی سوور کردووین، گۆشت بینی گرتووین..

* * *

## بۆ گێڕانەوە باشە!!!
## عەلی وریا ئەڵێت:

تا کچ بابەتی زەم و زەم کار بێ
تا شووکردنی بەدەس کڕیار بێ
مانی نەمانە ژیانی تاڵە
گیان لەبەرێکە زیندە بەچاڵە

کزەلّیش ئەلّێت:

تا کچ بە عەقلّ و بە هۆش و بە فام
پەروەردە بکرێت بە رەفتاری جوان
نەبیّ بە کالاّی فرۆشتن و تام
لە بەشوودانا ناخۆش ئەبیّ ژیان

چیرۆکێکی ڕووداوی ڕاستەقینەیە:

ولاّتی کوردەواری ئێمە یەشتا پەیوەندی بەرهەم هێنان و دەسەلاّتی دەرەباگایەتی زالّە بەسەر هەست و قەوارەی ژیانیدا: لە ژێر ئەو یاساو سایەدا چەند تیئۆر و نەریتێك دروست و سەپێنراوە بەسەریا، ناتوانیّ وا زوو خۆی لیّ رزگار بکات، چونکە بووە بە پارچەیەك لە سروشت و خووی، ژن هێنان و بەشوودان بووە بە کۆسپێکی یەکجار گەورە، بۆ بەدیهێنانی مالّ و خێزانی کامەران .

* * *

مرۆڤی هەستیار ویژدانی زامار و پەست ئەبیّ تەبیاتی هەلّئەچێت و هێلّنج ئەدات، لە زۆر رووداو و کارەسات مەخسەرە ئەوەیە ئەیدەنە پالّ ئاین و بە ئاین بۆیەداری ئەکەن بگرە پیاوانی ئایینی ناتوانیّ خۆی لیّ دەرباز بکات و بێزی لیّ بێتەوە.

ئەم چیرۆکە بەسەرهاتە لایەکی ئەم باسە بە ساکاری ئەخاتەڕوو، مرۆڤ تەنگە نەفەس ئەبیّ بە یاساو نەریتی نەشیاوی چەوتی ناو کومەلّ، کەوا ئەکات راستییەکانی ناو شەرع ئاوەژوو ئەکات و پاساوی ئەدات. هەی نەفرین لە چەرخ!! شیتالّ و لێکدانەوەی بیّ تێبینی قوولّ ئەبێتە هۆی سوود و قازانجی تاقمێك و پێشێل کردنی مافی رەوای هەندێکیتر پارەو سامان و دەستەلاّت ئەبێتە تەوقی لەعنەت و چەمۆلّە لە چارەی ئەوانەی کە بە نارەوا بەراوردی ئەکەن، ئەم و ئەوی پیّ دیل و فریو ئەدەن...

باسەکە، کیّ تاوان بارە؟ من؟ باوکی خۆی، دایکی کیّ کۆمەلّ؟

١. مێرد: تەمەنی حەفتا سالّ پترە، ژنی تر و سێچوار کچ و کوڕی تری هەیە، کۆنە مووچە خۆرە کەنارنشین کراوە، گرگنێکی تێك سمراوی کورتە بالاّیە پەل و مووچەی ئەستوور، ورگێکی پف هەلّماو، چوار شانەو ئەژنۆ قەوی، سەرو ریش تەواو لە ماش و برنج کەوتوو، سمێلّ تاشراو و مل کورت، نووکی بڕۆی تەواو سێبەری لە چاوەکانی کردبوو، چووبوون بە قوولاّ، هەنگاوەکانی پان و لەسەرخۆ بوو، وتووێژی نەرم و سووك، تووکی لامل و بنا گوێی وەك

سووژن بۆ کیف بوونەوە سەریان دەرکێشابوو، لە ئاخاوتنا نارەوان بوو، کوردییەکەی گێرو خوار و چەوت بوو، وا دەرکەوت: یان زۆر گەوج و نەفام، یـان بـێ ئـابڕوو بـێ شـوورەیی شـانەکانی داچەکاندبێ، ناوکە ڕێژوو سووابێ، واتە سیوای هاتبێتەوە لەبەر لاساری شتی لا گرینگ نـەبێ یا بە پێچەوانەوە ئەبێ بڵێین مرۆڤێکە دڵ و دەروون پاك و بـێ خەوشـی، هـەموو کەسـێك لـە ئاوێنەی بێ گەردی باڵا نوما ئەبینێ کەوابوو ئەم جیهانە لای ئەو ئاوی روونی پاکی زەم زەمـە گەردو پیسی هەڵناگرێت، یان کۆمەڵی مێینە لای ئەو بێ نرخ و رەواجە بایەخی هەر هیچ نییە پووکێکی پووچەڵە گرینگ نییە هـەر چـۆن بـیر بکەیتـەوە، رووداو و چـیرۆکەکە دەوری خـۆی بینیوە، تا ئێستاش لە ناو کۆمەڵدا رۆڵی خۆی ئەبینێ.

٢.بووك: ئەم خانمە کەنیشکە تەمەنی هەروا لە نێوان (١٦ — ١٧) دایە باریکەلە، بەژن و قامەتێکی رێك و جوان، بەکەڵەگەتیدا ئەڕوانێت کەمەرێکی باریك لەش و لارێکی پڕ ، بـەرەو قەڵەوی خڕو خرپن، رێگای گرتبووەبەر، روخساری زەردی ئاڵتوونی مەیلـە و سـپی ئەینوانـد، چاوەکانی گەش و کراوە، قژێکی خورمایی دڵ رفێن، زولف و ئەگریجە قرتاو، مەچـەك سـپی و شێوە شیرین، ئێسك سووك و خنجیلانە، لە رواڵـەتا وادیـار بـوو کـە یەشـتا تـەواو مـەمکی نەکردبێ روخساری تازە هیلەسـاودابوو تـا زوڵـف و ئەگریجـەی بەسـەرا شـۆربکاتەوە و سـرنج رابکێشێ چاوەکانی تیژ و گەش پڕ بوون لە سادەیی و بێ خەوشی برۆکانی پڕو مەسـت و تێـر، سەرباری ئەوانە زەهری ناکامی و هەژاری داخی نابوو بەجەرگییەوە مـاکی بـێ بـژێوی و کـەم دەرامەتی بێ خۆراکی و بێ نەوایی وای لێکردبوو ، گوڵی دڵی بە گەشـی دەم نەکاتـەوە نـازی خونچەی دەمی نەپشکوێ، واتە هیچ شتێك شك نابات لە کەرەسەی رازانەوە و ئارایـشت خـۆ جوان کردن متو موور و جل و بەرگی جوان، بۆو بەرامەی خۆش کـە دڵـی کـچانی پـێ خـۆش بکرێت. عەقڵ و ژیریشی بە پێی تەمەنی بوو، وەکو منـداڵی ئـارەزووی لـە غـار غـارێن بـێ بەحێولانێ ئەچوو بە حەوادا ئاگـای لـە جیهـانی خۆشەویـستی و دڵـداری نـەبوو، نەیئـەزانی شووکردن، واتە چی وبەرەو چی ئەڕوات و پاشەڕۆژی بەچی ئەگات و سەر لە کوێ دەرئەهێنێ؟؟ وای ئەزانی جۆرێکە لە کـەیف و ئاهـەنگ، سـەیران و گاڵتـە و گـەپ نووسـتبوو نەیئـەزانی فرۆشراوە هەڵخەڵەتێنراوە دەستی براوە ئەی نەفرەت لە پارەو چەوسانەوە!!

ئەو کیژە بۆنی شـیری خـاو لـە دەمـی ئـەهات، مـاکی باسـەکەیە، هـەوێن و نـاوەڕۆکی چیرۆکەکەیە، بەدەگمەن هەڵ ئەکەوێت لە کۆڕ و کۆمەڵدا یەکێك رێك بگرێتە بەر وبەرهەڵستی لێشاوی گۆڕانکاری بکات و پاڵێك بنێت لەلایەن خۆیەوە بە داهاتی تازەو قایل بێـت بـە بـیرو باوەڕی رووناك و تازەی هاوچەرخ مامۆسـتا پیـاوێکی ئـاییینی بـوو، هـۆگری مەتاڵـە کردنـی

پەرتووکی پێشکەوتوو بوو وێڵ بوو بە دوای نووسراوی ئاگرینا، داهاتی تازە کاری تێکردبوو، گۆڤار و رۆژنامەکانی لە ئاسمان ئەقۆزتەوە ئەمەیش لە ئاخاوتن و وتووێژدا رەنگی ئەدایەوە جا ئەمەو چەند شتێکیتر بووبوون بە هۆی تانە و تەشەری ئاراستەبووی لە ناوچەکەدا ئاسوودەو حەوانەوەی نەبوو ، دڵ تەنگ و پەژاراوی بێ رێگای پشوودان بۆیە ویستی بایەکی باڵی خۆی بدات و رۆیشتنێك بکات، لەو کاتەدا بوو باری رامیاری ئاڵۆز و شێواو بوو، بە ئاژاوە ئاسمانی نیشتیمان تەنرابوو، هەردەم دەنگ و باسێك ئەگەیشت، فلان گیرا، فیسار دوورخرایەوە هەندێك قوتابی خراونەتە ژێر چاودێری و هەندێکیش دەرکراون، سازمان چستو چالاکی خۆیان ئەسەلمێنێ و هەندێك دابڕاون لە خوێندن بۆ ماوەیەك خۆپێشاندانی بێزاری لە شارەکان تەمی نەئەرەوییەوە ئەویش بە دوای ئەم باسانەدا وێڵ و سەرگەردان بوو، والا بێژی ئەکرد، هەڵوێستی خۆی وەرئەگرت و تەنگەنەفەس ئەبوو، پێشی ئەخواردەوە. چەکمە رەقەکان و چڵکاو خۆرەکانی میری چاودێری مرۆڤی هەستداریان ئەکرد، بە تایبەتی کۆڵانەکانی ناوچەکە هەر ئەوان بوون توانیبوویان بیروباوەڕی رامیاری ناشیاو بلکێنن پیایداو ناوی بزرێنن ئیخباریان ئەکرد و ئەیان بردو ئەیان هێنا مانگێ چەند جارێك بە نارەوا...

سۆزی بەیانی زوو چاکی کرد بەلادا بۆ دیدەنی چەند دۆستێك و بۆ هاوبەشی کردنی خەم و پەژارەو گرێی دڵ کردنەوە دانیشتووانی دێی... لیپان لیپ لە ئاژاوە و بەرگە گرتن دژایەتی و ناکۆکی لەگەڵ شێخە کۆلاکەکان، کە پیاوێکیان بە ئاشکراو لە نوێژی نیوەڕۆدا کوشتبوو و دێیەکەشیان تالان کردبوو و دانیشتووانیان ئاوارە و دەربەدەری ولاتان کردبوو، لە دواوە دوو جوتیاریشیان کوشتبوو و میری و کاربەدەستانی ئەو کاتە نەهاتن بە دەنگ و هاواریانەوە، و دادیان بێ داد مایەوە.

هەر وا ئەم دەربەگانە چاوەدێرییان خستبووە سەر ئەو مەلا مرۆڤە نەبادا رێگایان نیشان بدات و ئاگاداریان بکاتەوە، و لە دادگادا زاڵبن بەسەر شێخە چەپەڵەکاندا ئێستا ئەو دێیە وێرانەیە کونەپەپوو، قەل و داڵ تیا ئەخوێنێ ئەو تاوانانە هەر داپۆشراوە تا ئیمرۆ... بەیانی زوو راستیان کردەوە لە خەو، نامەیەکیان دایە دەست لەلایەن مەلا چاکی ناحیەی سرۆچك بە فەرمانی مدیر و کارگێڕی ناوچەکە کە خێرا بگەڕێتەوە.. ئەبێ شتێك رەخسا بێت؟! تاوانێکیان ساز کردبێت!! بیانوویەکی پێ نەگرن؟!

گەڕایەوە..... نەخێر مەسئەلە هیچ نییە، سادەیە ئەوەیە ئەبێت کچێك مارە بکرێت لە... هەموو لایەك رازین، مدیر فەرمانی داوە، لێی کۆڵیوەتەوە پارەو پایە تەوقی نەفرەتن لە

گەردەنی ئەوانەی رەویەی دین و یاسا ئەگۆڕن و ئەکرێن بە دەس کەلا بۆ گەیاندنە ئامانج و نواندنی شکۆ بەسەر مرۆڤی لاواز و بێ تین، بە تایبەتی بەسەر ئافرەت کە نەتوانێ پڕ بەدەم هاوار بکات و بڵێت خەڵکینە خۆم نافرۆشم زیندە بە چاڵم مەکەن منیش مرۆڤم گیانم هەیە هەست و شعورم وەك پیاوە ئازار و ئەشکەنجە و خۆشی ئەم بزوێنی بەهەر بیانوویەك بێت لە چوار چێوەی تێگەیشتن دەرناچێت و دەستەڵاتم نییە.

دایکی راستەقینەی خۆی نەبوو تەنگە تاویش کرابوو باوکی دەمی شیرین کرابوو بە پریاسکە پارە ئاخنرابوو رێکخستنی ئەم کارە زۆر دژوارە ئەبێ بە هۆی بریندارکردنی هەست و ویژدان لام وایە تێکدانی شتێکی بەجێترە.

کاتێ چوو، وەکو بۆ زۆر کاری وا رۆیشتووە نەیکردووە، باوکی کچ هەر ئامینی لەسەر بوو زڕدایکی کچە لە خشتەی بردبوو تەفرەی دابوو خستبوویە سەر فاکو فیك شووکردنی لێکردبوو بە شانەی هەنگوین ئەو پەڕی کامەرانی ژیانە، ئەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتییە چۆن چارە ئەکرێت؟! ئەم پەتا کوشندەیە لەناو ئەبرێت؟!

شووکردن: واتە گەیاندنی دوو کەس بۆ دروستکردنی خێزان و خستنەوەی نەوەی تازە و ژیانی هاوجۆر گوزەرانی هاوبەش، بێ دەسکاری ئەم و ئەو مامەڵە پێ کردن و دەستتێوەردانی کەس هەڵبژاردەی خۆشەویستی هاوسەر و هاو تەمەن و میهرەبانی ئەمەیە نابێتە هۆی ئەشکەنجە و فرمێسکی نهێنی پتو بۆڵە و ئاهوو ناڵە پەژارەو ناپاکی شاراوە لە یەکتر.

پرسیار.. کچەکە: تۆ شوو بەم پیاوە پیرە ئەکەیت؟!

دڵت ئەیگرێت؟؟ مارەت بکەم لەم پیرە کەنەفتە بێ هیزە؟! ئەوانی مناڵ و ژنی تری هەیە؟! ئەوان سبەینێ ئاشت ئەبنەوە، پاڵەپەستۆی تۆ ئەکەن تەمەنی چووەتەساڵەوە ئەوانەت لێك داوەتەوە؟!

تۆ تەڕی بەهاری تەمەنتە، ئەمیش زوو ئەمرێت بێوەژن ئەکەویت ئایا هەڵ نەخەڵەتاوی؟ ترس و گەف و هەڕەشەیان نەخستووەتە بەرت؟! فریو نەدراویت؟ کە بووی بە ژنی ئەم پیاوە رێگات لێ ئەبڕێتەوە سەربەستیت لێ قەدەغە ئەکات؟! ئایا بە قسەی ئەکەیت؟!

وەڵام: بەڵێ ئەمانەی ئەیفەرموویت هەمووی ئەزانم شووی پێ ئەکەم و پێی رازیم، ئەم پیاوە کەڵکی پیاوەتی پێوە نەماوە، ژنیش بێ سەرجێیی چ خۆشییەك لە شووکردن ئەبینێ؟؟ شتێك هەیە چاك بزانە ئەم پیاوە دنیا دیدەیە... رەنگە دڵ پیس بکات لێت، خانە گومان بێت

قسه لەگەڵ هەر کەس بکەی، هەر چەند پاك و خاوێن بیت لێت دوو دڵ ئەبێت لەوانەیە گومان لە ژن و منداڵ و هەرزەکار بکات، لە هەموو شتێکی ئەم سەر زەمینە بە گومان ئەبێت ئێستا چی ئەڵێیت؟؟

ئەڵێم بەڵێ، رازیم بەڵێ

کەوابوو با هەموو رۆژێك کاو کۆزەری بەربای عومرت بگرێتەوە پیرۆزت بێت، شل کوتست بکات من گوناهی تۆ لە گەردەن ناگرم.

خالۆ وتی: مامۆستا تۆ هاتوویت تێکی بدەیت نەك مارەی بکەیت، کەی ئەمە رەویەی پیاوی خوایە؟؟

گوێ بگرە ژن هێنەر:

تۆ بەرکەنار کراویت، ژنی تریشت هەیە ئایا راستە تۆ کچەکەی خۆت بدەیت بە پیاوێکی وا لە تەمەنی خۆتا؟؟ ئەگەر تۆ خۆت ئاڵوگۆڕ بکەیتەوە، لە بارەی دەروونی ئەم کچەوە شووت پێ ئەکرد؟! لەوانەیە بە زۆری پارە ئەم کچە بکڕیت بەلاَم دڵی هەر هی خۆیەتی پێشەکی حیساب بۆ خۆت بکە، واتە تۆ ژنێك ناهێنی لەگەڵیا بحەسێیتەوە بیکەیتە خاوەن ماڵ و منداڵ، سبەی ئەم کچە کامڵ ئەبێ، رەسیدە ئەبێ ئەندامەکانی لەشی پێ ئەگات و تێ ئەگات هۆش ئەکاتەوە دەستێ بە خۆیدا ئەهێنێ وەك هەموو کەسێکی تر خواستی هاوجوتی راستەقینە ئەکات بیری زوڵم لێکراوی لە خۆی ئەکاتەوە، واتە خراوەتە باوەش و ئامێزی پیرێکەوە لە باوکی بەتەمەنترە، مرخی پیاوەتیت لە جوڵە و بزواندن ئەکەوێت واتەی سەرە بزوتکی پیاوەتیت گەرمی و توندی تیا نامێنێ کە زانی سروشت مافی رەوای خۆی داوەتێ و لێی زەوتکراوە و نەفسی هەر برسی بێ بە ناچاری ئەکەوێتە خەیاڵ و تەپ و تل رۆژی رەشی خۆی ئەبینێ بە چاو، جا ئەبێ تەمەنی لاوی سیس بکات بە دیار پیرێکەوە ئەبێتە کۆتەرەی وشك بە دیار یەکدوو منداڵێکەوە ئەبێ هەر تف لە بەختی رەشی خۆی بکات و نەفرین لە چەرخ و چەمۆڵە لە گەردوون.

ئەمەیە ژنان خۆیان ئەڵێن: (نە بە بەرخی تێر گیاو نە بە کاوڕی تێر کاو جۆ و پووش) کە زانی پیاوی خوا گرتوو بە ناوی شەرعەوە ئافرەت دیل و بەند ئەکەن باوك بە خوێن دەس دائەنێن و زیندە بە چاڵیان کردووە ئەم کارە ئاوی ناوچەوانی مرۆڤایەتی لە خەجاڵەتا ئارەق ئەرێژێ ئەو کاتە تف لە هەموو کلێشەی کۆمەلاَیەتی ئەکات بیری تۆڵەسەندنەوە ئەکاتەوە جا کەوابوو چاوەڕوانی ئەمانە بکە:

١. لەو پەڕی دیمەنی ئارایشتدا خۆی ئەرازێنێتەوە و ئەڕوانێ بۆ هەموو لاوێك.

٢. تۆڵەت لێ ئەکاتەوە هەر کاتێ دەرفەتی بینی.

٣. هاتوچۆی ناشیاو ئەکات بە ئەنقەست نایەتەوە تا زیڕەت پێ ئەکات.

٤. نایەڵێت کردەت یەکبگرێت ئەیبەخشێت، دڵی بە ماڵ و حاڵت ناسوتێت.

٥. بە چاك و خراپ هەر ئەبۆڵێنێ، ئاخ، ئۆف، توانج و بیانوو و گرتن، تۆران، بگرە سەری خۆی ئەڵبگرێت و بڕوات بۆ هەندەران لە فرۆشکادا بچێتە هەراجخانە.

٦. هیچ دوور نییە بە کەوڵە کۆن ناوت نەبات یا پەیوەندی نهێنی پەیدا بکات هەر ئەبێ تینوێتی خۆی بشکێنێ تۆیش هەر بقرخێنە.

٧. ئەو بەرەو جوانی و توندوتۆڵی، لەش و لاری تەڕ و پڕ ئەڕوات تۆیش لارە خوار ئەکەویت، بە کورتی لە پشتی دەستت بنووسە تاوانبار سەر شۆڕ دیوت.

وتی مامۆستا:

ماشاڵڵا مزگێنی خێرت هێنا!! کچە گوێی شل کردبوو، ئەمە شتێکی مسۆگەرە نەك شەرعییە بەلای هەموو کەسێکەوە میرم.

لە ولاتا باوە ئەکرێت هەر من نیم بە تەنها أصولیاتی رووکەشم بەجێ هێنا و رۆیشتم جارم دا کە شەرع وا نالێت وەخت و کاتی خۆی هەیە لە بەراوردا، خوا هەڵناگرێت، بەلام کار لە کار ترازا هەر کرا بە فەرمانی مدیر رەزای دایك و باوکی قایلبوونی خۆی، شهادەتی شاهیدی زانا. وەکو زانیم گواستییەوە لەگەڵ خۆی بردی بۆ زۆر جێگا و هەرچیم دەستنیشان کردبوو وا هاتە دی.

ئیتر بەڕێزەکان پێم بڵێن کێ تاوانبارە؟!!

ئوستادم چاکی تەربیە کردم
لە حیلە شەرعی رزگاری کردم
زیندە بە چاڵی کچان هەر ماوە
دەرەبەگ سەگە راستی دۆڕاوە
بە مارەیی زۆر جیهازی مۆدێل
کچان ئەفرۆشن حەق ئەیکەن پێ شێل
لەگەڵ کزەڵدا هاتووچۆ ئەکەم
من رزگارم بوو بانگی تۆ ئەکەم

* * *

**جەنابی بەگ زۆر رەوانبێژە:**
بانگی نۆکەرەکانی ئەکات بەگ "..... " درەنگە دەی درەنگە دەی!!
قوربان چی بکەین؟! حازرین لە خزمەتا فەرموو بەگ ئەڵێت شێخ لغاو بکەین دەستی ئەسپەکان زیارەت ئەکەین جا ئەڕۆین کەس نەڵێ تانجی چاکیان هەیە دەروێش تانجی توتکە مارف نەبێ..

* * *

**لە مەلای شەشۆیان پرسی:**
کوڕە دەنگوباس چییە؟! وەڵام حەمەد بۆ خوا هیچ نییە، تەنها لە رێگەدا نەبێ وتیان: حاجی گۆمەی کانی حەسەن ئەمریان کرد عەرزی خوای کردووە کوڕە تۆ کێیت؟ وتی: من شێخ ماسی کونە مستەفام.
ئابرا!! ئەو بەرخانە چەندیان نێرە و چەندیان مێیە؟؟ کابرای شوانە وتی گەورەم دوانیان نێرە و سییانیان نێرە جا کەوابوو بۆ ناڵێیت هەر نێریان پێنجیان نێرن.

* * *

کابرایەك لە سەفەردا ئەبێت، شەو لە خەودا ئەبینێت دوو بەران شەڕیانە لەسەر کۆشی ژنەکەی، و شەڕە قۆچ ئەکەن و خوێن لە عەورەتی دێت ئەمیش کاتێك بەخەبەر دێت ئەچێت بۆلای مەلا چاکی زوشارە و لێی ئەپرسێت کە تەعبیری بۆ بکات، چونکە دڵی لە ژنەکەی کرمێ ئەبێت.
مەلایش پێی ئەڵێت دڵت هیچ نەکات ئەوە ژنەکەت بەری هەڵپاچیوە و خۆی پاك کردۆتەوە کە گوایە مێردەکەی ئەڕواتەوە بەو زووانە ونیشانەیش ئەوەیە نەختێکی لێ بریوە خوێنی لێ هاتووە چویتەوە تێ ئەگەیت.

* * *

ئافرەتێکی سەرەی لادێیی کچەکەی لە شار شوو ئەکات و ماڵیان لە ئیسکان ئەبێت کە هەموو خانووەکان لە یەك رەنگ و قاڵب دروستکراوە یەك هەندەسە و یەك شێوە.
جا لەگەڵ کچەکەیدا ئەڕواتە دەرەوە لە بەردەم ماڵ کچەکەی وێڵ ئەکات و خۆی ئەکات بە ماڵێکی تردا، ئەبینێ سێچوار کەس دانیشتوون لە ژوورەوە خێرا دێتە دەرەوە بانگی کچەکەی ئەکات: خێراکە بێرەوە، چونکە سێچوار میوانتان هاتووە دانیشتوون لە ژوورەوە کەس نییە خزمەتیان بکات نازانێ کە ماڵەکەی لێ تێك چووە!! و دەس بەخێر هاتنیان ئەکات بە گەرم و گوڕی.

* * *

کابرایەك هەبوو لە کەرکوك هەر خەریکی زەرعات سەوزە ئەبێت و لە پاشدا ئەچێت بۆ حەج و ئەبێت بە مرۆڤێکی چاکو خواپەرست، جارێك باسی دێتە کایە خەڵکی ئەڵێن پیاوێکی بە دینە نیازی وایە دووبارە بڕواتەوە بۆ حەج، یەکێك لەوێدا ئەبێت ئەڵێت واللە درۆیە بێ دینە (٢٥) بەرمیل گووی منی خواردووە پارەکەی نەدامێ کە بۆم بردووە.

*　　*　　*

کابرایەکی ئەو خۆشناوەتییە کەرێکی ئەگا زۆری پێ خۆش ئەبێت لەزەتی پێ ئەگات و ئەڵێت:
ئاخ بازنەکەت لە دەست بایە، خرخاڵەکەت لە پێدا بایە، خەناوکەکەت لە ملدا بوایە بە خودا بە کیژی میریم نەدەگۆڕیتەوە.

*　　*　　*

شێخ (عصام الدین عەوەضانی) هەبوو، ئەیوت حەزرەتی (محمد) سەرکەوتووە بەسەر دوژمنیدا خواو مەلائیکەی لەگەڵدا بوو، ئەویارانە دڵسۆزانەی لەگەڵ بووە خوای لە پشت بووە من هیچ لام هونەر نییە، بەڵام ئازایەتی بۆ شێخ سەلامەتە کە کەسی لە پشت نییە توانیویە لایەکی سلێمانی کافر بکات!! هەر بە تاقی تەنیا.

*　　*　　*

لە شیعرەکانی مامۆستا مەلا قادر:

تبد لوا طریقة الکیلانی　　بالیشم والاقط والأدهان
"أولهم" کریم کەس نەزانی　　ثانیهم المشهور "بالمل" پانی
"ثالثهم "لا سوتەڵەی چرچە قەلاّ　　"رابعهم" کابرا زلەی پرتەقڵە
"خامسهم" رۆفەکەی ورگ کیتەڵە　　"سادسهم" شێخ حسینی سەر چیتەڵە
بە تایبەتی جاسووسەکەی ورگ مەشکەڵە　　عمیلەکەی بێ دینەکەی بێ حەوسەڵە
"وکلهم" مووچە خۆری موخابەرە　　وحزبهم فی تکیە المجادلە
أعد عدوَ دیننا الأسلامی　　کزاروا شیخنا الامامی
"هم الشیوخ" خاریج نییە لەم مەسئەلە　　جاش و سەگی مەلعونەکەی خۆ سووکەڵە

*　　*　　*

کابرایەك هەبوو شۆرەتی دەرکردبوو کە زۆر عاقڵە مام "حەمە" جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك پیاو دانیشتبوون سەرنجیان لە دەشت و دەر ئەگرت سێ ئافرەت رووبەڕوویان ئەهاتن لە ناکاو تفەنگێك تەقی هەر یەکێ لە ئافرەتەکان کارێکی کرد یەکێکیان دەستی برد بۆ ناو گەڵی یەکێتریان دەستی برد بۆ مەمکی ئەویتریان دەستی برد بۆ سکی مامە "حەمە" وتی ئەویان کچە کە دەستی برد بۆ ناو گەڵی و ئەو یان دەستی گرت بە مەمکییەوە ژنەو منداڵی بە بەرەوەیە و ئەویشیان کە دەستی گرت بە سکییەوە دوو گیانە کە رۆیشت لێیان پرسین وابوو چونکە هەر یەکەیان چی لا گرنگ بوو مەبەستی بوو ئەیویست ئەوە بپارێزێت.

* * *

## دەروێش بە دەروێش!!

کابرایەك ئەچێتە تەکییەیەك لای شێخ تەریقەت وەرئەگرێت هەفتەیەك لای شێخ ئەمێنێتەوە جا ئەگەڕێتەوە، لە رێگا تووشی قافلەیەك ئەبێت کاتی نیوەڕۆ بار ئەخەن ئەحەسێنەوە ئەڵێن با نوێژ بکەین، ئەوان بەجێ دێڵێت ئەگاتە کۆمەڵێك جوولەکە ئەوانیش کاتی نوێژیان دێت دەس بە نوێژی خۆیان ئەکەن وازیش لەوان دێنێ تووشی کۆمەڵێك مەسیحی و گاور و دیان ئەبێت ئەوانیش ئەگەنە کەنیسەیەك رائەکەن لەوێ عیبادەت بکەن، لەوانیش دەس بەردار ئەبێت تووشی ئەبێت بە تووشی کۆمەڵێك کە لە ماڵی شێخ دێنەوە لەگەڵیان ئەڕوات بەیانی یەکێك ئەڵێت با نوێژ بکەین ئەمجا بڕۆین، ئەویتر ئەڵێت کوڕە دەروێش بە دەروێش نوێژی ناوێت، بۆ نیوەڕۆ هەروا پێی ئەڵێت دەروێش بە دەروێش!!

بۆ مەغریب و عیشا هەروا پێی ئەڵێت ماڵوێران دەروێش بە دەروێش ئەم نوێژ و مێژەی ناوێت...

ئەمجا ئەم ئەڵێت باوکم ئەمە باری منە "هەر دەروێش ئەبم" کە نوێژ و قینگ شۆرین و بەزمی ناوێت.

* * *

مەلا عەلی بۆی گێڕامەوە: کە گوایا جارێك ئەڕواتە سلێمانی کە ئەبێ رەسمێك بگرێت بۆ معاملەی ئیمتحانی عیلمی و تێپەربوون لە سەربازی ئەمیش لەگەڵ مەلا عومەری برای

ئەڕۆنە لای یەحیای ڕەسمگر کە ڕەسم بگرێت، سەرو ڕەسمێکیان ئەگرێت و خێـرا تەسـلیمیان ئەکاتەوە هەر کەس هـی خـۆی وەرئـەگرێت (جـا مـەلا عـەلی) وەکـو خـۆی ئـەیلێت زۆر سووراوەتەوە و گەڕاوە هیلاك و ماندوو بووە، ئارەقەی کردۆتەوە وێنەکەی ناشرین دەرئەچێت ئەمیش ڕازی نابێت و تووڕە ئەبێت و پەلاماری ئەدات، مەلا عومەریش ئەکەوێتە بـەینیان مام یحی ی ڕەسمگر ئەلێت (باوکم ئەمن خەتا چییە لێم)؟! پیاو چاك و جـوان بێنـە لـە مـن ڕەسم جوان دەیدەم لە خۆی، پیاو ناشرین بێنی لە من ڕەسم ناشرین دەیدەم لە خۆی، من چی بلێم خۆت جوان نیت چۆنت جوان بکەم؟! کێفی خۆتە؟.

* * *

هەروا محەمەدی کوڕی گێڕایەوە: کە گوایە لە (١٩٧٢ — ١٩٧٣) کە خەڵکی ڕۆیـشتبوونە دەرەوە لەبەر نیسکۆی شۆڕشی ئەیلوول مەلا مستەفا، شێخ حسێن هـەبوو دۆسـتایەتی ئـەبێ لەگەڵ (دکتۆر ئومێد) بە هۆی ئاش نسکۆی شۆڕشی ئـەیلوول لەگـەڵیا پەیـدای کردبـوو، کـە خەڵکی هاتنەوە ئەم شێخ (حسێن)ە نەخۆش ئەکەوێت دێت بۆ لای دکتـۆری بـرادەری و چـاکو چۆنی ئەکەن ئیعتـزار دێنێتەوە بۆی کە گوایە تەنەکەیەك هەنگوینی بۆ دانا بـوو بـۆی بێنێـت نەیپەرژاوە دەرفەتی نەبوو لەبەر نەخۆشییەکەی ئەویش پێی ئەلێت: قەیناکات هـیچ پێویـست بەو ئەرکە ناکات.

لەوەدوا ڕایئەکێشێت و ئەیپشکنێ بۆی ئەنووسێت (تحلیل)ی أدرارو پیسییەکە بیبـات لـە تاقیگـە بیکات و بۆی بێنێتەوە پاشی نیو سەعاتێك ئەچـێتە ئـاودەس لـە سـادەیی خـۆی تەنەکەیـەك پیـسی ئەکات و بۆی دێنێ بە نیخەنیخ، و دای ئەنێ و جوان دایپۆشیوە، دکتۆر لای وا ئـەبێت کـە هەنگوینـە بەڵێنی پێ دراوە کە ئەلێت کاکە شێخ بۆچی شەرمەزارت کردین ئەم ئەرکەی پێویست نەئەکرد بـاوکم!! بۆ وا بە پەلە ئەم هەنگوینەت هێنا ئەویش ئـەلێت بـەقوربان ببـوورە ئـەوە گوەکەیـە کـە داوات کـرد فەحسی بکە بۆم ئەوماوە ئەویش ئەلێت باوکم ئەی بۆچی ناچـیت بـۆ بـەکرەجۆ بـە سێـچوار ئەوەنـدە کێڵگەی ئەوێی پێ پەین بکەیت!!

* * *

مەلایەك لە هەولێر ئەڕوات وێنەی بگرن لە وێنەخانە بە خێرا، خاوەن سـتۆدیۆ جیهازەکـە دێنێت ئامادەی ئەکات چرکەی لێدێت و چەخماخەیەك ئەدات، مەلایش خێرا ئـەلێت: (سـبحان

من يسبح الرعد بحمدة والملائكة من خيفقـه) بابم ئەم چەخماخەیە لە کێوە هاتــە ئــەم ژوورەی؟!
خۆ هیچ هەوری بە ئاسمانەوە نییە؟!

* * *

## منیش بڕوام پێی نییە، بەڵام بڵێم چی؟!

ئافرەتێکی خزمم هەبوو ناوی شەمسە بوو، هاتە لام داوای کرد دوعایەکی بۆ بنووسـم، چـونکە بەرەمەشکەکەی بە جادوو ئەفسوون ئەدزرێت، واتە ژنەکانی هاوسێی ماڵیان سیحری لێ ئەکەن.

منیش وتم تێناگەم بۆم بگێڕەوە ئەمە چۆن ئەکرێت؟!! ئایا خۆت کردووتە؟! وتــی بــەڵێ زوو لە داخی هاوسێکان کردم و ئێستا گوناحە نایکەم تۆ دوعایەکم بـۆ بکـە منـیش پێـت ئەڵێم چۆن ئەکرێت:

ئافرەتی لێهاتوو مەکرباز، دووکیتەڵە، یام دیزە یـا هـەر دەفرێـك بێـت ئـەیهێنێ دوور لەیـەك دایئەنێ بەرانبەر بە یەکتری ئەو جێگایە وا چاکە لە ژێر خان و پشتیرا بێت و کەس پێی نەزانێ و لای کەس نەوترێت. هەردووکیان دائەپۆشرێن سەریان ئەنرێتەوە هەموو رۆژێك بەرە مەشـکەکە ئەخرێتـە یەکێکیان و ناوێکیان لێ ئەنێ، بە نۆبە هەر رۆژێك بەرە مەشـکەکەی تـێ ئـەخرێت و دێتـە سـەر ئەوەیان کە بەشی نەدراوە لووتە شەقێکی لاقرتێ تێ هەڵئەدات بڕۆ بۆ خۆت بەشـی خـۆت پەیاکـە هەی کونی بێ دەسەڵاتی هیچ لەبار نەبوو ئازابە ئەگینا بەر شەقت ئەدەم، وا هەرچی لێرەیە لەوان وا خستمە ژێر رکێفی تۆوە یارمەتیت ئەدەن و بۆت دێنن بڕۆ زل حورت چاوت دەردێنم هـەموو لایـەك لەعنەتت لێ ئەکەن با بە ئاشکرا لێت ببینم!! ئەگەر کردت ئافەرینت ئەکەم کیتەڵەکەی خۆم.

بۆ سبەینێ بەرە مەشـکەکە ئەخاتـە ئـەمیان و وابـە ئـەویتریان ئـەڵێت کـە دوێنـێ بـەو کیتەڵەکەی تری وتبوو ئەمەیش لە بەهاردا ئەبێت.

رۆژ بە رۆژ بە ئاشکراو بە رووتی ئەبینێ لە زۆربووندایە کەرێو بەرەمەشـکەی ئـیتر زیـرەو هاوار لە ژنانی هاوماڵ و جیران هەڵ ئەسێت و زۆر جار بووە کە قورئانیان ئەگێرا بە کۆلانـدا و هاواریان ئەکرد هەر ئافرەتێك شتی وای کردووە گوناحە وازی لێ بێنێ و نایکات.

منیش بەڵێ دوعایەکم بۆ نووسی و دامێ کە بە عەقڵی خۆم چاك بێـت، کەچـی هاتـەوە بـەروو خۆشییەوە بەرەمەشکەیەکی بۆ هێنام وتی رزگارم بوو ئێستا دزیم لێ ناکرێت.

ئەوەی بۆ ئازیز خۆی ئەکوژێ و ئەمرێ

به تین و برسی که ئازار بدرێ
سەد ئازیز ئەدا بە قومێك ئاو و نان
هەی تف لە گۆڕی ئەیکا بە قوربان
لەبەرژەوەندی خۆیدا ئەبینێ کار و رەفتاری
کە سوودمەند ئەبێ بۆ خۆی ماندووکا؟! لە گریەو زاری
هەزار کۆلکە شێخ ئەکەم بە قوربان سەگی بەرماڵی
ئەوەی کە بگرێت رێزی بە پوولێ لە خۆشی و تاڵی
مەلا خۆی فرۆشت بە پارەی طاغی لای گوناح نییە
داد و حەق پەرست درۆیە و لایقی رێی سەلاح نییە.

* * *

## حەمە علی ئامان لاساییکەرە:

کاك حەمە عەلی (١٠٠) ساڵێك لەمەوبەر ژیاوە لە ناوچەی شێخ بزێنی، ژنەکەی ئـەمرێت و بێ کەیبانوو ئەمێنێتەوە ئەم مرۆڤە بلیمەت ئەبێ، وەکو گورگ ئەیلوران وەك سەگ ئەوەڕی، وەك کەر ئەزەری و ئەیلووشکان، وەك منالی ساوا ئەیباقان، وەك ژن ئەیلاوانەوە نازی ئەکرد وەك قـەل و پشیلە و چەقەڵ و مریشك و قاز و پاساری ئەهاسکی و دەمەلاسکێی ئەکرد، وەك کەوی مـێ و نێر ئەیخوێند و کەڵەشێر ئاسا ئەیقولاند... تاد و گشت خولەکانی هەر بە تەنها ئەگێڕاو ئەبوو بـە شتەکە بێ هیچ گیروگرفت.

بێوەژنێك ناوی دەرکردبوو زۆر جوان و بەمەکرو نازبوو، کەس لە مەکریا دەرناچـێت، و زۆر پیاوی لە رێگە دەرکردبوو حەمە عەلی ئامان ئەچێتە خوازبێنی و ئەگوێزێتەوە، و پێی ئـەڵێن زۆر ئاگای لە خۆی بێت.

ئەمیش خێر هاتنی بووکی ئەکات، و ئەڕواتـە پـشتیری ولاخـەکان بـە زوبـانێکی لـووس ئەپارێتەوە لە ماکەرەکەی خۆیدا وەکو لەگەڵ ژن بدوێت: کچێ ژنی چاك بە، تۆیش بـێ قـەدرو رێز ناکەم، هەر ژنەکەی جارانی، بارەبـەری دیوەخـانی، کـەیبانووی لـە بـارمی خـۆ ژن ژنـی نەخواردووە هەرچی پەیایکەین پێکەوە ئەیخۆین.

دەوری ماکەر ئامان: خۆی ئەکات بە ژن و دەس ئەکات بە گریان و فیـزاع و نـاز و مـەکر، بۆچـی ژنت هێنا بەسەرما؟!؟ من کەی خراپ بووم لەگەڵتا؟! ئێستایش هەر تۆم ئەوێت و خۆشـم ئـەوێ هـەر چۆن بڵێیت وا ئەکەم بە کۆڵ هەڵت ئەگرم، نازت ئەکێشم بۆیە ژنت بەسـەرما هێنـا، چـونکە منـداڵت

نەبوو، ئەوا منداڵم ئەبێت!! ئای پیاوە وای وای هاوارە یەکێك بێنە مامـانم بێـت، نـاوکی ببڕێـت هـەر خۆی ئەڵێت جا چی بکەم؟! ئامان خان چی بڵێم کەسی وا نییە. دەخیلت بم کە منـداڵت ئـەبوو بۆچـی دەنگت نەکرد با ژنم بەسەرتا نەهێنایا نقەنق، هاوار، ئـای ئـۆف، دان جـیرەوە کـردن ئـاوا!! بـاق منداڵی ئەبێت الحمدلله رزگاری بوو، کەچی لە قاپییەکی ترەوە خـۆی دێتـە ژوورەوە شـتێك بـەخۆی دا ئەدات کە گوایە مامانە خۆت بدە بەسەرما هەر ئێستا رزگارت ئـەبیٚ.. کـە ژنـەی بـووك گـوێی لـە گفتوگۆی هەردووکیان ئەبێت کە خەشم و نازو فیز و مەکر ئەکات و واقەی منداڵ و گریـان ئەبیسـتێت خێرا رائەکات و ئەڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی لە دێیەکی تر، ئەمیش خێرا دوابەدوایدا ئەڕوات و لە مـاڵی باوکی ئەیگرێتەوە. ئەڵێت ژنەکە بۆچی رات کردووە،؟!! ئەڵێت تۆ ژنی ترت هەیە و منداڵی بوو، ئـەی دەستی منت بۆ بڕی و منتان داوە بەسەر هەویٚ خوا بیبڕێت خۆ ئاوێکی نەدامیٚ و کەس بـەدەم منـەوە نەهات، ئەویش ئەڵێت کوا من ژنم هەیە؟! بە چاوی خۆم بە گوێی خـۆم دیـتم منـداڵی بـوو.. ئـەویش ئەڵێت هیچ کەس نییە سوێند ئەخوات کە من ژنم نییە و منداڵم هەر نییە، ئەویش ئـەڵیٚ ئـەی ئامـان چییە؟! ئەی منداڵی نەبوو؟ تۆ لێی نەپاڕایتەوە کە عاجز و زویر نەبێت، رەجات لیٚ ئـەکرد وتـت باشـە نازت ئەکێشم هەرچی بڵێیت بۆت ئەکەم، وتی باشە وەکو کەر بزەرە، وەکـو گـا ببۆڕێنـە، وەکـو مـەڕ بقاڕێنە، وەك بزن بمرقێنە وەك قەل بقاژێنـە، بقیرێنـە وەك باڵنـدە بجووکێنـە، وەك کەڵەشـێر بقولێنـە، مریشك ئاسا بقرتێنە... تاد تۆیش هەر ئەتوت باشە ئامان گیان هەمووت بۆ ئەکرد تا منـداڵی بـوو.. کاك عەلی پێکەنی و وتی رەنگە راست بێت، بەڵام من ژنم نییە بۆیە وام کرد کە گەفت لێکردبـووم بـە مەکەر بمتاسێنی و نەتوانم سەر بەرزبکەمەوە، هەڵسە با بڕۆینەوە کەرەکەم ئامان خانی ناوە...

* * *

## کابرای کاکەیی ئەیوت:

| | |
|---|---|
| هەتاکو مابم ئالەی دونیایە | بە گۆڕی دایە رێزداری دایە |
| ژن بیرم جنێو بدا بە دایەم | هەر هەرمەگایەم هەرهەرمەگایەم |
| ئەم شەڕ و جنێوە بە بادەم ئەدا | بێدەنگ و ئەرکە نەوێرم دادا |

* * *

## پەند وەربگرە لە چیرۆکی گیانلەبەران:

دیارە دارستان و چڕ و بژوون ئاوەدانە بە گیان لەبەران، شـێر تێـر ئـەخوات لـە گۆشـتی نێچیر و پاڵ ئەداتەوە، مرخی ئەبزوێت و بیر و یادی دێڵە شـێر ئـەکات و ئەیـەویٚ لەگـەڵیا

جووت بێ لەوکاتەدا نێرەکەر ڕێگای ئەکەوێتە لای لانەی شێر، چاوی پێ ئەکەوێت ئەسڵەمێتەوە و ئەترسێت، شێرە بانگی لێ ئەکات نێرەکەر فەندی برادەر وەرە مەترسێ بزانم لە چی ئەگەڕێیت!! ئەمیش دێتە پێشەوە سلاو بۆ پادشا دائەخات قوربان ماکەر خانی کارەکەرت لێم وێڵ بووە، ئەگەڕێم بە دوایدا بەڵکو بیدۆزمەوە. ئاباشا خۆ منیش شاژنم لێ گوم بووە بیری ئەکەم، با بڕۆین بە دوایاندا بیدۆزینەوە لەم چڕ و نزار و بەند و بێشەیەدا. ماوەیەکی باش ئەسووڕێنەوە نایان دۆزنەوە شێر ئەڵێت ئێمە بۆچی بگەڕێین و خۆمان ماندوو بکەین هەر دێنەوە بۆلامان، بەڵام چی ئەڵێیت!؟... من شاژنم بۆیە ئەوێت نەفس و غەریزەی پێ کوێر بکەمەوە با پێکەوە سەر بەسەرێ یەك بکەین ئا چی ئەڵێیت؟!!

نێرەکەر وتی قوربان باشە من رازیم با خۆمان ماندوو نەکەین شێر وتی دەی تۆ دەس پێشکەربە، نێرەکەر وتی قوربان بۆ جەنابی پادشامان شوورەییە یەکێکی وەکو من ڕەشۆکی لێتان پێشکەوم، فەرموون ئێوە کاری خۆتان بە ئەنجام بگەیەنن، بەڵێ شێرە ئێرەق بوو خۆی پیاکێشا، بەڵام نێرەکەر هەر بە خۆی نەزانی و ئازاریشی نەگەیشتێ..

کە سەرە هاتە سەر نێرەکەر و ئێرەق بوو خۆی بە شێرەدا کێشاو تا کۆتایی، شێرە ئەیشیران و ئەیزریکاند، لە دەنگی هەموو جانەوەر گیان لەبەران لێیان کۆبۆوە شێرە شێری دونیای شڵەژان، کە هاتن باری شێر زۆر قۆر و خەراپ بوو، قنگی درابوو.

ڕێوی هاتە پێشەوە: گەورەم بۆ ئەمەت بە خۆت کرد؟!! نەتزانی هەر مەگەر ماکەر بەرگەی بگرێت، سەری ئێمەیشت شۆر کرد تکای لە نێرەکەر کرد وردە وردە بیکێشێتەوە، بەڵام چاوی شێرە وەختبوو بێتەدەرەوە و هاوار و قیژانی دەشت و چۆڵ و چیای پڕ کردبوو، فرمێسك بە چاویا فوارەی ئەکرد، بەڵام ئیشی خۆی کردبوو!! ئەحمەقی و ملهوری کردی بە پەند و ناوی زڕاند لە جیهانی زیندەوەراندا.

* * *

## وەڵامێکی کورتی بەجێ!!

پرسییان لە میمکە سویلە: میمکە سویلەخان دەنگ و شۆرەت وایە کە (١٦) جار مێردت کردووە لای هەر شوویەك چەند ساڵێك ماویتەوە، کامیانت لا خۆش و بە کەیف بوو و پێت دەکەوت؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی هەموویان هەر بۆ پێشەوە خۆی ئەکوتا هەموویشیان هەر ئەیان ویست خۆیم پێدا بکات و ئەبوایە دانیش بە خۆدا بگرم و دڵی هەموویشیانم رازی ئەکرد و لە کەسیشیان تێر و بێزار نەبووم.

* * *

## وڵات لە ژێر دەستی دوو حیزبی دوو دەکیدایە:!

ئەگێڕنەوە پادشایەك ئەبێت سادە پەرست ئەبێت نۆکەرێکی سادەی منداڵ راگیر ئەکات چەند ساڵێکی لا ئەمێنێتەوە لێی بێ تاقەت ئەبێت، ئەڵێت یەکێکی جوانی سادەم بۆ پەیا بکە تۆ ئەکەم بە پارێزگار لە شارێکدا ئەویش یەکێکی سادەی نەگایراوی بۆ دێنێ و ئەیکات بە پارێزگار، ئەم ساڵێك یان دووان ئەمێنێتەوە لای بەکاری دێنێ و سواری خۆشی ئەکات، پاشان لەویش بێزار ئەبێت ئەیکات بەیارمەتیدەری پارێزگار و فەرمانی شاهانەی بۆ دەرئەکات، ئەمیش ئەچێت پێشوازی ئەکات و نەختێك رائەمێنێ و گرژ ئەبێت، کابرای یارمەتیدەر پێی ئەڵێت: ها! بۆچی بێدەنگی ئایا پێت ناخۆشە من رەوانەی لای تۆ کراوم؟! ئەویش ئەڵێت نەخێر، بەڵام قور بەسەر ئەم خەڵکە، کە وڵاتەکەی لە ژێر دەستی دوو حیزبدا بێت، و کارگێری سەرەکی وڵات شانازی و سەربەرزی بە حیزبەوە بکات، و دوودەکی کارگێڕی وڵات بێت؟!!

* * *

## لە ئاهەنگی بووکی شار

زۆر سەیرە هەموو رۆژێك کوشتن و لە داردان، بیانوگرتن و سزادان، تاوان کردن و ماڵ سوتان، منداڵی ساوا کوشتن و حوکمدانی بێ تاوان و بەری دێهات سووتان و گواستنەوەیان، کچ و ژن و ئافرەت سووك کردن و فریودان، کردنی خەڵکی بە جاسووس بە سەریەکەوە وبەرپرسیار لە شتی نەزان و نەبیستوو، گرانی و دزی و جەردەیی و بازاڕی رەش بەبەرچاوی میریەوە تاوانی گەورەو دزی بێ پرسیارە، هی بچووك ئەو پەری سزای قورس و گرتووخانە، بستێکی زەوی نییە تاوانی لێ روونەدابێ هەتکی عەرز و نامووس کرێنی ویژدان و گانکردن و گاندان و مشەخۆری لە مێژوو رووی نەداوە هەرگیز، نەفرعەون و هیتلەر و مۆسۆلونی، نە شەداد و کەنعان نە شەیتانیش ئەزانی لە بنەڕەتی دونیا بە خەویش نەبینراوە لە گۆڕینی راستی و درۆکردن و بەزۆر بەراست زانین و پیاهەڵدانی میری و رژێم و بە چاك زانین و حەق نەوتن و نەویستی فریشتەی بێزار کردووە هەرچی شێخە جاسووسە مەلا

ئەبێ ملهور بە خەلیفەی خوا دابنێ و لە نەتەوەی ئیسماعیل هەموو کەسێکیش ئەزانێ و درۆیە راستی باری کردووە لە وڵات، دەستیان لە خوا شۆریوە. لەولایشەوە دۆزەخ و مردنیان بە دیاری هێناوە، مرۆڤ قەلاچۆ ئەکرێت لە (٢٠ر٠) ئیسلام نەماوە بت پەرستە چاو کوێرە قەسابخانەیە ئەبێ بە زەبری شەق وڵات بە بەهەشت بزانی کەس نییە بە دەردی خۆی بمرێت، هەر ئەیمرێنن بە زۆر ئەبێ جنێو بدەیت بە دۆست و کەس و کاری خۆت زیندە بە چاڵی بکەیت.

کە چوومە خزمەتی مەلا خەوەکەم بۆ گێڕایەوە وای نوقلانە لێدایەوە کەی لە مێژووی (١٩٦٣ — ١٩٨٦)دا ئەبێ حوکمداری نیشتیمانی عێراقی برینداری وەرەس بوو لە گیان و تازییەدار لە ئاهەنگی بووکی شار، لە جاش و زۆردار لە شۆڕشی نابەکام لەسەر مەستی مەی و جام لە دیموکراتی و زانیاری لە شانس و لە بەختیاری.

❋ ❋ ❋

## کزەڵ ئەڵێ

خۆم بەبێ عەقڵ و نەزان ئەزانی — وا تێ ئەگەیم بێ عەقڵ و هۆشم
کەچی تێفکریم بە چاوی خێرەو — من لە خەڵك زۆرتر کالا فرۆشم
بەڵێ محمودم نەزان و نەفام — هەرچی تۆ بڵێیت من خەرابترم
بەڵێ من دانی پیا ئەنێم وایە — تۆ وام تێ ئەگەی لە تۆ کەرترم
ئەوەی کە خەڵك ئەیڵێت لە ژیری — دوورن لە راستی و نەزۆکی ژینن
مەگەر بە دەگمەن یەکێك ئەبینم — ئەگینا کۆتاو پەست و کەم بینن
عەقلێکیان هەیە ئەژین بە تاڵی — گیروودەی گەوجن بێ دەست و پایە
هەر وەکو منن شازن لە کۆمەڵ — هەتاکو ئەمرن ناگەن بە مایە
منیش تەقلیدی خەڵکی کەر ئەکەم — هیچ چارم نییە ماڵم وێرانە
بە عیلم و زانین کتێب و نووسراو — پێچەوانەتر رۆشنبیرانە
کزەڵ هەی خاکی عالەمت بەسەر — لە باتی عاقڵ شینم خەلاتە
ئەوان و شێخی پوشتی ئایندا — جاسووسن لەگەڵ موخابەراتە
بە هەوای بۆشیەکەو تا سەرکەوتم — هەر سرنج ئەدەم لەم کائناتە
خەڵکی بێ عەقڵ و بێ مەست و بێهۆشە — خۆزگەیان بەکەر لەم کارەساتە
ئەو کەسەی ئەیکەم بە جێگەی هیوا — پەنای بۆ ئەبەم لە نیوەی شەوا

| | |
|---|---|
| دەرسم دابداو عەقلم فێر بكات | كەچی ئەیكرن لە نوێنی خەوا |
| ئەگەر وانەبێ برا مردەبم | تەوقی شەیتانیش لە مل كردەبم |
| بەلاّم دلّنیام كە من راست ئەكەم | با گالّتە جاری ئەو نامەردە بم |

❊ ❊ ❊

مەلا ئەحمەدی قسرت هەبوو لەو شارەزوورەدا قسە خۆش و فەرد بێژبوو، ئاوا باسی مریشكەكەی ئەكات بە كوولّە شیعر: چونكە مریشكەكەی تۆپی بوو:

| | |
|---|---|
| مرم مر نەبوو بە ناو مامر بوو | لە گاو لە گامێش گەلێ چارتر بوو |
| دانم ئەدایە ژەمی تەغارێ | سەت و چل هێلكەی ئەكرد بە جارێ |
| كاتێ لێم ئەنا سەدو چل مەن خوێ | هەیهۆ ئەم لە كوێ و گا پەلّخە لە كوێ |
| سێ تەختەی دەوار لایەك جلی بوو | دوو گوریسی چاك قەفی ملی بوو |
| سەد هۆزی جافم كرد بە قوربانی | كوێرایم دایێ قەدرم نەزانی |
| پزیشك و دەرمان بە فریای نەكەون | سەری نایەوە بەیەكجاری خەوت |

❊ ❊ ❊

كابرایەكی شوانە وێلّە سەگێكی هەبوو لەگەلّ مێگەلە مەرەكەیدا بوو هەمیشە لە گەلّیدا بوو زۆری خۆش ئەویست لە ناكاو سەگەكەی تۆپی زۆر عاجز بوو تاقەتی لێ برا خەفەت دایگرت چوو بۆ دێیەكیتر كە مەلایان هەبوو چوو بۆ خزمەتی مەلا لە پاش حەسانەوە رووی كردە مامۆستا: وتی قوربان بۆ خزمەتی تۆ هاتووم مامۆستایش فەرمووی بلّێ ئیشت چییە؟ ئەمجا رووی كردە مامۆستاو وتی قوربان سەگێكم هەبوو تۆپی و بوو بە قوربانی ئێوە زۆرم خۆش ئەویست ئێستا هاتووم خێر و خێراتی بۆ بكەم، جەنابتان رێگام بۆ دابنێ مەلا توورە بوو دایە بەر جنێوو قسەی ناشرین هەلّسە برۆ هەی و هاو وها پێكرا.... لەحنەت لە خۆتو سەگەكەت كابرا وتی قوربان تۆ ناهێلّی قسەكەم تەواو بكەم، شەش مەرم كردۆتە قەبێلّی، چەند سالّە لای منەو خزمەتی كردووم ، هاتووم مەرەكانت بدەمێ!! مامۆستا ئەمجا گەشەوە بوو: وتی رەحمەتی خوای لێی خۆش بێت هەر ئەمزانی بەهەشتییە بەوەفابووە رەحمەتی خوای لێ بێت، لە هەموو سەگی ئاوایەكەی خۆتان پیرۆزترە زوو خێرا مەرەكان بێنە با رەحمەتی چاوەرێ ئەكات باوكت بە قوربانی گۆری بێت خێرو ئیحسانی زۆر بۆ بكە رەحمەتی قابیلە.